# حـیکایـەتی چل شـەوەی شاری قەلەندەران

بە
ڕیوایەتی
**بوشرا کەسنەزانی**





له زنجیره بڵاوکراوەکانی
ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرەی کتێب **٥٨**

# حیکایەتی چل شەوەی شاری قەڵەندەران

## بە ڕیوایەتی بوشرا کەسنەزانی


- بەرگ و هێڵکاری: گۆران محەمەد
- نەخشەسازیی ناوەوە: سینا حەکیمزادە
- چاپی یەکەم _ ٢٠١٥
- چاپخانە: تاران
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٨٠٠٠ دینار
- بڵاوکار: ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ١١٤٢ی ٢٠١٥ی پێ دراوە



# حیکایەتی چل شەوەی شاری قەلەندەران

به ڕیوایەتی
بوشرا کەسنەزانی

چاپی یەکەم
٢٠١٥

# شەوی یەکەم

بسم الله الرحمن الرحيم، یەکەم شەو بە ئێمە درا، پێمان گوترا بە دوو ناوی خودا دەست پێبکەین، کە دەتبەخشێت و میهرەبانە، چی لەو دوو سیفەتەی خودا بۆ ئێمەی زیندانیانی ناو قەدەر پێویستترە؟ چی لەو دوو سیفەتە بۆ ئێوە موساعیدتر؟ بە ناوی بەخشندەیی ئەوەوە هاتووین و داوای ڕەحمی لێ دەکەین بۆت. ئێمە لەیلی و شیرینین، بە تەکبیری هەموویان نێردراین تا یەکەم شەو دەست بە گێڕانەوە بکەین. وا مەزانە هەڵەیەک ڕووی داوە. لەیلی و مەجنون، یان شیرین و فەرهادت بیستووە، بەڵام لەیلی و شیرینت نەشنەفتووە، ئێمە بە هەڵە نەهاتووین، وەک چۆن تۆیش بە هەڵە ئێمەت نەگێڕایەوە، هەڵەکە لە شوێنێکی ترە، خوا یاربێت چار دەکرێت. لەیلی و شیرینی ناو قەڵەمڕەوەکەت. دوو لە کچە نازدارەکانت، یەکیان بە نەسەب عەرەبی ڕەسەن و ئەوی دییان فارسی گاور. لە زۆرێک لە گۆرانیی پیاواندا هەین، لە زۆرێک لە حیکایەتی گوتراو و نەنووسراو و نووسراودا گوڵمان گرتووە. ئەفسانەی ناو دڵداری و حەقیقەتی زوڵم لێکراوین.

ماڵمان لە بەرزی شارە، لەو جێیەی بە حەوت فرسەخ دەرگای ژوورووی شاری لێیە و زۆرینەی میوانە شاهانەکانی لێ وەژوور دەکەون. دوو کۆڵان جیامان دەکاتەوە لە یەک. نزیکین لە یەکدی، وەک چۆن تۆ لە خەیاڵتەوە نزیکی، دوورین لە یەکەوە، وەک چۆن ئێمە لە هەقیقەتەوە دوورین. ساڵانێکە یەک دەناسین، ڕەنگە پانزە یان دە ساڵێک بێت یەکمان دۆزیوەتەوە، کەسمان بیرمان نییە چۆن بووین بە دەستەخوشکی یەک، چونکە لەم شارەی تۆدا ئەگەر یەکێک بۆ هاوخەمیت نەدۆزیتەوە، بەرگەی ئەو هەموو تەنهاییە جەرگبڕە ناگریت. کەس وەک خەڵکی ئەم مەملەکەتە هەست بە تەنهایی قووڵ ناکات. ئەم پیرەشارە میهرەبانە دەبێت لە زمانی بگەیت و ڕەگی بناسیت، وەگەرنا بریندارت دەکات. خۆشبەختانە ئێمە ڕۆژێک لە تەنکاویی زەمەن پەڕاندوومانەتەوە و جارێکیش کڵاوە بابردووەکەیمان داوەتەوە دەست. ئەو پیرەشارە دەماننناسێت و لەژێر کەواکەی ناوین. بەیانیان کە پیایدا گوزەر دەکەین بزە دەیگرێت و ئێواران کە پیاسەی بەناودا دەکەین خەمێک لە ڕووی دەنیشێت. جومعان حەزی لە خوێندنەوەی شیعری کۆنینە و لە ڕۆژانی بەهاریشدا دڵی بە ئێمە دەکرێتەوە، کە ڕوو لە دەشتودەری ناکەین، لەناو خۆیدا ڕێک لەسەر دڵی دەوەستین و چێژ لە چۆڵییەکەی وەردەگرین.

کاری ئێمە وەک هەموو میللەتی شار بێکارییە، بەڵام بۆ هۆنینەوەی ڕۆژگار و ڕستنی زەمەن، جارجار بەرگ بۆ کیژانی تری شۆخت دەدوورین و مێخەکبەند و کەمەربەند و ملەگۆ و حەتحەتۆکە بۆ نازدارانی ڕوومانگ ئەهۆنینەوە. وەک



مووروو‌ناس و مەرجاندۆست و ملوانکەساز ناسراوین. خاتوون؛ فەرموون دیارییەکی بچووکمان بۆ هێناویت، گوارەیەکی شۆڕی موورووی ئەفغانی و دەستەوانەی لە شیلان و مەرجانە دروستکراو، ئەموستیلەیەکی بەردی سلەیمانییە. دڵنیاین یەکی شتێکت بیر دەخەنەوە. دەزانین بەو مووروانە هەر نەبێت یەکێکان ڕێبوارەکانی ئەفغانستان و ئەوی تریان شێخی کابول و ئەمیان یارت بیر دەخەنەوە. ئەمانە لە نایابترینی کارەکانی ئێمەن، کە ئەگەر پیاوانی مەملکەت بیانەوێت دیارییەک بۆ نازکبەدەنانی یاریان بنێرن، ئێمە ڕادەسپێرن. ئەوان نایانەوێت لە خەزێنەکەی تۆ هیچ بە دڵارامیان بدەن، چونکە تۆ لە حیکایەتدا پێیان دەبەخشیت. ئەوان شتێکیان دەوێت بۆن و بەرامەی ڕاستی لێ بێت و جیلوەی سەلیقەی ئەمان بێت. ئێمەیش کارمان نییە و دڵیان ناشکێنین،ناپرسین بۆ کێی دەبەن و چی لێ دەکەن. عاشقی وا هەیە دادەنیشێت و

سەرگوزشتەی حوبی خۆی باس دەکات، تا ئێمە کاریگەر بین بەو عەشقە نموونەییە و جوانترین مووروو و پولەک و سەدەف بهۆنینەوە، تا زینێک بێت، بە ئەسپی ئەو لایق! ئێمە کار دەکەین و چاوەڕێی ڕوودانی حیکایەتە گەورەکەین، لەناو حیکایەتی بچووکدا وەک بەردێکی زومڕووتین، کە لەگەڵ چل مووررووی تردا هۆنرابنەوە و بەر پشتەوە بکەوین ڕێک لەو شوێنەی، کە دەکەوێتە پشتەملی خانم و هەرگیز ئەو ئیقباڵەی نییە لە گەردندا ببینرێت. ئێمەیش ڕۆژگار دەبەینە سەر، مووروو دەهۆنینەوە و دەمانەوێت ڕۆژی هەڵگیرسانی حیکایەتە گەورەکە بێت، ئەوسا هەریەکەمان و ئەو ملە یاقووتەین شایستە بە گەردنی شازادان.

تا ئێستا لە زۆر حیکایەتی بچووکدا بووین، زۆرجاران پێکەوە ناردووتین، لە حەوت حیکایەتدا لەتەک یەکین، من بێ لە لەیلی لە پانزە حیکایەتدا هەم، بەڵام ئەو لە نۆ حیکایەتی تردا هەیە.

بەڵێ، من لە نۆ حیکایەتدا هەم، بەڵام ئەو حیکایەتانەی لەگەڵ شیرین بووم قورستر بوو، هەمیشە دوای تەواوبوونی هەر یەک لەو حەوت حیکایەتەی کە پێکەوە بووین، من لە جێدا کەوتووم، تایەکی گران گرتوومی تا یەک هەفتە نەمتوانیوە توخنی هیچ مووروو و بەردێک بکەوم، چونکە تۆ دەتویست ئەو حیکایەتە بگێڕیتەوە کە خۆت گەرەکت بوو، بێ ئەوەی لە یادت بێت ئێمە چیمان بەسەردێت، چۆن بریندار دەبین. هەرگیز هاواری کەسی ترت لە تاو هاوار و ناڵەی خۆت نەدەبیست، ئاخر تۆیش برینداربووی. ببوورە قەستی سەرزەنشتم نییە، ئێمە ئەمشەو لێرەین تا پێکەوە حیکایەت بگێڕینەوە باسی خۆمان بکەین و لە نزیکەوە ئاگامان لە یەک بێت، ئێمە کچین و دەتوانین لەبەردەمی تۆدا قسە بکەین، دەتوانین هەست بە ڕووتی نەکەین، ئەگەرچی لە زۆر حیکایەتدا بەرگت لەبەر ڕامالیوین.

خانم؛ شەوێکی ساردی زستانی چەند ساڵێک لەمەوبەر بوو، سەرمەدی قاسیدت نارد بە شوێنماندا ئامادەی چوونە نێو حیکایەتێک بین. سەرمەد ئەو شەوە و هەزاران شەوی تری ناو شارەکەت هەمان هێمنی و پڕێتی لە سیما و چاوە بادەمییەکانیدا دەخوێندرایەوە، چەندان جار دیتوومانە هەواڵی هێناوە، چەندان جار نامە و پەیک و دیاری پێگەیاندووین، کاتێک ویستومانە لە سیمایدا هەواڵەکە بەدی بکەین، هەرگیز نەمانتوانیوە. سیمای وەک ئەوەیە بڵێت هەموو شت چاوەڕوانکراوە، خراپترین شتیش!

جارێک نامەیەکی بۆ من هێنا، نووسینی سەر زەرفەکەی بە خەتێک بوو هەرگیز لەوەو پێش خەتی وام نەدی بوو. پرسیم لێی کێ ئەم نامەیەی پێ داویت؟ وتی: عەبدێکی خودا. تەماشای چاویم کرد، تا لە چاوانیدا وێنەی ئەو کەسە ببینم، بەڵام لەوە قوڵتر بوو دەستم بەو وێنەیە ڕابگات، تەنها بەئارامی وتی: شیرین خانم ئەگەر وەڵامتان دایەوە، من ناونیشانی پێدەزانم! تۆیش و لەیلیش حەز دەکەن بزانن نامەکە چی تێدا نووسرابوو؟ هیی کێ بوو؟ باشە کە ئێستە هەموو شت لە حاڵی نائاسایی دایە منیش باسی دەکەم. نامەکە هیی کوڕێکی مەملەکەتەی تۆ بوو، کە عاشقی من بوو، کوڕێک هەم ناتیق هەم خۆشنووس بوو. ئەو کوڕەی هەموو شیرین و خوسرەوی خانای قوبادی ئەزبەر بوو، بە شیرین و خوسرەوی نیزامی گەنجەویی بەراورد کردبوو. هەستی کردبوو من تەواو شیرینم، شیرین سروشت و شیرین گوفتار، من دەبێت پێش ئەوەی بەر جەبری حیکایەتە گەورەکەی تۆ بکەوم، ببمە شیرینی ئەو. نامەکەی لە هیچ یەک لەو نامە ئەڤینداریانەی کوڕانی شاری نەدەکرد، لە نامەی ئەو جەوانانەی نەدەکرد کە داوایان لە خوێندەوار و مەکتەبلی و فەقێکان دەکرد فێریان بکەن و هەستی خۆیانم بۆ بنووسنەوە، لەو جۆرە جەوانانە نەبوو شیعر بە هەڵە و پەڵەوە وەردەگرن و بۆ تۆی

دەنووسنەوە تا تۆ هەست بە کەفی دڵیان بکەیت. بێ ئەوەی بزانن من بەو نامانە تووڕە دەبم، چونکە ئەوانە هیچیان لە شان و شەوکەتی ناوە ئەفسانەییەکەی مندا نین. شیرین؛ شیرینێک کە زەمەنی بڕیوە هاتۆتە شارە سەمەرەکەی خاتوونی حیکایەتسازەوە، گوناهە ڕازی بێت بە هەڵپە و کڵپەی زوو دامرکاوی کوڕێژگە و نەوجەوانانی شار. کە لە نیهادیاندا عەشق وجودی نییە و دەبێت لە حیکایەتەکاندا دەوری زۆر لاوەکییان پێ بدرێت، بۆ نموونە غوڵامی نەناسراو یان دوورشکەگێڕی مەیدانی شار، یانیش ناتری گەرماوی گشتی. خاتوون ئەو نامەیە لە هیچ یەک لەو نامانە نەدەچوو، کە ئەو کوڕانە دەینێرن و پیتی یەکەمی ناوی خۆیان و تۆ لەناو دڵێکدا دەنووسن، نا لەوانە نەبوو بە هەیبەتی عاشقێکی سەنگینەوە سۆز و ئەوینی خۆی ڕستبوو. شارەزایانە دوو بەیتی شیعری مەلا خدری شارەزووری نووسیبوو، کە دواتر لە تاواندا لای دوڕمحەممەدی کتێبدار دیوانەکەیم هێنا و هەموو شیعرەکەم لەبەرکرد، نووسی بووی:

لە شیرینی ئەتۆ، ئەی خوسرەوی تەختی زەمین، ڕەنگە
بگاتە ئاسمانی بێستوون، فەرهادی هاوارم...

خاتوون هەرگیز وەک ئەو کاتە هەستم نەکردووە ئاسمان بێ ستوونە، هەستم نەکردووە ئەگەر یەکێک، شتێک ڕای نەگرێت بەر دەبێتەوە، دەکەوێت و شارەکەی تۆ کاول دەبێت. خاتوون ئەم حیکایەتەم بە کاڵ مەزانە و وامەزانە خەیاڵپڵاوییە. لەیلی؛ هەرگیز باسی ئەو نامەیەم بۆ نەکردی، بەڵام ئێستە بیرت دەکەوێتەوە من چیم لێهات! خانم ناوی خۆی نەنووسیبوو، ئەو ئێوارەیەی کە سەرمەد نامەکەی دایە دەستم تا سپێدان چەندین جارانم خوێندەوە، جۆرێک لە هەست لە مندا دروست بوو کە پێشتر نەمبوو، هەستم دەکرد دەمارەکانم پتر خوێنیان پێدا دەڕوات و گوناکانم گڕ دەگرن. هەستم دەکرد، خورپەیەک لە دڵمەوە دێت. بەیانیی ڕۆژی دووەم پێش ئەوەی بچمە دەر، سەرمەدی قاسید لەوبەر دەرکەکەمانەوە بە خۆی ئەسپەکەوە چاوەنواڕ بوو. من وەک ئەو نەبووم، من هەموو شت لە سیما و لە چاوانمدا دەخوێندرایەوە، بە نەرمی هاتە پێش و وتی: خاتوو شیرین، نامەتان هەیە بیبەم؟ من دەست و پێی خۆم ونکرد و نەمدەزانی چی وەڵام بدەمەوە، قەیرێک وەستام و دوایی بە خۆمدا هاتمەوە و بە نازی شیرینی شیرین گوفتارەوە گوتم: نا وەڵامم نییە، مەرج نییە هەموو نامەیەک جەوابی هەبێت. بە بیستنی بزەیەکی نەرمی کرد و ڕۆیشت، منیش گڕم گرت، یانی پەشیمانی دەیسووتاندم بۆ نامەم نەنووسی، گریمان نووسیم بمگوتایە بۆ کێ؟ بۆ من دەزانم ئەم عاشقە کێیە تا نامەی بۆ بنووسم؟ بۆ من دەمزانی کێیە؟ باش بوو نەمنووسی حەیام دەچوو، ساڵانێکە خۆم لە هەزار بەڵا لایاوە ئێستە بۆ بەڵا بمگرێت. خانم ئەو ڕۆژەم بە ساڵێک لێ گوزەرا. شەو کە چوومەوە ماڵ حەوت تورەکە مێخەکم، لەگەڵ نامەیەکی دیکەدا بۆ هاتبوو، سەرمەد دابوویە دەست قەرەواشی ماڵم، نامەکەی لە تورەکەیەکیان نابوو، تا لێواری لولکراوی دیار بێت. وەختێک دەستم کرد بە کردنەوەی تورەکەکان، بە ئەنقەست ئەو تورەکەم خستە ئاخر دانە، ئای لە بەرامەی ئەو تورەکانە و بۆنی مێخەکیان، دەنک ئەستوور و ئەستێرەکراوە، لە حەوت کوچە پیاوی عاقڵی مەست دەکرد. هەمان خەت و هەمان قوڕگ، وەلێ ناڵەیەکی سووتێنەر لە گەرووی دەهاتە دەر. نووسیبووی: ماوەیەکی زۆرە دەمەوێت داوات لێ بکەم ملوانکەیەکی مێخەکەبەند بۆ ئەو شیرینەی من دروست بکەیت، کە هەموو شار بۆ مەحبوبەکانیان لای تۆ و دەستەخوشکت دروستی دەکەن، داوام لێت هەیە بۆ منیشی دروست کەیت، ملوانکەیەک تا ئێستا کەس نەیبووبێت، نەیدیبێت...!

خاتوون بە نەخشەی تۆ، من ئەگریجە بووم و لەیلی یاسەمەن. حیکایەتەکە وابوو نەنە خەزێم سەمەرەترین حیکایەتی بۆ دەگێڕاینەوە، حیکایەتی شاهان و دێوی یەک چاو، پەری، جنۆکە و کوڕانی سوڵتان، هەمیشەیش بۆی باس دەکردین تا ئەو تەمەنەی کچی جوانی وەک ئێمەی نەدیوە و بێگومان شازادەکان جەنگ بۆ بردنەوەمان دەکەن. یاسەمەن و ئەگریجە وەک بولبوولان لەبەر یەک دەخوێنن، ئاواز دەچڕن و لە لێوار ڕووبارەکەدا زوڵفی عەنبەربۆیان دادێنن و شیعر و شانامە دەڵێنەوە، هەردووکیان لەبەر یەک گیانیان دەردەچێت، سوێند بەسەری یەک دەخۆن، ئەم تاجەگوڵینە بۆ ئەو دروست دەکات، ئەو شەرابی هەرمێ بۆ ئەم دەکات، ئەم حەڵوای حەلەبی بۆ ئەو دروست دەکات، ئەو گوڵاوی کاشانی بۆ دەگرێتەوە. تا ئەوەی ڕۆژێک لە گوێ ئاوەکە زوڵف شانە دەکەن و ئاواز دەچڕن، لەوێوە شۆڕەسوارێک کە دروودی حاجی عەباسی خەتجوانە و لە حیکایەتەکەدا ناوی شازادە ئەحمەدە، دەردەکەوێت و ژیانی ئەگریجە و یاسەمەن دەگۆڕێت. ئاهـ خاتوون هەمووتان وەهان، کە بتانەوێت خەڵک گوێتان لێ بگرێت، کوڕێک دێنن ناوی دەنێن ئەحمەد یان محەممەد و دەیکەنە شازادە، لەگەڵ نەونەمامێکدا بەگژ یەکیاندا دەکەن، تا خوێنێک نەڕژێت دەستبەردار نابن، هیچ نەبێت من ئەوەم لە تۆ دیتووە، خۆ کچانی کۆشک دەڵێن هەموو حیکایەتەکان وانین، ئەوان دەڵێن زۆرجار براونەتە ناو حیکایەتێک، کە دوایی لەگەڵ کوڕە پێک شاد و شوکر بوون، بەڵام حاشا من تا ئێستا حیکایەتی وام لە تۆ نەشنەفتووە. شازادە ئەحمەد لە دوورەوە بە سواری ڕەخشێکەوە دێت، خوشکی خۆی حەیرانی دەبێت، دوو کچەی بۆ یەک مردووش، وەختێ بۆ یەکەمجار لە دوورەوە شازادە دەبینن، ڕادەمێنن، دەمیان دەکەنەوە و ئەبڵەق دەوەستن، چونکە ئەو سوارەی لە حیکایەتەکانی نەنە خەزێمدا بە غار ڕۆیشتووە، گەیشتۆتە ئێرە.

ئاهـ خاتوون لەو زوڵمە، دروودت بۆ هێناوەمەتە ناو حیکایەتێکەوە، بە فەرمانی تۆ دەبێت من و لەیلی شەڕی لەسەر بکەین، خاتوون هیچ نەبێت با ئەو حیکایەتە منی تێدا نەبووایەم. لەیلی و کچێکی تربووایەن نەک من، چونکە قینم لە لەیلی دەبوو، تەنانەت ئەگەر بە ڕووکەشیش تەماشای دروودی کردبایە من ئاگر لە جەرگم هەڵدەستا. خاتوون حیکایەتت دایە دەست خۆمان، بەوپەڕی بێ ڕەحمییەوە وتت: خۆتان بجووڵێن و تەواوی کەن. لە دوور شاسوار بەڕێوەیە سەد دڵ مەفتونی دەبێت، دەگاتە بەردەم یاسەمین و ئەگریجە، داوای جامێ ئاو دەکات، ئاهـ لەوێدا ئەگریجە جامێ ئاوی دەداتێ و یاسەمەن بە دەمی کراوەوە تەماشای دەکات، ئاوەکە دەخواتەوە و دەڵێت: خاتوونانی شیرین سیما، سوێند بە خوا تا ئێستا شاجوانی وەک ئێوەم نەدیوە، پێم بڵێن ئێوە کێن و چین و ماڵتان لە کوێیە؟ ئەگریجە دێتە جەواب و دەڵێت:

ئێمە کچی جوتیارێکی هەژارین، ماڵمان لەسەر گردەکەیە نیوەڕۆ میوانمان بە.

سوارە کچان دەنێتە بان ڕەخشە و هەوسار بە دەست بەرەو ماڵ هەڵدەکشێن، نەنە خەزێم سوارە دەبینێ زارەترەک دەبێت، نەکا نهێنیان لا درکاندبێت. کاتێک دەزانێت کیژانی زرنگن، هۆشی دێتەوە و ئەحمەدشا پەزیرایی دەکات. کچان دەست بە خواردن دروستکردن دەکەن، ئەم حەڵوای حێلدار و ئەو شیرینی حەڵەبی. ئەم شەرابی شیرازی و ئەو شەربەتی فیرعەونی بۆ میوانە دێنن، ئاهـ خاتوون، ئێمە لە جەبری حیکایەتدا بووین، لەیلی وەک حیکایەت دەجووڵا، بەڵام من ئاگر لە پێشم بەربوو دەمویست لەیلی بکوژم، دەمویست لەیلی دەرکەم. درووود هەستی بەمە دەکرد و دەیویست من بسووتێنێ مەیلی بە لەیلی دەدا، خاتوون ڕەوتی حیکایەت خراپ دەچوو بەڕێوە، من حاڵم ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبوو، لەیلیش بێ ڕەحمتر، دەترسام... ترس و ڕق و کڵۆڵی ئەوکی گرتبووم، خاتوونی حیکایەتساز دەترسام، یاسەمەن و ئەگریجەت لە

تاقیکردنەوەیەکی قورسدا دانا، کە ئیتر قینیان لە یەک بوو. لەناو ئێمەدا جەنگ بوو بزانین شازادە ئەحمەد کاممانی دەوێت.
رۆژێک مەیلی بە من دەدا، رۆژێک بەو، خاتوون ئەو بازێ جار دەیویست بە جەور عەزابم بات. ئاهـ شیرینی بەلەنگاز شیرینی قوربەسەر من چی دەزانم تۆ دروودت دەویست، من دەمویست حیکایەت ببەمەوە، خاتوون جڵەوی دابووە دەست خۆمان، ئاهـ شیرینی بێ کەس، شیرینی ماڵ کاول... لەیلی با تەواوی کەم، بیەڵە تەواوی بکەم، دروود هێند حیکایەتی دڵداری و ئەفسانەی عەشقی خوێندبووەوە، دەیویست عەشقمان پڕ بێت لە عەزاب و جەور، دەیویست گڕم بدات، دەیویست من ئەو گڕ بدەم، دەیویست لە عەشقدا سەدهەزار جار رۆح دەرکەین و زیندوو بینەوە.
ئاهـ خاتوون تۆ بیرت نییە، یاسەمەن جڵەوی حیکایەتی گرت و بەیانییەکی زوو، کە ئەگریجە لە تاو یاو و وڕێنە خەریکە کەللەی شەق دەبات، شازادە ئەحمەد یاسەمەن دەنێتە پاشکۆی ئەسپی و بەرەو مەملەکەتی خۆیان سەرهەڵدەگرن، ئەگریجە کە خەبەری دەبێتەوە لە نەنە خەزێم هەواڵجۆی یاسەمەن دەبێت. ئەویش دەڵێت:
- لەگەڵ شازادە ئەحمەد رۆیشتووە.
ئیتر ئەگریجە لە حیرس و لە تاو عەشقی شازادە تووشی یاوێکی گران دەبێت، حەوت شەو پێوەی دەناڵێ و شەوی حەوتەم گیان دەسپێرێت...
خاتوون دڵت خۆشە بەم حیکایەتە؟ خۆزگە بیرت دەبوو ئەو شەوەی حیکایەتەکەت سازاند و خوێندتەوە چیت کرد؟ خاتوون پێکەنیت؟ یان گریایت؟ لە چی تووڕە بوویت؟ دەتویست تۆڵە لە کێ بکەیتەوە؟ ئاخ بەو حیکایەتە منت وێران کرد... دەمەو بەیان گەڕاینەوە، لەیلی دەستی گرتم تام هەبوو، درووود وتی: لەگەڵتان دێم. لەیلی گەیاند پاشان من، لە رێ دەستی گرتم کە زانی چ تایەکم لێهاتووە ترسا، فیدای سەرم بوو، باڵاگەردانی باڵام بوو، لێ من لەوە بێ تواناتر و بریندارتر بووم جوابی بەمەوە. خاتوون ئەو شەوە وەک بوراوە وەهابووم وڕێنەم دەکرد، سبەی تەبیبیان هێنابوو من بێهۆش بووم، شەوی دووەم خەبەرم بووەوە، ئاهـ ئەو شەوە یەک سەدە بوو بۆ من، تەبیب دەیزانی چ مەرگمە و تەنها چایی نەعنای بۆ دانام بیخۆمەوە. وتی شیرین، کچم، ئەهوەن بە دنیا وەها سارد نییە، ئەو گڕە کەم بکەوە! لەیلی وتی: من لەلات دەمێنمەوە، نەمهێشت بە قەرەواشم گوت، کەسم ناوێت خۆتی لێ بێت بەسمە. قینم لە لەیلی بوو، قوڵ لە درووود رەنجابووم، درەنگانێ قەرەواش نامەیەکی بۆ هێنام نامەی درووود بوو. دەسووتا، دەناڵی باسی نەخۆشیی منی بیستبوو، بەڵام بۆ ئەوەی لە شارەکەی تۆ نەبێتە پڕوپاگەندە نەیدەتوانی خۆیم لێ تێبگەیێنێ... دەسووتا، دەگریا باسی جەوری دەکرد، هەموو ئەو شیعرانەی بۆ نووسیبووم کە باسی بێ رەحمی دڵبەر دەکەن، بەڵام من رەنجابووم. ئاهـ خاتوون سوێندم خوارد ئەگەر بە مەرگی خۆیشم بێت، تا حەفتا رۆژ جوابی درووود نەدەمەوە... خاتوون تۆ قەت توانیوتە حەوت رۆژ جوابی مەعشوقی خۆت نەدەیتەوە؟ توانیوتە ئەو تەمبێ بکەیت؟ ئاخر تۆ چی لە دەردی من دەگەی... سەیرکە چ بر..ی..ن..د..ا..ر..م...
شیرین بەسیەتی مەگری خاتوون حاڵی باش نییە، مەگری دەبێت ئێمە تەنها حیکایەت بگێڕینەوە مەگری...
من حەفتا رۆژ درووودم نەدواند، ئەو کوڕەی کە نەدەبوو لە هیچ حیکایەتێکدا ببێتە سوڵتان و شازادە، خاتوون ئەو شاعیر بوو، لە کوڕی سوڵتانەکان نەدەچوو، لە پیاوانی حەرەمسەرا و نەوجەوانانی کۆشک نەدەچوو، شاعیر بوو، بە حەوت پشت لە باپیرییەوە خەمگینی بۆ بەجێمابوو، دەوڵەمەند بوو لە حوزن و دەستبڵاو بوو لە تاریکی بەخشین، شاعیر بوو

له کوڕە بازرگان و لە گەڕیدە ماڵ زەنگینەکان نەدەچوو، شاعیر بوو... خودا چل جۆر گریان و حەوت چەشن عەزابی پێدابوو... شاعیر بوو.. شاعیر!

خاتوون ئێمە لە کچە تایبەتەکانی شارەکەی تۆین، ئەمشەو هاتووین تا حیکایەتت بۆ بگێڕینەوە، حیکایەتی هەرچی بێت، بەڵام خاتوونی ئەزیز ئێمە حیکایەتخوان نین، تەنها دەتوانین ئەوەی ڕوویدا بیگێڕینەوە بۆت، تا شتێکت بیر بکەوێتەوە. خاتوون من و شیرین لە حیکایەتێکی تری هاوبەشدا بووین، قەت ئەو حیکایەتەم بیر ناچێتەوە، من سۆزانییەکی بەدبەختی دەستی قەدەر بووم، لەیلی بەرگدوورێک، خاتوون ئەو حیکایەتەت هەردووکمانی وێران کرد، ئەو حیکایەتەت کە بە برینداریی دەویست بیگێڕیتەوە و یەک هەفتە ئێمە خەریک بووین تا کارت تەواو بوو. ئاهـ خاتوون. هەرگیز ئەو حیکایەتەم بیر ناچێتەوە.

من و شیرینت لە ماڵێک دانا، زیندانی قەدەرێک بووین، دەبوو من لەشفرۆشی بکەم و لەیلی بەرگدروو بێت، هەفتەی یەک جاریش ژنەی خیانەتکار بێت. خاتوون ئەو حیکایەتە دەکرا شتێکی تر بێت، دەکرا من و شیرین جۆرێکی تری لێ بکەین، بەڵام نازانم چ برینێکی خۆتت بەو حیکایەتە کولاندەوە، خاتوون دڵنیام ئەو حیکایەتە تلوخۆی بووە بەسەر برینی خۆتدا ڕشتووە.

حیکایەتەکە وەها بوو من شەوان خەون بە پەنجەرەوە ببینم، شیرین بە دەرگاوە... کە ئیدی دوای ئەو حیکایەتەت من شێتی پەنجەرکان بووم، بە دەیان پەنجەرەم لە ماڵەکەم کۆ دەکردەوە. خاتوون ئێستەش کە بیری ئەو حیکایەتەم دەکەوێتە گیانم دەلەرزێ... کەرنەڤاڵی پەنجەرەکان... ئای خاتوون ئەو حیکایەتە ناگێڕدرێتەوە، میرزا ئادەمی حیکایەتخوان داویەتی پێم، بۆت بخوێنمەوە و دوایش بۆتی جێبێڵم. خانم ئێمە حیکایەتەکە دەخوێنینەوە و دوای دەڕۆین، بەڵام بیرت بێت، ئێمە دەتبەخشین تا خوا بتبەخشێت.

حیکایەتی لەیلی و شیرین و...

ئەو دەرگاکان لە خەونیدا دەبوونە موسافیر و دەڕۆیشتن، منیش پەنجەرەکان بە سواری وڵاخ دەگەیشتنە شار و بە شەقامەکاندا هێواش ڕێیان دەکرد، خەڵکان ئەمسەروسەری شەقامیان لێ گرتبوون تا بیان بینن. لە خەونیدا دەرگاکان کۆ دەبوونەوە و زرێ و ئەڵقەڕێز و کێلونەکانیان لە کۆڵ دەنا، بە تولەڕێیەکاندا دوای کاروانچییەک دەکەوتن. دەرگاکان وەهمی ئەو و پەنجەرەکان هیی منن... دەڵێم: شیرین وەرە ئەم دەرگایانە زیندان بکە و بیانخە ژێرخان، با ئەمشەویش نەڕۆن، دەڵێم: شیرین بۆ نایەی هەموویان بەندکەین و دوای بیان سووتێنین بەر لەوەی بڕۆن. ئەو هەمیشە بە دەنگێکی نوساوەوە دەڵێت: لەیلی لە بری ئەو جلانە دەست بکە بە دوورینی باڵ تا بینێرم بۆ پەنجەرەکان و زوو بگەن، دەڵێت با باڵەکان جودا بن و بەشی هەموویان بکات، باڵ بدووره سەوز بە ئەندازەی سەری قامکی بچووکت، باڵ بدووره ئەرخەوانی بە ئەندازەی باوەشێک، باڵ بدووره خاکی بە ڕەنگی حوزن، هێندەی باڵکۆن، باڵ بدووره ئای... لەیلی بەقەد دڵت.. دەنگی زۆر بڕ ناکات هێندەی تر دەنووسێ و بێدەنگ دەبێت.. دەڵێم شیرین ئەمشەو خەونەکەم جودا بوو، سێ پەنجەرەی تر هاتبوون، دەڵێم نازانی چەند جوان بوون نازی ئیمپراتۆریکیان هەبوو، هەڵبەت هەرسێکیان نا، یەکێکیان وەک شا وەهابوو ئەوانی تریش وەزیروگزیر، دەڵێم نازانی کە دەڕۆیشتن چۆن سنگیان دەرپەڕاندبوو وەک ئەوەی بیانەوێت بڵێن ئێمە هاتووین ئیتر کەسی تر بەهای نییە، دەزانم شیرین پێی ناخۆشە، بەر لەوەی بڕۆی بەرز



بکاتەوە و لووت قنج بکاتەوە تێدەگەم ئەگەر بەردەوام بم دەڵێت ئاوهاااا ئم ئم... یەکسەر دەڵێم بڕوانە ئەمانە هاتبوون نفت و نوێ بوون، سەقفی پێشەوەیان گرتبوو، دوازدە پەنجەرەی بچووکیش لە دواوە وەک نۆکەر بوون، بەڵام من خۆشم لێیان نەدەهات، بۆ ئەوەی قسەکەم تەواو بکات یەک برۆ بەرز دەکاتەوە، بەوەش دەزانم دەڵێت دوایی؟ منیش دەڵێم تەنها زیادببوون من هەر چاوم لەسەر پەنجەرە فستقییە خەمبارەکە بوو، کە لە دواوەوەی دواوە دەڕۆیشت و خەیاڵی لە شوێنێکی تر بوو... دەڵێم شیرین ڕەنگەکانیان ئادەمکوژ بوون، دەڵێم نازانی دوو تاکییە تەختە پڕ زەخرەفەکە چەندە شیرینانە دەڕۆیشت، دەڵێم شیرین بیری یەک تاکییە هیلالییەکە دەکەم ئەوەی شینێکی کاڵ بوو بۆنی خۆڵی لێ دەهات، ئەم هەفتەیە نایبینم هەرچەند چاوی بۆ دەگێڕم دیار نییە، لە بری ئەو پەنجەرە سووربادوە کۆنەکە زۆر دەبینم، کە باران

ڕەنگەکەی بردووە و سیمای پەنجەرەیەکی کێوی پێداوە کە هەر حەزەکەی بۆی بڕوانیت.
دەڵێم: شیرین وەختە دڵم بتەقێ بۆ ئەو پەنجەرە ڕەنگ خۆڵەمێشییەی هەمیشە بۆنی ترسی لێ دێت و کەس نازانێت ـ دەبێت لێوەی بڕوانمە چی ئەگەر گەیشت؟ دەڵێم شیرین پەنجەرەیەکی تیایە بە چوار پشت دەچێتەوە سەر پیرەپەنجەرەی ماڵی عەباس میرزا کە لە شامەوە هاتبوو، بڕوابکە لە تاو عیشوە و نازی دڵم ژان دەگرێ، دەڵێم شیرین دوێشەو لە پەنجەرە میانەساڵەکەم پرسی:
- ئەرێ لالۆ بۆ نەگەیشتن چما ئێوە سەدەیەک نییە بەڕێوەن؟ ئەویش بە نەزاکەتەوە وتی:
- کچم نەفەس درێژ بە، هەر کێو بە کێو ناگا، ئایەم بە ئایەم دەگات...
شیرین کترییەکە دادەگرێ و بە مقاشەکە یاری بە خەڵوزی ناو سۆپەکە دەکات، دەستی دەلەرزێ کوپێ شیر دەخواتەوە و لە هەمیشە زەردتر دەیبینم، دەڵێم شیرین مەڕۆ... ئەمرۆ... دەڵێم شیرین بەسیەتی ئەم جەهەنەمبازییە، دەڵێم شیرین بەسیە... ئەو هیچ ناڵێ و بوخچە چکۆلەکەی هەڵدەگرێ و دەڕواتە دەر بە قاترەکەی تا نزیک شار، لەوێشەوە بە پێ تا کەس ماڵەکەمان پێ نەزانێت، جا خۆی لە شلۆقییەکانی شاردا ون دەکات... منیش وەک هەمیشە دەچمەوە سەر چەرخە دەستییەکەم و دەست بە دوورینی مەلمەل و کەتان و شیفۆنە سپییەکان دەکەم، بە بزەیەکی تاڵەوە تا دەتوانم کەمەری باریکتر دەدوورم و خوارەکەشی بەرینتر، شیرین دەڵێت زاواکان حەزیان لە کەمەری باریکە، دەڵێت سەرنجکێش بیدوورە، ئەوان تەنها لە زەماوەندا ئیقباڵی ئەوەیان هەیە زاوا حەزیان لێ بکات، دەڵێت لەیلی پیاوان باریکترین کەمەریان حەز لێیە، دەڵێت لەیلی بەزەییم بە بووکەکاندا دێتەوە تەنها ئەو ڕۆژە لەو جلەیا ناسک دەنوێنن و بە سرتەوە دەدوێن و زاواکانیش گەورەترین درۆکان دەکەنە وردە شیرینی و ئەیاندەنێ... دەڵێت لەیلی دەستم دامانت سنگی کراسەکان و قوڵ و یەخەیان کراوەبێ، کەس وەک ئەوان نایانەوێ وێنای ژن بە سنگ و بەرۆکەوە بکەن... ئەوەندە دەڵێت تا دەست ئەخەمە سەر دەمی و دەڵێم بەسیەتی شیرین بەسیەتی دەزانم... دەزانم... ئیدی بێدەنگ دەبین و من بە دەم گوێگرتن لە ویزەی کترییەکەوە و ئەویش بە دەم تیژکردنی چەقۆکەیەوە بیر لە خەونەکانمان دەکەینەوە. دەڵێت: لەیلی ئەم هەموو سپێتییە لە ماڵمانە و دڵت هەر ڕەشە؟ دەڵێت: لەیلی ویردانێکی فرە دەخوێنێت و هێشتایش ناتەوێ دەسبەرداری ئەو ڕەشییە ببی؟
بۆ وازبێنم، ها؟ بۆ وازبێنم؟ نازانم... بیر دەکەمەوە بۆ سپێتی نارژێتە ناو من؟ بیر دەکەمەوە بۆ نوور ناگاتە کێلونی دڵم، بۆ تاریکی و شێ گرتوومی؟ بیر دەکەمەوە شیرین خودای هەیە، شیرین پڕە لە نوور شەوان و تەنها بوونی ئەوە من ئەهێڵێتەوە، شیرین ورشەی دێت لە نوور... شیرین سەرڕێژە لە شەوق... من خۆم دەخزێنمە ژێر پەتۆکەم و تەزبێحە دەنک زەیتوونەکە دەبەمە ناو جێیەکەم و دەنک دەنک ویرد دەخوێنم و هێدی هێدی نوقمی تاریکی دەبم، تا دیسانەوە دەگەمەوە بە پەنجەرەکان. کەرنەڤاڵی هاتنی پەنجەرەکان لە هیچ وەختێکی تر ناچێ، لە چەمەری دەکات. دانەیەک لە ناوەندا وەستاوە و ئەوانی تریش بەدەوریدا دەخولێنەوە و شین دەکەن، قەتارە لە دوورەوە وەستاوە و خەڵکەکەش مات مات بۆیان دەڕوانن، ئەوان بە دەم خولانەوەوە یەکی نەختێ قوڕیان داوە لە ناوچاوان و سەرشانیان و حەزینترینی وشەکان دەڵێنەوە، پەنجەرەکان، ماتن و سیمایان تاریکە، پەنجەرەکان بۆنی ترسیان لێدێت و من دەترسم بانگیان دەکەم کەسیان گوێیان لێم نییە، هاوار دەکەم و لە دەنگی خۆم خەبەرم دەبێتەوە، هەموو گیانم نیشتۆتە عارەقە، شیرین خەوتووە و بە دەم وەنەوزەوە دەڵێت: بەسیەتی نامەرد بەسیەتی... هێڵنجم دێ بەسیەتی.. خەبەری دەکەمەوە قومێ

ئاو دەکەم بە دەمیەوە، دەنگی لوورەی گورگ تێکەڵ بە ڕەشەبا خۆی دەکات بە ماڵماندا، سام دەمانگرێت، تەماشای یەک ناکەین، هیچ لەگەڵ یەک ناڵێین، کەسمان هیچ ناگێڕینەوە و تا سپێدە لەژێر بالیفەوە دەگرین... تەماشای دەرەوە دەکەم دەڵێم شیرین دەرەوە شەختەیە، ئەمڕۆ ئیدی ئاسمان کراسی بووکی دووریوە من هیچ نادوورم، ئەویش دەڵێت بۆ چ گورگە زاوایەک؟ من خۆم لە قسەکەی دەدزمەوە و ئەو دەڵێت هەر زاوایەک بێت مانگی بڕ ناکات، پیاوان هەمیشە برسیترن... من قسەکەیم پێ ناخوشە، من ئەمەوێ پەنجەرەکان بگەن و لێیانەوە تەماشای هاتنی یار بکەم، ئەمەوێ بیر لە ئەهوەنی و جوانی و شۆخی یار بکەم کە دەگات و نوور دێنێ... ئەو دەڵێت: لەیلی یار پیاوێکە لەسەر جێ و هیچی تر... ئەو نائومێدانە دەچێتەوە و دەڵێت لەیلی یار ئەو پیاوەیە، لەگەڵ من دێتە جێگەوە و بە تۆ دەڵێت بێ تۆ دونیا کەمە، لەیلی یار ئەو پیاوەیە لە باوەشی مندا دەگری تا خاو دەبێتەوە و لە نامەکاندا بۆ تۆ دەنووسێت:

- ئای بڕوانە لەیلییەکەم من چ مەجنونێکی بەندی گێسووتم...!

من بێدەنگ دەبم و ئەو دەڵێت دەرگاکان با بڕۆن و هەرگیز ئەو پیاوەیان لێوە نەیەت، کە جگە لە جێ هیچی تر نازانێ، دەرگاکان با بڕۆن و لە پشت دیوارەکانەوە یارەکان بمرن کە خاڵین لە جوانی... من دڵم توند دەبێت و دەڵێم: شیرین مەڕۆ... شیرین لە هەمیشە ماندووتر، بێ ئەوەی باسی خەونەکەی ئەم شەوم بۆ بکات دەچێتە دەر و من تەماشای جێیێ بچووکەکانی دەکەم و بیر دەکەمەو من و شیرین بۆ لێرەین؟ بیر دەکەمەوە چەند سەدەیە؟ بۆ ئەو کوتاڵە زۆرانە تەواو نابن و من دوا کراسی سپی نادوورم، ئەو کراسانەی کە بووکە گەمژەکان لەبەری دەکەن و زەردەخەنە ئەخەنە سەر لێویان، بیر دەکەمەوە بۆ ئەو پیاوانە تەواو نابن کە دەبێ لەگەڵ شیرنی شای جوانانداا بنوون، بیر دەکەمەوە بۆ تاریکیی من کۆتایی نایەت و ئەو نووری لێ نابڕێت؟ وەک هەمیشە بێ وەڵام ئەمێنمەوە و لە خۆم ڕائەمێنم و نامەوێ بیری شینی پەنجەرەکانم کەوێتەوە و نامەوێ خەیاڵم بچێتەوە سەر پەنجەرە کەوانەییە لێو ئاڵەکە و فرمێسکە ئەستوورەکانیان ببینم، دەمەو ئێوارە دەچمە سەربان کۆتەکەم لەبەر دەکەم و شەرواڵەکە هەڵدەکێشم و بە جزمەکانەوە بەفری سەربان دەماڵم و بۆ دوور دەڕوانم، شیرین بە ماندووی دێت وەک هەمیشە هێلنج و جنێو دەدات، خۆی دەکات بە حەمامەکەدا... من و شیرین ماندووین لەو کراسانەی کە خا زەمانە دێ و هەفتانە ئەیان بات و لەو هەواڵپرسینانەی لە شیرین کە دەڵێت کارت چۆن دەڕوات؟ ئێمە ماندووین، شیرین دەڵێت لەیلی پیاوان لاوازن، دەڵێت: لەیلی ئەوان لەسەر جێ منداڵن و لەسەر کورسی ئەحمەق، ئەڵێی لەیلی ئەوان دڵیان لە خوار ناوکیانەوەیە و ئەقڵیان لە سنگیان، دەڵێت لەیلی ئەوان... من بەرچاوم تاریک دەبێت و دەڵێم شیرین با پەنجەرەکان بگەن من تەماشای دوور دەکەم و یار ئەبینم لە نێوان پەنجەرە کاملەکەوە وەک خۆر دەردەکەوێ، وەک کەی خەسرەو بە ڕەخشەوە دێ، دەڵێم سپێدان لە پەنجەرە وەنەوشەییەکەوە تەماشا دەکەم و چاوەڕان ئەبم و نیوەڕوان لە پەنجەرە فستقییەکەوە و عەسران لە سووربادوەکە و ئێواران لە شینەکە و شەوانیش لە پەنجەرە سوڵتانییە زیوینەکەوە و ئەو ئەڵێی لەیلی دەست هەڵگرە لەو خەیاڵە، یار دەستێ جلی ڕەشە و خۆت لە مێشکتا دووریوتە. دەڵێت لەیلی دوێشەو دەرگاکان لە کاروانسەرایەک لایان دابوو هەڵدەپەڕین. دەڵێت: لەیلی هەموویان خۆیان گۆڕی بوو ئاڵووالْ، گۆرانیان دەگوت و دەنگی دەهوڵ و زوڕنایان تا ڕۆژەڕییەک دەڕۆی... دەڵێت لەیلی من دەترسم... دەڵێت: لەیلی خودا بگاتە دادمان و لەم وەیشوومەیە ڕزگارمان بکات... دەڵێت لەیلی کەی ئەم تەواو دەبێت؟ دەڵێ: لەیلی قینمە لەم دوو گۆیەی سەر سنگم، ڕقمە لە چاڵایی ناوم و ڕقمە لە دەمم و دەست دەکات بە ڕشانەوە، هێند دەرشێتەوە



تا ئیدی نەفەسی لێ دەبریت و دەنگی دەرنایەت.

دەڵێم: شیرین کە ئەم کوتاڵانە تەواوبوون چی دەکەم، دەڵێم کە دوا پیاو کۆتایی هات چی دەکەی؟ دەڵێم شیرین بۆ لەگەڵ دەرگاکان ناڕۆی لە خەوننتدا، دەڵێم شیرین من و تۆ چەند سەدەیە لێرەین؟ دەڵێم ئەم جومعەیە چەند هەزارەمین جارە هەفتە تەواو دەبێت خا زەمانە دێتەوە؟ دەڵێم شیرین تۆ دەڵێی شتێ هەیە ناوی کۆتایی بێ؟ شیرین دەنگی دەرنایە، شیرین نیشتۆتە سەر ئارەقە، شیرین ڕەنگی زەرد بووە و ئەنرکێنێ، نازانم چی بکەم لە تاواندا باوەشی پیادا دەکەم و سەری دەنوسێنم بە سنگمەوە و تێر دەگریم، دەست دەکەم بە شیرین و ڕۆ و هێند نابا شیرین بە دەستمەوە شل دەبێت، شیرین نەفەسی لێ ئەبرێت و من بانگ هەڵەیەم، یەکەمین جومعەیە بوو بە نیوەڕۆ و خا زەمانە نەهاتووە بەسەر شیرینا

ئەگریم و دەست ئەبەم بۆ کوتاڵەکە تەماشا دەکەم دوو گەز ماوە، ئەیدوورم بۆ کفنەکەی، بە نەفەسی قەتەوە شیرین تا دەر کێشەکەم و ناگەمەوە ژوور تا پاچەکە بێنم، دوا پیاو ئەگات کەس نازانێ چ شەیتانێماڵەکەی نیشان داوە، خۆی دەکات بە ژوورا و من ڕەنگم لێ ئەبرێ، تەماشای دەکەم ڕەگی ملی هەڵاوساوە و دەنگی گڕ بووە و دەلەرزێ، منیش هاوار دەکەم نزیک دەبێتەوە نزیک هێندەی نەماوە ئەژنۆم شل بێ و بکەوم، سەرم گێژەخوات و لە ناکاو دەست دەبەم بەرەو دوا و چەقۆکەی شیرین دێت بە دەستمدا و بە هەموو هێزم دەیدەم لە سنگی پیاوە، وەک گا دەنەڕێنێ و بەسەرما شل دەبێ، گەرمی خوێن هەموو گیانم دەگرێتەوە، بە هەموو بێ تواناییمەوە لای دەیەم و هەڕا دەکەمە دەر، بۆنی شێ و تاریکی و خوێن هەموو ماڵەکەی گرتووە، دەڵێم ئێستە خا زەمانە دێ... دەڵێم ئێستە دێ و کەچی بێدەنگی و تاریکی دادێ و بۆ یەکەم جومعەی تەمەنمان خا زەمانە نایە و من بە دەم هێڵنجەوە دەچمە سەربان و بیر لە هیچ دەکەمەوە!

# شەوی دووەم

بە ناوی خودای تۆبەوەرگر دەست پێدەکەم، ئەو دەمەی خۆی حیکایەتی ئادەممان بۆ باس دەکات و دەفەرمووێت:
"پاشان ئادەم لە لایەن پەروەردگارییەوە چەند وشە و نزایەکی کرد و بە دڵ و بە کوڵ پاڕایەوە خوای میهرەبانیش نزاکەی وەرگرت و لێی خۆش بوو، چونکە بەڕاستی تەنها ئەو، زاتێکی ئێجگار میهرەبان و تۆبەوەرگرە". ئەو کەسەی تۆبەوەرگرە باری تەعالایە و داوای بەخشینی لێ دەکەم لە بۆت، کە هەم بەخشەرە هەم تاکە حیکایەتخوانی ئەزەلی و ئەبەدییە. بە ناوی تۆوە نزاکەی باوک و دایکمان دەخوێنم و ڕوو لە قیبلە دەڵێم:
"پەروەردگارا ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، خۆ ئەگەر لێمان خۆش نەبیت و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە، ئەوە بەڕاستی ئێمە سوێند بە خوا لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانین."
پشت بە خۆی تۆبەت لێوەردەگرێت و دەتبەخشێت، بێ لەو کێ هەیە میهرەبان و بەخشندە و تۆبەوەرگر بێت؟ بێ لەو کێیە دەمانبوورێت خاتوون؟ ڕووبکە ئەو و داوای لێ بکە، داوای عەبدی خۆی ڕەت ناکاتەوە. داوا بکە، چۆن خودا ئادەم و حەوای بەخشی تۆیش دەبەخشێت.
ئەمشەو من حیکایەتت بۆ دەگێڕمەوە. قەراربوو دوێشەو بێمە خزمەتتان، بەڵام ئەنجومەنی فەتوا و دەستەی کارساز ئەو دوو خوشکەیان نارد، تا وەک دوو ئافرەتی نزیکت قسەت لەگەڵ بکەن. ئاخر شەرعی نییە ئەوەی ئافرەتان لەگەڵ یەکی دەڵێن، بێ پەردەپۆش لەگەڵ پیاوانی باس بکەن. عەرزی بە خزمەتتان بکەم، بەندە مەلا نجومی دەربەند فەقەرە- کوڕی مەلا نەعیمی حافزم. باوکی ڕەحمەتیم وەختی خۆی لە بایەوەوە دێتە خزمەتی شێخانی دەربەند فەقەرە، چل شەو لە تەکیە دەمێنێتەوە، دڵگیر دەبێت بە تەکیەوە و ناتوانێت دەستبەدار بێت، بۆیە لەوێ دەگیرسێتەوە، دەنێرێت بە شوێن حەرەمیدا و دەست دەکات بە وتنەی دەرسی قورعان بە شێخزادەکان. من لەوێ لەدایک دەبم، لەسەر دەستی مەلایەکی نابینادا پەروەردە بووم، کە سێ جوزئی قورئانی لە سینەدا، حەدیسی شەریفی لە دڵدا و گوڵستان و بوستانی سەعدی لە زاردا بوو. مەلا نەعیمی ناسراو بە حافز، بە زگماک نابینا بوو، یەکەم قوتابخانەی من بوو، لەسەر دەستی ئەودا خوێندەواری فێربووم، هەر لەسەر دەستی ئەویشدا وانەکانی نەحو، سەرف، فیقھ و ئەحکام فێربووم. بە ڕەحمەت بێت ئەوەی پێی بوو فێری کردم، کاتێکیش زانی ئیدی هەموو ئەوەی پێی بووە لە زانست بەشی داوم، کۆڵی بۆ پێچامەوە و ڕەوانەی سنەی کردم، تاکو لای مەلایان و زانایانی ئەوێ عیلمی کەلام و ئەدەبیات و خەتناسی فێربم. بە ڕەحمەت بێت، یەکەم حیکایەتیشم لە زاری ئەوەوە بیست.

هێشتا پێنج ساڵان بووم، ڕۆژێک لە حوجرەکەی دانیشتبوو سێ لە شێخزادەکانی لابوو، تەمەنیان حەوت بۆ دە ساڵان دەبوو. حیکایەتی دروستبوونی باوە ئادەم و دایە حەوای بۆ نەقڵ کردین. ئەو حیکایەتەی سەرەتای خەلقە. خالق لە زاری شەریفی خۆیەوە بە گواستنەوەی لە جوبرەیلەوە بە نقڵکردنی لە زاری پێغەمبەرەوە سەلات و ڕەحمەتی خودای لەسەر بێت، دەگات پێمان. باری تەعالا یەکەم حیکایەت دەگێڕێتەوە، حیکایەتێکی ڕاستەقینە لە بارەی بوونی ئێمەوە. ئەوکات باوکم بۆمانی گێڕایەوە، خودا لە قوڕ مرۆڤی دروستکرد، یەکەم نیگاری خودا نێرینەیەک بوو، هەر خۆیشی ناوینا ئادەم. ئادەم هیچی نەدەزانی، خودای میهرەبان هەموو شتێکی فێر کرد، ئادەم دروست بوو، پیاوێکی باڵابەرزی ناوشان پانی دەست و بازوو پتەو، پێستێکی سپی و موویەکی درێژ و تیژ و ڕەش، ئادەم کاتێک ئەفرێنرا لە هیچ دروستکراوێک نەدەچوو، نیگارێکی پتەو و توند بوو. پاش ئەوەی خودا بە فریشتەکانی نیشاندا، لەوان زرنگتر و هۆشمەندترە، ئیدی خودا ناردییە بەهەشت و سەرپشکی کرد بۆ گەڕان و دۆزینەوە. ئادەم ماندوو بوو، لەو دنیا نفت و نوێیەی تێیدا بوو، لەوەی لە نەبووەوە هاتبووە بوون، دەخولایەوە بەناو باخێک لە باخە بچکولە و ڕەنگینەکانی بەهەشتدا، تەنها بوو، دەیزانی لەناو ئەو هەموو جوانییەدا شتێک نوقوستانە، بە دەم تێفکرینەوە ماندووبوو، هێند ماندوو تا هەلاکەت لە کەسیرەی خست و چاوی گێڕا، دارێکی دۆزییەوە سێبەر چڕ و بارپڕ. لە بنیدا پاڵی دایەوە. چووە خەوێکی قووڵەوە. یەکەم خەوی ئایەم پەنا بە خوا قووڵ و نەرم بوو. ئەو کاتەی ئادەم خەوی لێکەوت، خودای باڵامەقام، بە فەرمانی خۆی لە پەراسووی چەپی نیگاری دووەمی خولقاند، کە ناسراوە بە نیگاری نەرمونیان و لەتیف. دایە حەوا لە ئادەم دروست بوو.

من وەک باوکم نازانم ئەو حیکایەتە بگێڕمەوە، باوکم دەیوت ئەوانەی نەقدی ئیلاهی دەکەن، بۆ ژن لە پیاو دروست بووە و دوایی هەموو شتێک لە ژنەوە دروست دەبێت. ئەو دەیوت نەفامن ئەوانەی نەقدی باری تەعالا دەکەن، پڕ حیکمەتە کاروباری ئەو. پیاو زبر و توندە تەبیعەتە، ئەگەر لە هۆشیاری و بێداریدا بە ئازارەوە حەوای لێ هاتبایە، ئەوا تووڕە دەبوو و خۆشی نەدەویست، خودا لە نزیکی دڵ حەوای خەڵق کرد. بەڵام حەوا ئافرەتە، میهرەبانە، لە هۆشیاریشدا عەزاب بچێژێت بیری دەچێتەوە، داوێنی خۆی خۆشدەوێت.

خوشکە، عەزرتان کەم، ئەوە یەکەم حیکایەت بوو من بیستبێتم. کاتێک بوومە سوختە و دواتریش لە فەقێیەتیدا بە دوای حیکایەتەکانی قورئاندا گەڕام تا بزانم حیکایەتخوانی خودا چلۆنە. خودا وەک ئێوە ناگێڕێتەوە، وەک حیکایەتبێژان نییە، ئەو حیکایەتەکان پشک پشک بەسەر قورئاندا بەش دەکات، حیکایەت لەناو حیکایەت، وەختێک تەمام بوو خۆم حیکایەتی ئادەم و حەوا بخوێنمەوە، لێم مەعلوم بوو سەرەتای حیکایەتەکە لە سورەی شەریفی بەقەرەدایە، بەڵام تەواو نابێت و بەشێکی تری دەکەوێتە سورەی ئەلئەعراف و لە چەندین سورەتی تردا باسی دێتەوە. هەر ئەو کاتە وتم: ئەی باری تەعالا چۆن وا دەکەی ئەم خەڵکە گوێبگرن و تەحەمول بکەن تا کۆتایی حیکایەتەکە بزانن. ئاوایە حیکایەتی ئەو. بەڵام ئەی حیکایەتی تۆ چۆنە؟ لەو کاتەوەی هاتووینەتە ولایەتەکەت، هەر جارەی دەمان نێریتە حیکایەتێک. ئێمە خەریکین ڕۆژ دەبەینە سەر، لەو مەملەکەتەت کە مەگەر باری تەعالا بزانێ بۆ خەڵقت کردووە؟ نەعوزوبیلا بەوە تووشی گوناهـ دەبیت بۆیە بەلا ڕووی تێکردوویت، تەوبە بکە، کە خالق خۆی تۆبەپەزێرە.

ئەم شەو من حیکایەتتان بۆ نەقڵ دەکەم، ئەگەرچی وەک باوکی ڕەحمەتیم ناتوانم بگێڕمەوە، بەڵام حیکایەتی خۆم و ئەو حیکایەتانەشت بۆ باس دەکەم، کە پێش ئەوەی ئەم بەڵایە ڕووت تێبکات دەتناردم.



ئەمن لە حیکایەتدا بم یان نەبم قەیر و حورمەتم دەگیرێت، لە خوا بەزیاد بێت. با عەرزت کەم، مەلا لەناو کوردانا جێگەی ڕێز و حورمەتە، لە شارەکەشتدا کە زۆرینە کوردن، قەیر و حورمەتی منیان لایە، وەک چۆن قەیری مەلا فەیزی شوشتەری و مەلا کەریمی کەندولەیی و مەلا عەبدولای جامەڕێزی دەگرن، وەهاش ڕێزی من دەگرن. هەر ئەوەندەی ناوەکە مەلایە بۆ خۆی جێگەی ڕێزە. دەڵێن ناوەکەمان لە مەلەئی عەرەبییە هاتووە، کە بە واتای پڕ دێت، پڕ لە عیلم و شەریعەت، پشت بە باری تەعالا. هەندێکی تر وای بۆ دەچن کە لە مەلائەوە هاتووە، کە جیهانی مەلائیکەکانە و عالەمی بالاین حەدمان نەبێت وەک خەڵکی ئەو جیهانە واین. ئەو پێشناوە بەسە قەیرمان هەبێت. جارجارە هەرزەکار پەیدابوون

که پلار دەگرن و دەیانەوێت ڕوو لە کفران بکەن، تەشەر دەدەن و بێڕێزن، بەڵام نابێت ئێمە باسی ئەوانە بکەین، کە هێشتا نازانن لەم دنیایەدا چییان دەوێ. بە مەسەل جارێک بەناو بازاڕی شەمسولملوکدا دەڕۆیشتم، بە جبەی ئەڵوەنی و مێزەرێکی سپییەوە تەماشا دەکەم دوو هەرزەکار لە دوامەوە پێدەکەنن، دەڵێن:

- تۆ شا ئەم مەلایە ناکەی ئێستە پاشقولێکی لێ نەدەیت، ئاخر بڵێ کەڵکی تۆ چییە؟

منیش ئاوڕم دایەوە وتم:

- ڕۆڵە گیان حەزەکەی پێت بڵێن هەتیوەی زۆڵ؟

گەنجە ڕەنگێکی هێنا و برد وتی:

- مامۆستا ئەو قسەیە لە شەئنی تۆدا نییە بیکەی.

منیش وتم:

- ڕۆڵە؛ دە مەلا سوودی ئەوەیە، کە دایکتی لە باوکت مارە کردووە تا پێت نەوترێ زۆڵ...!

وەڵا دوو گەنجە سەریان داخست و ڕۆیشتن... شتی واشمان بە تووشەوە دەبێت، وەک چۆن جارێک شێخ حاجی عیزەدین بەناو کۆچەکانی بەرزەدیارا دەڕۆی مناڵەورتکەی کوچە بە دەرویشە قەحبە دوای کەوتبوون... بێ ئەوەی بزانن ئەو یەکێک بوو لە گەورە ئەولیایانی ئەم شارە. ئیتر ئێمە لە تەمەندایىن دەبێت تەنگەچیقڵدانە نەبین. خودا داوای سەبر لە پیاوانی خۆی و نوێنەری پێغەمبەر دەکات، بۆیە سابر و بەرگەگرتووین، وەک چۆن حەزرەتی ئەیوبی میحەنتدیدە، ئارامگرتوو و بە سەبر بوو، دەبێت ئێمەیش بە سەبر بین. خوشکە باری تەعالا خۆی حەقایەتی ئەو پێغەمبەرە نازدارانەمان بۆ باس دەکات، چۆن لەسەر پەیمانی خۆیان سووربوون و بەرگەی عەزابیان گرتووە، لەبەر زاتی باری، وەگەرنا کێ هەیە بتوانێت بەرگە بگرێت؟ ئەگەر کەسێک نەبێت لە دوورەوە ئاگای لێ بێت و پەیمان و بەڵێنی پێ دابێت؟ خوشکە عەرزی جەنابتانی بکەم. سەبر لە کۆڵەکە گەورەکانی دینی ڕەسولی ئەکرەمە، ئەگەر سەبر نەکەین چیمان پێ دەکرێت، بۆ ئێمە لە حەزرەتی ئەیوب، مەردترین بیلاتەشبیهـ؟ ئەو پیاوەی خوا لە قورئانی خۆیدا باسی دەکات، ئەگەر سەبرەکەی ئەوەندە زۆر نەبووایە دەبوو بە حیکایەت؟ خودا باسی شتێک ناکات ڕاتنەچڵەکێنێ، خودا حیکایەتی شەخسێک ناگێڕێتەوە، ژان نەخاتە دڵەوە. بۆیە لای ئێمە گەورەترین حیکایەتساز زاتی باری خۆیەتی، کە هەم بەڵانێرە و هەم بەڵالابەر، هەم دەردنێرە و هەم شیفادەر.

خوا لە حیکایەتی ئەیوبدا، سەبری ئەو پیاوەمان بۆ نەقڵ دەکات، کە چۆن شەیتان دەیەوێت زەفەری پێ ببات و ناتوانێت. ئەیوبی میحنەت تووشی دەردی بێ دەرمان دەبێت و کرم لە جەستەیەوە، خودا پەنامان بدات هەڵدەقوڵێت، وەک چۆن عەزاب لە ئاگری جەهەنەمەوە کڵپە دەسەنێت. کرمەکان لەناو خۆیەوە سەر دەردێنن و دەست دەکەن بە کرماندنی گۆشتەکەی، کە ئێستە لێی دروست بوون، بڵاوە دەکەن بەسەر جیسمیدا، بە ئەمری خودا ئەیوب نامرێت، خودا کرمەکان زۆرتر دەکات، بە دەست خۆیەتی بەرەکەتیان تێدەخات، لە گۆشتەکەوە سەر دەردێنن و دەست بە خواردن دەکەن، جارجارێک یەکێک لە کرمەکان نەفام و کەمتوانایە دەکەوێتە سەر زەوییەکە و بە دەوری خۆیدا خول دەخوات، ئەو میحنەتدیدەیە ڕەزای خوای لەسەر بێت، هەڵی دەگرێتەوە و دەیخاتەوە سەر ڕانی تا بێبەش نەبێت لەو ڕسقەی کە خودا پێی داوە، نەوەکونێ خودا لەبەر ئەو گوناهە نەیبەخشێت.

ئاوایە سەبری ئەو پیاوخوایەی لەبەر ئازاری دارزانی جەستەی نانالێت، ناشکوری بە خالق و جەبری ناکات، کە هەر خۆیشی رەحمان و رەحیمە. ئەیوب سەبر دەکات، تا خودا مژدەی پێدەدات لەو تاقیکردنەوەیدا قبوڵ بووە، ئاوێکی بۆ هەڵدەقوڵێنێت، خۆی تێدا بشوات جەستەی لە نو پاک بێتەوە، وسڵی نەخۆشی دەر بکات و دوو رکاعەت نوێژی شوکرانەبژێری دابەستێت.
ئاوایە ئەو حەکایەتەی کە خوا بۆ ئێمەی باس دەکات. ئەیوب ئومێدی بە بەخشندەیی و میهرەبانی خوای گەورە هەبوو، بۆیە لە دڵیدا سەبر و ئارامی هەبوو، خۆ ئەگەر ئەو ئومێدەی نەمایە پەنا بە خوا هیچ یەکێک لە پیاوەکانی بەرگەیان نەدەگرت و نەعوزوبیلا شوێن زورنای شەیتان دەکەوتن. پیاوسالحان و ئەولیایان و ئەنبیاکان بە ئومێدی رەحمەتی ئەو بەرگە دەگرن. نەک هەر ئەیوب هەمووان وەها بەرگەی عەزابیان گرت، هەموویان ئارامگرتووبوون تا خودا پێی بەخشین، تا خودا تەوبەی لێوەرگرتن. خۆ ئەگەر پێغەمبەرێکیان سەبری نەکردبێت، ئەوا زاتی حەق زللەی میهرەبانی خۆی لێداوە و بیری خستۆتەوە، کاری ئەو بەرگەگرییە. ئێمە کاتێک ئەمانە لە وتارەکانی رۆژانی هەینیدا باس دەکەین، دەبێت نموونەی حیکایەت بێنینەوە، خودا خۆی قورعانی پیرۆزی لەسەر حیکایەت دانا، بەردی بناغەی قورئان حیکایەتە، بۆیە مەلای دانا و بە فکر، یەک لە سێی خوتبەکەی حیکایەتە و یەک لە سێشی شیعر و قەول، وەگەرنا ئەو قسانە وەک با دێن و دەچن، ئەگەر حیکایەت نەبێت کێ هەیە بەرگەی ئەو هەموو توورەیی و تۆسنییەی ناو شەرعی مەلایان بگرێت. مەلامان هەیە خەڵکان بە ئاگری جەهەنم دەسووتێنن و زارەترەکیان دەکەن، مەلامان هەیە دەشیرێنێت وەک وەکیلی عامی جەحەنەم و دین ناشرین دەکات، بەڵام مەلای دانا و بە درک، حیکایەتی شیرین و قەولی زێرین و لاوژە و وتاری هاوەڵانی خوا نەقڵ دەکات.
جا با بێینەوە سەر حیکایەتی ئەو کەسانەی کە سەبر ناکەن، وەک چۆن لەوانەیە تۆیش سەبر نەکەیت و بتەوێت حیکایەتم بگێرمەوە و برۆم. بۆ بیری حیکایەتی یونست نییە، ئەو پێغەمبەرە کەم تەحەمولەی زوو تاقەتی ئومەتەکەی خۆی نەما، بە ناشرینی ئەوان ئۆقرەی لەبەر هەڵگیرا، ئەو شارەی بەجێ هێشت کە دەبوو رێنماییکەریان بێت. یونس خوا بیبەخشێت و لێی رازی بێت، نموونەی کەمتاقەتی بوو، سالانێک بوو هاتبووە موسڵ، کە یەکێکە لە شارە کوردەکان و لە حیکایەتکاندا بە نەینەوا ناوی هاتووە. نێردرابوو تا رێنماییکەر و هادیی ئەو خەڵکە بێت کە پشتیان لە خوا کردووە و دەستیان داوەتە پەرستنی سەنەمێک، کە خۆیان بە دەستی خۆیان دروستیان کردووە. وەها دەبێت: یونس بە سیمایەکی نەرم و خەمبارەوە وەعز و ئیرشاد دەکات، بەناو خەڵکەکەدا دەگەرێت، پێیان دەڵێت:
- ئەی ئەو خەڵکەی، دروستکراوی خودایەکن، لە کەس نەبووە و کەسی لێنەبووە و نابێت، روو بکەنە ئەو کە سزای توند و تۆقێنەری بە لاوەیە..بەڵام نە کەس گوێی بە قسەکانی دەدا، نە لەو جەزایە دەترسان، کە خوای ئەو لێیان دەسەنێت. یونسی بێ سەبر کاتێک هەموو رۆژ و شەوێک پەیامی ئیلاهی دەگەیاند و هیچ کەس بڕوای پێ نەدەهێنا، عەسای هەڵگرت و ئەمجارە بە سیمایەکی توورە و خەمبارەوە لە دەروازەی شار چووە دەرەوە و وتی:
- خالقا، ئەز ئەرکی خۆم بەجێگەیاند، وان وەریان نەگرت، تۆ تۆڵەی خۆتیان لێ بستێنە، کە من بێدەسەڵات و نەتوانام.
پەنا بە خودا، خودا لێمان خۆشبێت، خودا تۆف و تاریکییەکی بۆ ناردن، پیاو سەری سپی دەبوو، منداڵی بەرلانکە زورەی دەگەیشتە حەوت مەملەکەت، ژن بەری دەخست و پیرەپیاو گیانی دەردەچوو. ئەوسا شایەتمانی بەهەقیان هێنا

و پەشیمانی ئەوکی گرتن، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو، ئەو پێغەمبەرەی هەڵبژێرابوو بۆ نیشاندانی ڕێگای ڕووناک، لە زوڵوماتی کوفردا جێی هێشتبوون.
جا با بچینە لای یونس. یونس ڕۆی ڕۆی تا گەیشتە لای دەریا و ویستی وەها لەو شارە دوور بکەوێتەوە، کە خودایان نەویست و پێغەمبەرەکەیان تووڕە کرد، هەرگیز نەیبینێتەوە. جا سوبحانەڵا ئەو دەمەی گەیشتە بەندەر دیتی حەوت پیاو باریان ناوە بە کەشتییەک بڕۆن. ئەو وەختەی ئەمیان دی خولقیان کرد و ئەویش لەتەکیان کەوتە ڕێ. پەنا بە خوا هێشتا حەوت فەرسەخ لە وشکانی دوور نەکەوتبوونەوە توف و کرێوەیەک بەری ئاسمانی گرت، دەریای وەک نەخۆشێک کە لە تاو ئازاری سکی پێچ بخوات، پێچ پێدا، دەریا لولی دەخوارد و کەشتیش لە بانی بەر شەپۆلان دەکەوت و وەک چۆن پیرێکی سەرجێ نزیکە لە مەرگ، وەها نزیک بوون لە تیاچوون، هەموو باریان فڕیدایە ئاو، سوودی نەبوو، بڕیار درا یەکێکان لێ کەم بێتەوە تا کەشتییەکە سووک بێت و بەرگە بگرێت، قورعەیان هێنا، ناوی هەر هەشتیان نووسراو دەستیان لە کیسە نا بۆ دەرهاوردنی، لە جاری یەکەمدا سوبحانەڵا، ناوی یونس دەرچوو، حەوت پیاوە لەبەر قەیر و حورمەت ڕوویان نەهات بیخەنە ناو ئاوەکەوە، دیسانەوە بۆ جاری دووەم دەستیان لەنێو تورەکە بۆر کرد، ئەوجاش ناوی یونس هاتەدەر، پیاوان وتیان دەبێت جارێکی تریش بیکەینەوە وەها لە باری سێیەمیشدا هەر ناوی یونس هاتەوە و بۆیە، وتی:
- دەنگ مەکەن، خودا مەیلی لەسەرە من فڕێ بدرێمە ئاوەوە!
یونس خۆی هەڵدایە دەریاوە، بەرەو ناو قووڵایی کێش بوو، وەک چۆن، ئاو بەناو دەشتی وشکدا ڕۆ دەچێت. دەریا برسێتی شکا و بێدەنگ بوو، ئەو دەم یونسی بێ سەبر و کەم تەحەمول، بە فەرمانی باری تەعالا کەوتە ناو سکی نەهەنگێکەوە، بە ئەمری خالقی بێ چوون سێ شەو و سێ ڕۆژ لەناو سکی نەهەنگەدا مایەوە، تا هەست بە گوناهی کیبر و کەمتاقەتی خۆی بکات. جا دەگێڕنەوە یونس لەناو قورگی نەهەنگەدا تووشی ڕامالانی پێست بوو وەک مەلۆتکەی لە دایک نەبوو، بێ پێست وەک گۆشتێکی سوور بوو. خودای تەعالا لە قورئاندا حیکایەتی ئەو بە زولنون باس دەکات، کە قەستی لەو ناوە خاوەنی نەهەنگ یان حوتە، جا خودا بە خاتەمی ئەنبیا دەفەرمووێت حیکایەتی ئەوت بیر بێت و لەناو سورەتێکدا، کە بە ناوی پێغمبەرانەوەیە، وەک دەنگی تەسبیحێک بۆ ئیمامەکانی باس دەکات و دەفەرمووێت: "یادی (ذو النون)یش بکەرەوە کاتێک بە تووڕەییەوە ڕۆیشت، گومانی وابوو کە هەرگیز دنیای لێ تەنگ ناکەینەوە، جا لەناو تاریکاییەکاندا هاوار و نزای لێ بەرز بۆوە و وتی: پەروەردگارا هیچ خوایەک نییە جگە لە تۆ، پاکی و بێگەردی هەر بۆ تۆیە، بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم. ئێمەیش بە هانایەوە چووین و ڕزگارمان کرد؛ لەو غەم و پەژارە و تەنگانەیەی کە تێی کەوتبوو، بەو شێوەیەش ئیمانداران ڕزگار دەکەین." جا ئیمامان فەرموویانە هەر کەس نزاکەی ئەو بخوێنێت لە تاریکی و نەهامەتی ڕزگاری دەکات. ئیتر خودا ئەمری پێدەکات لەژێر سێبەری کولەکەیەکدا بخەفێت تا هەم میشوولە لێی نەدات، هەم بیخوات و ئەهوەن بێتەوە. بەو شکڵەیە تاوانی ئەو عەبدەی سەبری نییە. جا زۆرن حیکایەتی ئەوانەی سەبریان گرتووە و ئومێدیان بە خالقی یەکتا بووە.
جارێک لە مەجلیسی مەلایاندا بیستم، کە باسی حیکایەتی یونس پێغەمبەر کار لە فەقێیەک دەکات. هەموو بەیانییەک دوای نوێژی بەیانی سورەی موبارەکی یونس دەخوێنێت و دەگری، ئەوەندە گیرۆدەی حیکایەتی یونس دەبێت، سورەکانی تری قورئان واز لێدێنێت. ئەو سورەتە ئەزبەر دەکات و دەیڵێتەوە. مەلایان دەگێڕنەوە فەقێ ئەمە کاری بوو، سبەینان لە

دەنگی ئەو خەبەرمان دەبووەوە، ڕۆژێک کە لە خەو هەستاین، تەماشامان کرد فەقێ ئەو سورەتە ناخوێنێ و دانیشووە بە کوڵ دەگری، لێمان پرسی چییە؟ وتی:
- سوبحانەڵا، ئەم شەو یونس پێغەمبەر تەشریفی هاتە خەوم، لە دوورەوە هەمان ئەو تووڕەییەی پێوە بوو، کە لە شار دەرچوو. فەرمووی هۆ عەبدی خودا، ئێمە یەک جار خەتامان کرد، تۆ ڕۆژی هەزار جار ئەو خەتایە بەکوڵ و بەدڵ دەگێڕیتەوە و برینی زامانم دەکولێنیتەوە، ترسی خودات بێت، ئازارت بە دڵم گەیاند یەزدان ئازارت پێ نەگەیەنێت.
ئێتر فەقێی کلۆڵ دوای ئەو خەونە، هێند ترسا و شەرمەندە بوو، کاتێک قورعانی خەتم دەکرد لە سورەی یونسدا دەنگی نزم دەکردەوە.
جا ئەمانەن حیکایەتی سەبر، لە زەمانەی ئێستەکانیدا ئەوەندە خراپە زۆر بووە کێ باوەڕ بەم حیکایەتانە دەکات، ئەو حیکایەتەی بۆم گێڕایەتەوە، لەمەڕ ئەیوبی میحنەتچەشتە بۆ ئەمە بوو. پێش ئەوەی بێمە ئەم شارەی تووە و نەعوزوبیلا کە دەڵێن: گوایە شتی وا نییە و تۆ ئێمەت خولقاندووە. ئێمە لەناو جەبری زەمان و گێڕانەوەی تۆداین. من لەگەڵ باوکم چوومەتە دێیەک نزیک ئیمارەتی بابانەکان بە ناوی بەردەکەڕ، دێیەکی بچووک، لە خزمەت باوکمدا (مەلا نەعیمی حافز) بۆ زیارەتی شێخی هاوەڵی چووین، کە لەوێ نیشتەجێ بوو، ناسراو بە شێخ قادری گەردنزەرد، لەوێ قیسنێکیان نیشاندایـن و چووینە زیارەتی، بە فرسەخێک لە سەروو ئاوایی لە بن دارەبەنێکی پیر و ئەستوور و بە سەبر، قەبریکی لێیە، کە ناسراوە بە حەزرەتی ئەیوب. شێخی گەردنزەرد بۆی گێڕاینەوە کە ساڵانێکە و لە هەژدە پشتیەوە بۆیان باسکراوە، ئەو گۆڕە لە وێ بووە و گۆڕی پێغەمبەری یەزدانییە، چەندین جار خەوم پێوە دیتووە پیاوێکی باڵا ناوەندی نوورانی، دەستی لە گۆڕەکە دەردەهێنا و نەخۆش بووم دەیهێنا بە سەرما ئەلەمم تێدا نەدەما. بەڵگەی ئەوەی ئەم مەرقەدە ئەیوبی میحنەتدیدەیە، ئەو دارەبەنە پیرەیە، کە هەموو بەهارێک کرمەڕێز دەبێت، ڕێک لە دەمەوەختی سەوزبووندا کرم تێی دەوروکێت. هەر ئەو کاتە لە ناوەندی دێیش بە دووری چل پێ لە ئاشی ماڵی شێخ قادری گەردنزەردەوە زەنەیەک هەیە، هەڵدەقوڵێ لە ناخی زەوییەوە و ئاوەکەی مەنگە و قورس، دەڵێن هەر گول و گەڕێک خۆی تێدا بشۆرێت چا دەبێتەوە. دەڵێن ئەو ئاوەیە کە ئەیوب خۆی تێدا شوشتووە و لە برین پاقژ بۆتەوە.
دەگێڕینە و نەقڵە، جارێک کوڕی یەکێک لە میرەکانی ئەردەڵان تووشی گولی دەبێت، ڕێبوارێکی ئەم دەشتی شارەزوورە باسی ئەم پیاوچاکەی بۆ دەکات، ئەویش تەدارەک ڕێ دەخات و وەزیر و نەعیمودەولەی خێزانی و حەوت غولام و سێ کەنیزەک و هەژدە سوار دەخاتەگەڕ، تا کوڕەی بێنن لەو ئاوەیدا بیشۆن. ئەو کاتەی ئەمان دێن، لە ڕێ چەتەوڵ ڕووتیان دەکاتەوە، ئەوانیش تووڕە دەبن و دەیانەوێت بگەڕێنەوە، بەڵام نەعیمودولەی خانەدانی ئەهوەن دەڵێت:
- ئەگەر ئێمە سەبری ئەوەمان نەبێت، چۆن چاوەڕی بین بروا بە سەبری پیاوێک بکەین، کە ئێمە دەمانەوێت لە ئاوی وڵاتەکەی کوڕەکەمان بشۆرین و شیفای بێتێ؟!
بۆیە نەزر دەکات ئەگەر کوڕەکەی چاک ببێتەوە، ناوی لە ئەمانوڵاوە بگۆڕێت بۆ ئەیوب. بەو شێوەیە بە پێ ڕێدەکەن تا شەبەقێک لەگەڵ بانگی بەیاندا دەگەنە دێیەکە، لە دوو کوڕی جەوان، کە گاگەلیان گرد کردۆتەوە لە دێ دەرچن، هەواڵی ئاوەکە دەپرسن، ئەوانیش وەک دوو هەرزەی تووڕە و تۆسنی کەللەگەرم تەماشای یەک دەکەن و دەڵێن:
- ئێمە شتی وامان نەبینیوە. بەس ئاوێکی لێیە لەو خوارەوە، دەڵێن موبارەکە، ئێمە (دوور لە ڕووی جەنابتان خاتوون،

بیلامانێ، پەرژینێ قایم بێ) کەری مزگەوت ئەگێین و لەو ئاوەیدا خۆمان دەشۆرین پاک دەبینەوە.
نەعیمودەولە بەو قسەیە قرچە لە دڵییەوە دێت، بەڵام سەبر دەکات و دەڵێت:
- ئاوەکەمان پێ نیشان بدەن، لاو و خێرتان دێتە رێ.
ئاوەیان نیشان دەدەن، دەچنە سەر زەنەکە و ئەمانولای تێ هەڵدەکێشن، دەیبەن لە مزگەوت دەیخەوێنن. بە ئیزنی باری تەعالا دوای سێ رۆژ ئەلەمی تیا نامێنێت و خاتوو نەعیمودەولە وەک شێرەژن سێ جار ناوی ئەیوب بە گوێی کوڕە دە ساڵانەکەیدا دەدات، رۆژی چوارەم دەیانەوێت بگەرێنەوە، سپێدان تەرمی دوو لاوەکە دێینەوە ناو ئاوایی. کە دەروانن، دوور بێت لە رووت بە قەپاڵی گەورە عەیبیان پێوە نەماوە و سەریان پان بۆتەوە. دەڵێن: رێبوارێکی دێی هاوسێ دیتوونی، سەریان لەژێر تلوبەردێکدا بووە، و دوو کەریش سەریان بەسەر ناوگەڵیاندا شۆڕ کردوونەتەوە، زەکەریانی قەپاڵ لێگرتوون و تفیان کردۆتەوە.
سوبحانەڵا من ئەوەم لە ماڵی شێخی گەردنزەرد بیست، گوایە گوێدرێژی مزگەوت ئەو بوختانەی قبوڵ نەکردووە لەتەک گوێدرێژێکی تردا چوون تۆڵەی خۆیان بکەنەوە و هەقی ئەیوبی میحنەتدیدە بسەنن. ئاوایە خوشکە، پیاوچاکان هەر هەبوون، خوا خۆی فەرموویەتی ئەوەی ئازاری پیاوچاکانی من بدات ئازاری دەدەم، جا زۆرێک لە مەلاکان بڕوا ناکەن لەناو شارێکی کوردا پێغەمبەرێک بەو گەورەییە هەبێت، ئینکاری دەکەن، وەلێ من ئینکاری ناکەم، دەڵێم ئەویش نەوێ پیاوچاکە. خوا لەبەر ئەو بمانبەخشێت.
جا خوشکە ئەمانە هەمووی حیکایەتی سەبری پیاوچاکان بوون، ئێمەیش دەشێ سەبر بگرین وەک چۆن پیاوچاکان سەبریان گرتووە. ئەگەر سەبر نەگرین تووشی بەلای ناگەهانی ئیلاهی دەبین. سەبر دەگرین تا خودا لەم بەڵایە رزگارمان دەکات و حیکایەتە گەورەکەی جەنابتان بێت و هەموو شت تەواو ببێت. خوا شاهێدە وەک خوشک و دایکی خۆم خەممە، دەمەوێت بەر رەحمەتی ئیلاهی بکەویت و خوا بتبەخشێت. یەزدان رێیت نیشان بدات، کە تاریکی دەوری گرتوویت. خوا لێت رازی بێت کە خەڵکان لێت رازی نین، خۆت و ئەوانیش تووشی گوناهـ دەکەیت. وەک ئەو جارەی کە فەقێ ناتیقی پینەدۆزت تووش کرد.
لەوانەیە تۆ بیری مەملەکەتەکەت نەبێت چی تێدا ڕوو دەدات و چۆن دەگوزەرێت، بەڵام ئێمە بێ لەو حیکایەتانەی پێش شارەکەی تۆ هەمان بووە، بێ لەو حیکایەتانەی، جاروبار دەمانئێرێت، حیکایەتی ناو قەلەندەرئاواشمان هەیە، هەر ئەمە خۆی حیکایەتێکی گەورەیە و تۆ نایبینیت، دەڵێی صم و بکمت لێ کراوە، خوا پەنامان بدات.
لە شاردا سێ مزگەوتی لێیە و تەنیا لە مزگەوتی ئیمام جومعە دەکرێت، لە مزگەوتەکانی بەرکێو و سەفابەگ دا جەماعەت دەکرێت، لە هەرسێکیشیاندا حوجرە و دەرس هەیە، وتاربێژی مزگەوتی ئیمام بە من دراوە و مەلایان منیان هەڵبژاردووە. هەر لەوێش، حەفتا سوختە و چل فەقێم هەن. دەرسەکانی کەلام و بەیان و بەدیعیان پێدەڵێم، بۆ دەرسەکانی تر دەیان نێرمە لای مەلاکانی شار، وەک دەزانی تەنها مورشیدی کول و کامڵ باری تەعالایە، ئێمە بێ لە نەزانێکی کاڵفام هیچ نین.
مزگەوتەکەی ئیمام دەکەوێتە ناوەڕاستی شار و لە کێوی سوورەوە ئاوی زێیەکی بۆ دێت و بەناو مزگەوتەکەیدا دەڕوات، لەوێوە بەناو چەند ماڵێک و ئەوسا بەرەو رۆژاوای باشوور مل دەگرێت. لە سایەی ئەو ئاوەوە باغێکی گەورە بە چوار لای مزگەوتەکەدا هەیە، کە لەوبەر باخەکەوە بە چواردەوردا حوجرە دروست کراون و لە لای باکوورییەوە خانێک بۆ

ڕێبواران و نەداران کراوە، لە ڕۆژهەڵاتیشییەوە شوێنی ئەو فەقێیانەیە کە غەریبین و بە قەستی عیلم و مەعریفە ڕوویان لە مزگەوتی ئیمام کردووە. ناو مزگەوتەکە بەرینە و حەفتا تاقی تێدایە، لە ناوەڕاستیدا قەندیلی هەزار شەمع هەڵواسراوە، قوبەی مزگەوتەکە پیرۆزەییە و وەختی خۆی وەستایان لە ئەسفەهانەوە بۆ هێناوە، تا بە چەشنی مزگەوتی ئیمامانی خۆیان بیڕازێننەوە.
ڕۆژێک دەمی نوێژی بەیان، کە دەبوو سەرکاری فەقێیان سۆپە پێبکات و چایی دەم بکات، فەقێیان بۆ نوێژی جەماعەت هەڵسێنێت، بە دەورە ئەو سورەتە قورسانە بخوێننەوە، کە دەرسی ڕۆژی پێشووە بووە و دەبێت ئەزبەری بکەن. کەچی ئەو ڕۆژە سەرکاری فەقێیان بە ناوی فەقێ ناتیقی پێندۆز لە شوێنی خۆی نییە. ئەو بەیانییە فەقێیان دێرتر هەستان و نوێژمان خوێند ئەملا فەقێ، ئەولا فەقێ نەمان دی، هەواڵم پرسی، وتیان: قوربان ئەمشەو لێرە نەماوەتەوە و دەڵێن خاتوون؛ سەرمەدی قاسیدی ناردووە بە شوێنیدا بۆ حیکایەتێک، کە بڕیارە ئەم بەرەبەیانە بیگێڕێتەوە.
خاتوو شەهرەزاد؛ دەڵێن ئێوە لە دوای ئەو بەڵایەوە هیچتان بیر نییە، بەڵام فەقێ ناتیق کوڕی پێرەژنێکی نەرمونیانە، لە دەرگای ڕۆژهەڵاتەوە ماڵیان بەرامبەر بە مزگەوتی ئیمامە.
ڕۆژە ڕۆیشت و بۆ ڕۆژی دووەم فەقێ ناتیق دیار نەبوو، ڕۆژی دووەم ڕۆیی و ڕۆژی سێیەمش وەها، ئەوسا لەگەڵ هەردوو مەلای تازە ئیزن پێدراودا، کە مەلا عەباس و مەلا ئەیازن، لە دەرگەی ماڵیانمان دا، دایکی پەزێرایی کردین. ئێمە جۆیای حاڵی بووین، وتی: ناتق نەخۆشە. فەقێ ناتقی چی، خوا پەنامان بدات ڕەنگ بە ڕوویەوە نەماوە. لە ئەحواڵمان پرسی، لەبەر حورمەتی ئێمە هەستا پاڵی دایەوە و وتی:
- قوربان، خەجاڵەتی جەنابی تۆ و جەنابی مەلایانم. بەڵام من ناتوانم بێمەوە حوجرە.
کە وەهای گوت، ئێمەیش تەماشایەکی یەکمان کرد و سوبحانەڵایەکمان کرد. من دەستێکم بە ڕیشمدا هێنا و وتم:
- کوڕی خۆم، ناتیق؛ ئەمە سەبری تۆیە بەرامبەر بە ناخۆشی و ڕەنجی دنیا، ڕێگەی تۆ درێژ و قورس و پڕ هەوراز و نشێوە.
وتی:
- قوربان من خەمی هەورازانم نییە، بەس ئیمانم دانەمەزراوە، تووشی گوناحی کەبیرە بووم، ڕووم هەڵنایەت بێمەوە حوجرە.
جا خوشکێ بە خزمەتتانی عەرز بکەم، سەرکاری فەقێیان، تەنێ سێ مانگی ماوە ببێ بە مەلا و ئیجازە وەربگرێت، بۆیە وتم:
- کوڕی خۆم ئەگەر حیکایەتێکت هەیە، بیگێڕەوە، خوا چارەسازی دەردی هەموومانە.
ئیتر بە شەرمەوە سەری داخست و گێڕایەوە کە:
ئەو شەوە خاتوون ناردی بە شوێنمدا، وتی حیکایەتێکم بۆ گێڕانەوە هەس. لەو حیکایەتەیدا من ناوم فەقێ ناتقی بۆنخۆش بوو، لە شارێکی گەورەی وەک شیراز یان بەغدادا بووم، لەو شارە گەورانەی پڕە لە بنیامی خراپ و چەتە و دز و درۆزن. دەبێت لەو شارە گەورانەدا ئاگات لە داوێنی خۆت بێت دزیت لێ نەکات. من لەو شارەدا فەقێ بووم، لە مزگەوتێکی گەورە و لەناو فەقێیاندا بە بۆنخۆش ناسراو بووم، لە پای تاعەت بۆنێکی خۆشم لێوە دەهات، میسکی تاتاری پێ نەدەگەیشت،

خۆیشم موتەحەیر بووم ئەو بۆنە لە چییەوەیە. یەکێک لە بازرگانە گەورەکانی شار، کە بە دەست و دڵباش ناسراوە، تاقە کچە نازدارەکەی، کە لە جوانیدا کچی شای پەریانی پێناگات، بۆتە چواردە ساڵان و دەیەوێت فێری ئەدەبیات و عیلمی بەیان و بەدیع بێت، بۆ ئەوەش بە عینوان فەقێ ناتقی بۆنخۆش دەدۆزێتەوە. بازرگانە چل شەو چاودێری فەقێ ناتیق دەکات، جا قەرار دەدات بچێتە خزمەتی و پێی بڵێت تا ببێتە مامۆستای کچە نازدارەکەی. بە هەیبەتی بازرگانێکی زەنگینەوە بە کەوا سمۆر و سەڵتەی ئەتڵەس و ئەنگوستیلە زومڕووت و تەپلە ئاوریشمەوە چووە بەردەمی، وتی:

- ئەوە سەد لیرە و وەرە کچەکەم فێری عیلم بکە.

من لەرزیم وتم: قوربان من حەوجەم بە پارە نییە، فەقێیەکی ڕووت و ڕەجاڵم و دەمەوێت لەم مزگەوتە خزمەتدا بکەم،



بەڵام ئەو وتی:
- خوا لێت خۆش نەبێت، ئەگەر دڵم بشکێنێت.
ئیتر منیش لە ترسی خۆفی خودا هەستام و چوومە ماڵی بازرگان و ژووری حوجرەی مەبەست، دەرسم بەو نازدارەی کە لەژێر رووبەندە تەنکەکەیەوە رووی دەتگوت مانگی چواردەیە، دەگوتەوە. بۆنی خۆش لە زوڵفی ئەوە دەهات و لەعلی شیرازی ناو شیعرەکان، لێوی ئەو بوو و خوماری نەرگسی خواجەکان ئەو بوو. بە رۆژ دەرسم بەو دەوتەوە و بە شەو دەستم ئەقلیشاند و خوێم تێ دەکرد تا ختورەی خراپ بە دڵمدا نەیەت.
رۆژ هات و چوو، من لە تاو جوانی نازدارە دەسووتام و دەسازام، نازدار عیلم نەما لە شیعر و کەلام و بەیان فێری نەبێت. حافزی شیرازی و سائیبی تەورێزی و مەولانای رۆمی و تەنانەت شێخ سەعیدی ئەبو خێریشی ئەزبەر کرد. ئیتر هێندەی نەمابوو، دەرسی تەواو بێت، حاجی بازرگانەی حاتەم ئاسا، هاتە لام و وتی:
- قوربان جەنابی مەلا (کە لەبەر رێز وەهای بانگ دەکردم)، من دەبێت بۆ بازرگانی روو لە هیند بکەم، توبی خودا ئاگات لە دۆتەکەم بێت، قەرەواش و غولامان زوڵمی لێ نەکەن.
حاجی بازرگان، رێگای هیندی گرتە بەر و حەوت شەوی پێ نەچوو هەواڵ هات، کە فلان بازرگان لە دووری سەد فەرسەخ لە شارەوە، تەرمی دۆزراوەتەوە. تومەس لەناو قافڵە کورێکی لاوی تازە بازرگانی جێگری بابی، دڵی بە نازداری حاجی بارزگانەوەیە، چەندین جار داوای لێکردووە، بەڵام ئەو نەیداوە پێی، بۆیە بابی دەکوژێت، تا کچەی دەست بکەوێت.
کاتێک من بەمەم زانی دڵم توند و سەرم گەرم بوو، ئاخر من فەقێیەکی بەدبەخت چیم لە دەست دێت، من عاشقیکی نەدار دەتوانم چ بکەم؟ دوای ئەوە بازرگانەی لاو بە حاکمی ویلایەت دەڵێت، تا ئەو کچەی لێ مارە بکات، ئەویش قسە لەگەڵ کچە دەکات، بەڵام کچە دەڵێت:
- فەقێ ناتیقی بۆنخۆش زمانحاڵی بابمە، ئەو قسە دەکات.
بەو شێوەیە من چوومە لای حاکم، عەرزم کرد کە زووە بۆ ئەو، ئەویش وتی:
- جەنابی مەلا، شەرع دەفەرمووێت تا کچ زووتر بە شوو بدرێت، باشترە. ئەو کچە تەمەنی حەڤدە ساڵانە و دەبێت بە کەسێک بدرێت لە شانی باوکی بێت.
منیش وتم:
- ئەو لە شانی باوکی نییە.
حاکم تووڕە بوو وتی:
- ئەی تۆ لە شانی باوکیت، سواڵکەر؟
ئیتر بە دڵی شکاوەوە گەڕامەوە لای نازدار و پێموت. ئەویش گریا و کەوت بەسەر قاچمدا. خوایە بۆ نەتکوشم، قاچم لابرد و سەرم دانەواند لەبەر پێی و تا هێزم تێدا بوو گریام، قوربان من دەبوو نە باوەشی پێدا بکەم، لەبەر ئیمانەکەم. نە بیشیلاوێنمەوە لەبەر ئەمانەتەکە، بۆیە تەختی عەرزەکەم ماچ کرد و رۆیشتم.
ئیتر دوای من تەدارەک و زەماوەند رێ خرا و بووک تەیار و ئامادەبوو، بووکیان کردە پەردەوە، بەڵام بووک بە زاوای کارهەڵپەی نەفامی وتبوو بە شەرتێک شووت پێدەکەم، شەوی یەکەم توخنم نەکەویت، ئەویش وتبووی: شەرتت لەسەر

سەر و لەبان چاو. ئەو شەوە لە دوو پەردەی جیادا دەخەون، مەلابانگان کەنیزەک هەڵدەستێ خانم بۆ نوێژ خەبەر بکاتەوە، دەبینێت خانم کاسەیەک ژەهری خواردۆتەوە و رەق هەڵاتووە. خوایە لەم عەزابەم بمپارێزە بۆ نەمردم، بۆ شێت نەبووم، خوایە لە گوناهم خۆش بە من دەبوو چی بکەم، ئیتر دوای ئەوەی نازدار نێژرا و دەور و تەسلیم کرا، من وەک شێتان ڕووم لە سەحرا دەستم بە تۆبە و ئیستغفار کرد، لە تاو گوناهـ و لە تاو عەشق دەسووتام...

قوربان ئەوە بێ ڕەحمانەترین حکیایەت بوو کە خاتوو شەهرەزاد بەرۆکی منی پێ گرت، ئێستە سێ شەوە نازدار، کە یەکێک لە کچەکانی ناو حەرەمسەرایە، وابزانم ناوی نەزیرەیە دێتە خەوم و خەوی نەشیاو دەبینم. قوربان خەیاڵاتی خراپ لە سەرمایە، حاڵم ناحاڵە. ئەو بەیانییە وتم بە لەشی پیسەوە نابێت بچمە ئەوێ. کە غوسڵیش دەرەکەم، دیسانەوە خەیاڵات دێت و وازم لێ ناهێنێ...

خاتوون ئەوکات ئێمە زانیمان، زوڵمێکتان کردووە بەخشینتان بە تەوبە و ئیستیغفارە. فەقێ ناتیقی پینەدۆزی داماو. لەگەڵ مەلا ئەیاز و مەلا عەباس هەستاین ئەوێمان بەجێ هێشت و دەمودەست چووینە حەرەمسەرا، قسەمان لەگەڵ نەنە خەزێم کرد، کامەیە کچ بە ناوی نەزیرەوە؟ ئەویش نەزیرەی نازدار و شەرمیۆنی بانگ کرد، لێمان پرسی کچم بۆ فەقێ ناتقی پینەدۆزت بخوازین؟ ئەویش سوورهەڵگەڕا و وتی: قوربان؛ نەنە خەزێم دەزانێت. زانیمان دڵی لایەتی و بۆمان مارە کرد. ئەمە بوو حیکایەتی ئەو حیکایەتەی تۆ سازت دا، فەقێ ناتیقی چارەڕەشی چی لێنەکرد.

# شەوی سێیەم

بە ناوی خودای مونتەقیم، کە تۆڵەکەرەوەیە لە خراپەکار و نامەرد. دوو شەوە دەڵێی لەسەر ئاگرم، تا بگەمە لات. بەڵا دوور، دەڵێن حاڵت نا حاڵە، دوور بێت وەکو بیستوومە حیچو لە بیر نەماوە، باسی بەڵای ئەو شەوە دەکەن. من شتێک تا بە چاوی خۆم نەبینم باوەڕ ناکەم، بۆیە سێ شەوە داوا و ڕجائی دنیام لێکردن بێم، وتیان دەبێت بە ویردێک بچیتە ژوورەوە، ناوی خوای گەورە بێت، منیش وتم چی لە مونتەقیم باشترە، کە خۆی تۆڵە دەکاتەوە و سزای هەیە بۆ ئەوانەی ناڕەوا خراپە دەکەن. بۆ نامەردان و خراپەکاران. عەزیزەکەم کەست لە بیر نەبێت، نابێت منت بیرچوو‌بێتەوە، منێک لە زۆرترین حیکایەتی تۆدا هەم، منێک ئیشت پێم دەڕوات. خا زەمانە. خەڵکی بۆکانم، لێ هیچی وەهام بیر نییە لەسەر ئەو شارە بچووکەمان.

حەوت ساڵان بووم لەگەڵ دایکم هاتینە ئەو شوێنەی پێی دەڵێن ئیمارەتی بابان. لەگەڵ دایکێکی هەڕگ وەسەری خێرنەدیتوو دوای ئەوەی باوکم بە نەخۆشیی سیل دەمرێ، ڕوو دەکەینە ئەو باشوورە و لە ماڵ ئاغایەکی دەشتی گەرمیاندا دەبینە کڵفەت. هەڵبەتە من نا عەزیزەکەم، من و دایکم وەکو مانگا و گۆلک. دایەی چارەسیام لەو ماڵ و سەرایە ئیش دەکات و منیش بەردەستی. دایکم لەبەر پارووە نانێک ڕەنج دەبات و خەسەومانوو کارەکات.

من لەوێ گەورە بووم، هەر لەوێش باڵق بووم، بەڵام عەزیزەکەم دنیا هێمن و جوان نییە، دنیا وەک حەقایەتەکانی تۆ ترسناکە، زۆر ترسناک و تاریک، بەشەرێ خۆی تەوێ لێی قوتار بێت، ئەمما من لێی قوتار نەبووم. نایتەوێ دانیشم حەوت ساڵی ماڵی ئاغات بۆ باسکەم، کە خۆت لە نەوعی ئاغا خراپەکان دەناسی ئەوانەی حەوت ژنیان هەیە. ئەوانەی تاقی تەنیا، قەلێک بە یەک ژەم دەقامنەوە و دەستی چەوریان بە سمێڵی بابڕیاندا دێنن و بە عاستەم بەر ورگی خۆیان دەبینن. لەو ئاغایانە بوو، دەی ئێستە چۆتە لای حەق و شەیتان وازی لێهێناوە، با ئێمەیش وازی لێ بێنین.

وازی چی لێ بێنین، هەرچیم بەسەر هات لە دەستی ئەو گەلبۆگەنەوە بوو، ئەو یەکەمجار لە گەورەکە پەلاماری دام و لەناو ئەو شیاکە و پشقلەیا نیشتە سەرم، پەلاماری دام، دەمی گرتم و بەندی شەرواڵی پساند و خۆی تێخستم، وەی عەزیزکەم ڕەبی عەزابی وا قەت نەبینی، ڕەبی بە پاکی بمێنیتەوە و ببی بە حۆریانی بەهەشت، پیاوت لەم دنیا پیسەیا نەوێ... پشت بە خوا ببەستە... شیرینەکەم جا دایکی خۆت بۆو باس کا. ئەو ئێوارەیە نیشتە سەرم و خڵتانی خوێن بووم، وەڵا خڵتانی خوێن بووم و هەستا بەندی شەرواڵەی توند کرد و حەوت دیناری بۆ هەڵدام، وتی لای کەس باسی نەکەی وەگەرنا چاوت بە پەنجە هەڵەکوڵم، دەرچوو. وەڵا ئەو ڕۆیشت و دایکم بەسەرا هات، کە دیمی زانی چ بووە و کەوتە



خۆکوتان و باوکەڕۆ. پەلی گرتم و بردمیە کونە دیوەکەمان لە حەوشە، جلەکانی داکەندم، تورِی دا و بە پەڕۆیەکی تەڕ گشت بەیەنمی سڕی.

ئەو شەوە دایکم بە لامەوە بوو، بە یاو و وڕێنەوە دەگریام، دەمەو بەیان ئەهوەن بوومەوە. کچە جوانەکەم، وەعدم دا تا سێ ڕۆژی تر تۆڵەی خۆم بکەمەوە. ڕۆژی یەکەم و دووەم وا دەجووڵامەوە کە هیچ نەبووە، ڕۆژی سێیەم خۆم لە دەوری گەوڕ دەدا تا سەرنجی ئاغا ڕاکێشم. وەڵا ئاغام ئاغا بێت حەجمانی لەبەر بڕا، هاتە ناو گەوڕ و نزیکم کەوت.

منیش خۆم بۆ شل کرد، تا خۆی بەسەرما دا ئەوسا خەنجەری بەر ورگی خۆی کە لە ژوور هەڵم گرتبوو چەقاندمە بەر ورگی و ورگی هەڵدڕا. خوا خۆی تۆڵە لە پیاوخراپ و شەروالپیس بکاتەوە. ئاغا بەسەرما شل بوو، من زارەترەک بووم، تا هێزم تیابوو ڕامکرد، ڕامکرد و نەمدەوێرا لاکەمۆ بۆ دواوۆ. هەرەوەنەم هەڕاکرد تا گەیشتمە ناوبێستان و ڕەزەکانی دەرەوەی ئاوەدانی، ئەودەم لەناو یەک لە بێستانەکان لامدا و پاڵم بە دارێکەوە دایەوە، خەوچووە چاوم و نەچوو، کاتێکم زانی یەکێک دەست بەسەرما دێنێت. وەڵا عەزیزەکەم ئەگەر دەپرسی کێ بوو؟ دەڵێم خۆ فریشتەی خوایی، ئەسحابان، پیران نەبوو ئەستەغفیرەڵا، ناوگەڵبۆگەنێکی تر بوو، خوایە لێم نەگری. خوایە بە خراپە لەسەرم نەنووسی، جەزای خۆت و ئینتیقامی خۆتیان لێ وەرگرە. کابرایەکی شرۆڵی پیس بوو، کە چاوم کرد ڕەنجبەری ئاغایە، ئەی خوایە چ بکەم دارێکم بە دەستۆیە هەردوو سەری بیلامانێ هینە. دەڕۆم وا نەختێکی تر شەوە و نازانم چیم لێ یەت، ناڕۆم تا قەیرێکی تر دەزانێ چی بووە. ئەمدا بە دەستۆ و ئەتکم دەکەن و دەمدەن لە دار. وەڵا جا بۆ کیژی خۆمی باسکەم. منیش قنج بوومەوە و وتم: لالە مارف گیان ئاغاژن ناردوومی پێت بڵێم ئیشێکم پێیەتی، بە پەلە بگاتە ماڵمان، وەڵا وام وت خۆی گورجۆکردۆ و وتی: با بە یەکەوە بڕۆین، منیش وتم: تۆ بڕۆ من دەبێت دوو ڕاسپاردەی تر هەیە بیگەیەنم. وەڵا ئەو ڕۆیشت و منیش بەو پاییزە درەنگوەختە، نەختێک ترێم ڕنی و توێشەبەرەیەکم بۆ خۆم کۆکردەوە و ڕۆیشم.

زۆر ڕۆیشتم و کەم گەیشتم. تا گەیشتمە ماڵە مەلایەک لە ئاواییەکی دوور، مەلاژن خۆت ئاسا ژنێ بوو وێنەی نەبوو، ئۆهـ ئەگەر ماوە خوا دەست وەباڵایۆ بگرێ و ئەگەر نەماوە خوا گۆڕی پڕ نووران بکات. ئەو مەلاژنە تا ماوم دوعای خێری بۆ دەکەم، داڵدەی دام و تا چل شەو هیچی لێ نەپرسیم. وتی ئیسراحت کە. دنیادیدە بوو، دوای چل شەوە وتی: هەرچیت بەسەرهاتووە گوێی مەیەرێ خوا خۆی چارەسازە. ئەوکات ماجەرای خۆمم بۆ باسکرد، وەڵا شێرانە وتی: کچی منیت و وابزانە لە داوێنی خۆم بەربوویتەوە، ئاوها مەلاژن داڵدەی دام. بەڵام هەموو شت وا باش بەڕێوە نەدەچوو، مەلا، مەلاژنی ڕاسپارد، پێم بڵێت: لەبەر ئەوەی ئافرەتی با تووشی گوناح نەبیت، ئەشێ لە یەکێکت مارەت کەین، بۆ ئەوەش حاجی مەنزوریان دانابوو، کە پیرەمێردێکی ئیختیاری گوێ کپ بوو. ئای بە ڕەحمەت بێت، دە ساڵ لای بووم، خوا بیبەخشێ، ئیختیار بوو، لەسەرجێ هیچی بۆ نەدەکرا، وەک باوکم وەها بوو، شەوان لە باخەڵی دەخەوتم و نیوەشەوان هەڵدەستا بۆ شەونوێژ. بە ڕەحمەت بێت مرد. ئێستە ئەمان لە شوێنی هەقن و ئێمە ناهەق. من دوای مەرگی حاجی مەنزور، ڕۆژێک زانیم لەم مەملەکەتەم، کەس نەیزانی چۆن و بۆچی، بەڵام دەمزانی ئاشنام، ئەم شارە بە من غەریب نییە و هەموو شت لە شوێنی خۆیەتی.

وەها بوو حیکایەتی من، حیکایەتی زەمان. کە هاتمە ئەم شارە وتیان: ناوت چییە؟ وتم خاتوو زەمان، کورتیان کردەوە بە خا زەمان بانگیان کردم. خراپەم بۆ کەس نییە، دایکی دایکم، شوکور بۆ خوا یەک کەس لەم شارەیا گازندەی لێم نییە. ئەوە بۆ تۆیش دەوری خۆم دەبینم. قەدەری من ئەوەیە بەدبەخت بم، بۆیە ڕازیم بە کلۆڵی خۆم، گلەم لە کەس نییە، بەختی خۆم وەهایە، پێشینیان فەرموویانە:

بەختێ لە ئەزەل سیاچارەبێ

دەستێ لێ مەیە با ئاوارە بێ

خوا خۆی لە ئەوەڵەوە من و دایکە خێرنەدیوەکەمی وەها دروستکرد، ئیتر بۆ گلە لە کەس کەم. لە ئەزەلەوە لە چارەی

من نووسراوه سیاچاره و خێرنەدیو بم. بۆ لە تۆ وایە حەساومەتەوە؟ نەوەڵا بێ کەس و بێ کار، تاق و تەنیا دێم و دەچم. بۆ دەبێت ئەوانی تر بە چییەوە خۆیان بابدەن وابزانن هیی خۆیانە؟ نا عەزیزەکەم ئەوەی هەیانە خوا خۆی پێی داون، وەک چۆن تۆ لە حیکایەتدا قەدەری منت دیاری کردووە و من ناتوانم لێی لابەم. گلەم لە تۆ نییە گلەم لە کەس نییە، خۆم دەردەدار و بێ کەس و کارم.

لە حەکایەتەکاندا بە پیرەژنەی خراپ و بەدکار دەناسرێم، شتێک زیاتر لە خۆمم پیر دەکەن و دەموچاوێکی ناشرینم پێدەبەخشن. بۆ لە تۆ وایە من پێم ناخۆش نییە خراپە دەدەنە پاڵم؟ بەرێ وەڵا کچە شیرینەکەم. وا دەزانی کە دەمبەیت بۆ حیکایەتێک ئەو خەڵکە خۆشیان لە من دێت؟ وادەزانی من بنیام نیم و خەفەت ناخۆم؟ کچە شیرینەکەم کەس لە ئەوەڵەوە خراپ نییە، ئەو خەڵکەی دەوروبەری خراپی دەکەن، زەمانە خراپی دەکات.

کچە نازدارەکەم گوێی مەیەرێ، دەبێت من ئەم شەو حیکایەتت بۆ بکەم تا ئەو شوومییە بەرت بات و خوا دەرووت لێ بکاتەوە، حیکایەتی زۆر شتت بۆ باس بکەم و حیکایەتەکانی خۆتت بیر بخەمە، بەس توخوا سەبر شتێکم بیرکەوتەوە، بیری حەکایەتی لەیلی و شیرینم کەوتەوە، وابزانم شەوی یەکەم ئەوان هاتن بۆ لات، موتمەینم حیکایەتی لەیلی و شیرینیان بۆ گێڕایتەوە، چونکە من لەو حیکایەتەدا بووم. دەزانم کچیەلی باشن و بە خراپ باسی منیان نەکردووە. ئەو جارەی منت بۆ ناو ئەو حیکایەتە بانگ کرد، لە حیکایەتخانە بووین، کە دیمیان دەستم کردە ملیان و وتم کچە جوانەکانم خوا شاهیدە خراپەی ئێوەم نەگەرەک، بەس بۆ جوانکردنی حیکایەتی خانم ئەوێ من خراپ بم. ئیتر جاری وا هەیە بە خراپبوونی من حیکایەتێک دەبێت بە شاحیکایەت. هەمیشە شاکارەکان کەسانی باش و خێرەومەند و شێخان و سوڵتانان نایکەن. جەرگبڕترین حیکایەتەکان ئەوانەن، کە منت بۆ بردووە. هەر وایە لەم ڕۆژهەڵاتەیدا... ئەو جارە من پیرەژنە بەوەکە بووم، یەکێکیانم کردبوو بە سۆزانی و ئەوی تر بە بەرگدروو، ئەوان لە جەبری زەماندا بوون، منیش سەرپەشتیان. ئیتر وایە عەزیزەکەم. وا دەزانی من خراپەی ئەوانم گەرەک، ئەو دوو کچە لە پەڕەی گوڵ نازکترن. لە دیدەی خۆمم خۆشتر ئەوێن، کێ هەیە لەیلی و شیرینی خۆشنەوێت.

لە هەموو حیکایەتێکدا بە پیرەژنەی فەرهادکوژە و پیرەژنەی سەرئاسنینە ناسراوم، خراپترین دەورەکان بە من دەدەیت، بۆچی؟ مەعلومە عەزیزەکەم چونکە بێ دڵیت ناکەم، خوا بە شاهێد ئەگەرم لەم مەملەکەتەیا خراپەم بۆ کەس نییە، کەچی زۆربەی جار کوران ئامۆجیاری کچەی دۆستیان دەکەن، لێم نزک نەکەون، نەکا سەریان بە قەڵبەیەکدا بەرم. من خراپەم بۆ کەس نەبووە. خوا شاهێدە جارێک ئاغایەک ڕای سپاردم، یەکێک لە کەنیزەکانی حەرمسەرای بۆ ڕازی کەم، ناو ناهێم، بەڵام نەکرد، کچە شیرینەکەم پارەی دنیا هیچ نییە، من بۆ خۆم تووشی خراپە بکەم، من نیهادپیس نیم، بەشەر کە خوو و خدەی پیس بوو هەموو شت دەکات، خوا سەیری دڵ دەکات، من چیم تەوێ لەوە زیاتر دەخۆم و دەخۆمەوە و دێم و دەچم و لە هەمووان زیاتر حیکایەتم بەردەکەوێ، ئیتر چیم تەوێ. بەڵام ئێمەی پیرەژنان بە خراپە و فریودەر ناسراوین. لە کۆنترین حیکایەتەکاندا بێ ئەوەی ناومان هەبێت، خراپە دەخەنە پاڵمان، مەگەر لە هەقایەتەکەی یوسف پێغەمبەردا، ئەو یوسفە پاکە، پیرەژنەکە نایەت یوسف فریو بات؟ و حەوت دەرگای لەسەر قایم دەکات تا زلێخای پێ بگات؟ مەگەر لە هەقایەتە سەیروسەمەرەکەی جودا ئەکبەردا پیرەژنەی دایەنی کەنتێک ناکات ئەو دڵە لێک بکات؟ مەگەر لە هەقایەتی شیرین و فەرهاددا پیرەژنە نییە بە درۆ دەڵێت شیرین مرد، فەرهادیش تا هێزی تیایە بە تێشەکەی دوو کەرتی دەکات

ئەوسا بەرەو حەوا تەورە هەڵدەدات و خۆی ئەخاتە بەری بۆ ئەوەی دوای شیرین نەمێنێ؟ ها مەگەر وانییە؟ حیکایەت نییە باسی دوودڵ بکات و پیرەژنەی تێدا نەبێت بۆ لێککردن، بۆ زەفەربردن بە کچانی شیرین و نازەنینانی سەرزمین. لە هەموو هەقایەتەکانی هەزار و یەک شەوە و گوێ ئاگردان و ئێرانی و هیندستان و ئەوانی بەغدایا، پیرەژن کۆتاییەکی هەڵتڵیشان و لە ئاگرنانە، لە داردان، سەرپەڕاندن، لە خەرندهەڵدانە، کەچی بیرم نایەت لە حیکایەتی تۆدا من کوژرابم... لە حەقایەتی تۆیا براوە منم. لە هەقایەتی تۆدا من خراپم، بەڵام لەوانەیە لە خراپەم ژێوان بمەوە، لەوانە وەک جنۆکان گوم بم، یانیش تۆبەی نسوح بکەم. عەزیزەکەم خوا تۆ ببەخشیت بۆ بە ڕەحمت، بەدکار و ناحەزیش وەک بەرگی خەزان هەڵوەرێنێ.

# شەوی چوارەم

بە ناوی خودای پارێزەر، کە خۆی بەندەکانی دەپارێزێت و پەنایان دەدات، بە ناوی ئەو کە خۆم و گۆزەکانم دەپارێزێت. هەواڵی ناساغیتم بیست و ڕایان سپاردم ئەمشەو بەسەرهاتت بۆ بگێرمەوە، بەڵکە ئەمە خودایە شتانێکت بیر بکەوێتەوە. شتانێک، دەبێت لە بیرت بێت و فەرامۆشی زەفەریان پێ نەبات. من گۆزەیەکی کەمەرباریک و ساغەرێکم بۆت هێناوە، تا ئاوی پاک و زوڵاڵی تێدا بخۆیتەوە. خانم وەک باسی دەکەن ڕەنگە لە بیرت نەبێت، یان من بەیاد نەهێنیتەوە، من موشتاقولیقای گۆزەگەرم لە قەلەندەرئابادەکەت. دوکانەکەم لە گەڕەکی خەراباتە و سێ کوچە پشت مەیخانەکەی سلێوە عیسایە، کارم بە کەسەوە نییە، شەو و ڕۆژ سەرقاڵی کاری خۆمم. وەک چۆن تۆ خەریکی کاری خۆتی، وەک چۆن خودا خەریکی کاری خۆیەتی. بە کفری مەزانە، ئێمە خەریکی کاری خەلقکردنین، من گۆزە، تۆ من، خودا تۆ... نازانم لە کەیەوە لەم قەلەندەرئابادەی تۆم، بەڵام حیکایەتی خۆمم هەیە، کە وا ئێستە پێم دەڵێن تۆ لەناو خەڵقی ئەو دایت شتێک نییە ناوی حیکایەتی خۆت بێت، تۆ تەنها کەلیمەیت. خۆ ئەگەر کەلیمەش بم، من ژیانی خۆمم هەیە. خەڵکی شارەکەی تۆ نیم، لە ئۆزبەکستانەوە کەوتوومەتە ویلایەتەکەت تا حیکایەتێکی کوردی بگێڕیتەوە، ئەگەرچی حیکایەتی ڕۆژهەڵاتی کورد و عەرەب و ئەفغان و تورک و فارسی بۆ نییە. من بابایەکی گۆزەگەری لەت لەتی نێوان کوفر و ئیمانم، ساڵانێکی زۆر لەمەوبەر لە شاری بوخاراوە گەیشتمە ئێرە. وەختی خۆی لە گەنجیدا یەکێک بووم لە موریدانی ڕێبازەکەی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی و لە مەجلیسی شێخە ئەدیب و سۆفییە حیکمەتناسەکاندا گوێگری ئەڵقەلەگوێی حیکمەت بووم، سەرسامی من لە نێوان گومان و مەیلدا بۆ چیرۆکی مەولانای ڕۆمی و شەمسی تەورێزی وەهای لێکردم کە قووڵ و قووڵتر بیمەوە لەناو بیر و بە دەم وتنەوەی مەسنەوییەوە بخولێمەوە و (شەمسی من و خودای من) بڵێمەوە. جەوان بووم جارێک، چوومە خزمەت شێخم و پێموت:

- قوربان؛ شێخی مەزن! بۆ من ناتوانم بگەم بە نووری ئیلاهی و تا ئێستا جگە لە ئیماندارێک هیچی تر نیم؟

شێخ بزەیەکی بۆ کردم و قسەیەکی شێخی جامی بۆ وتمەوە، کە دەڵێت:

- پیاوی سۆفی ئەگەر عیشقی مەجازی نەچەشتبێت، وەک گایەکی مێزەربەسەر وەهایە.

ئەوکات جحێڵ بووم لە قسەکەی شێخ دڵگیربووم، دڵم لەو مەسەلە تەشەرئامێزە شکا، بەڵام دەبوو لە بیری کەم... ڕۆژ هات و ڕۆژ ڕۆی، پاش ساڵێک لە یەکێک لە ئێوارە خەمگینەکانی ڕۆژێکی پێنج شەممەدا، جەوانێکی شەرمن، بە کڵاوێکی لبادی قوچەک و دەستێک جلی سپی کە سەڵتەیەک و کراسێکی شۆڕی چیندارە، بە کۆڵانە باریکەکانی شاردا تێدەپەڕیم

تا لە کۆڕی موریدان بەشداری مەراسیمی شەوی هەینی بکەم. هەر ئەو ئێوارەیە لە کوچە تەنگەکەی پشت خانەقاوە چاوم بە کچی مەیفرۆشی گەڕەکەکە کەوت. وەستابوو بە جووتێ چاوی خومارەوە تەماشای ڕۆیشتنی منی دەکرد، منیش لە حەژمەتا لە یەکێک لە گۆزە گەورەکان هەڵکەوتم و خستم. شەهرەزاد خانم؛ منی بەدبەختی سۆفی لەبەردەم کچ و شەرابدا چی بکەم باشە؟ لە تاو بۆنی شەراب و تەپەی دڵم و ئەو نیگا جانخەراشانەی کچەی تەرسادا، بە پرتاو هەڵاتم و خۆم بە خانەقادا کرد، لەوێ حاڵ گرتمی و تا درەنگان بە دەم سەماوە شیعری مەولانام دەوتەوە، هۆشم بە خۆم نەمابوو. بەری بەیان، بەر لەوەی کەس فریای پرسیاری ئەو حاڵەم بکەوێت، دەستە جلەکەم لەناو بوخچەیەکی گوڵنەداری نەخش قولاپیدا لە خانەقا دانا و قەرارم دا، بوخارای شاری سحر و عەشق و ئیمان جێ بێڵم، تا عەشقەکەم لە مەجازییەوە بە حەقیقی نەگات و ڕوو بکەمە مەملەکەتێکی دوور دوور. پاش گەڕانێکی زۆر گەیشمە کاشان و لەوێ لە بەردەست وەستایەکدا دەستم دایە گۆزەگەری. ڕۆژێک عەشقی کچەی مەیفرۆش بە هۆی گۆزەیەکی مل بەرزەوە کە خەریکی خولقاندنی بووم، کڵپەی لە دڵم هەستاند و ڕووم کردە کێوان، دەمناڵاند و دەسووتام. کاتێکم زانی بە دەم ڕۆیشتنەوە، لێرەم لەم مەملەکەتە، لەبەر دوکانێکی دەرگا شینی بچووکدا، کە بە دوو پلە بۆ خوارەوە دەگەیت بە جیهانە سەیرەکەی گۆزە و خۆڵ و لەوێشەوە دەڕوانێت بەسەر حەوشەیەکی پڕ لە خۆڵ و باخێکی جەننەت ئاسای هەژارانەدا. ئیتر من لەوێ دەستم کردەوە بە کاری گۆزەگەری، دەمویست نیگاری ئەو کچە و عەشقەکەی لە گۆزە کەمەر باریکەکاندا بەرجەستە بکەمەوە، ئەو گۆزانەی کە یان وەک ئیمانەکەی ئەوسای خۆم پڕن لە ئاوی زوڵاڵ، وەیان وەک کوفرەکەی یاری تەرسا مەزەبم، پڕن لە شەرابی خوێنی عوشاق...

دوکانەکەم هەمیشە پڕە لە بۆنی خۆڵ و حیکایەت، جگە لە گۆزە و دیزە، جامۆلکە و مەرکانە و کاسە، زۆر کەرەسەی تر دروست دەکەم... وەهایە حیکایەتی من، کە ئێستە دەڵێن تۆ بوونت نییە و لەناو حیکایەتی ئەودایت. بیرم بێت چەندین جار هاتوومەتە حیکایەتت، هەندێک جار گۆزەگەرێکی پیربووم، بازێ جاریش بووم بە پاسەوان یان غەریبی ناو کوچە و کۆلانان، یانیش موریدێکی هەڵگەڕاوە. جارجار لێرە لە گۆزەخانەکەمدا لەگەڵ مەلا نجومی دەربەند فەقەرە و دوڕ محەمەدی کتێبدار و میرزا ئادەمی حیکایەتخوان کۆ دەبینەوە و باسی زەمانە دەکەین. هەموویان دوکانە پڕ لە گۆزە و ماڵە بچووکەکەمیان خۆشدەوێت. ئێواران بە دەم حیکایەتی ئەم چەرخە بەدڕەفتارەوە چایی دەخۆینەوە و هەندێ شەوانیش لەگەڵ ساقی شەراب نۆش دەکەین. من خۆشم لەو پیاوە عاقڵ و مێرخاسانەی ناو قەلەندەرخانەکەت دێت. بەشەر لەگەڵیان هەست بە دڵتەنگی و ناکامی ناکات، وا هەستەکەم لە مناڵیدا لەو کوچە باریکانەی بوخارا لای مەزاری ئیمام، گەمەم لەگەڵ کردوون، ئەمانە بە من غەریب نین.

لەو کاتەوەی لە بوخارا هاتوومەتە دەر، هەرگیز یادی ئەو کچە چاوخومارەم لە کەللە دەرنەچووە، چاوخومارانی زۆرم دی، بەڵام کەسیان نە سەرنجیان ڕاکێشام نە چوونە دڵمەوە. زۆرجاران مەلا نجووم دەستێک دەنێتە سەرشانم و دەڵێت:

- تاکەی موشتاقی لیقا دەبێت و لیقات ناوێ؟

منیش دەڵێم:

- با دەمەوێت، بەڵام هیی دوڵبەر!

ئیتر ئەویش پێم دەڵێت:

- ئەم شارە پڕە لە ئافرەتی باش و ڕێکوپێک، کێت گەرەک بێت خۆم دەچمە داوای و لێت مارە دەکەم!
دەڵێم:
- مەلا نجوم نازانی دەردی دڵ چییە، مەرامی من ژنهێنان و نەهێنان نییە، من یەک کەسم دەوێت، کە ئیتر ڕەنگە نەشمەوێت، دەمەوێت چونکە ئەو مەحبوبەی منە و موشتاقی ئەوم، نامەوێ لەبەر ئەوەی دەترسم ئەگەر پێی بگەم عەشقیم لە دڵ دەرچێ.
خانم ئەو کافربەچەیە منی سووتاند و لە دین و دنیای کردم. بۆ من نەمدەتوانی لەوێ بمێنمەوە، ئەوسا یان دەبوو بڵێم لەسەر کام دینی بێمە سەر دینت، کە ئەوە بە من نە دەکرا، یان دەبوو لەوێ لە خانەقا گەنجی خۆم ئەوەندە بسووتێم و کوڵی دڵم بخۆمەوە تا تەواو لە عەشقی ئەوەوە بە خودا بگەم، ئەوم لە بیر بچێت، کە ئەمە بۆ منی نەوجەوان تەواو جەرگبڕینی یەکسەری بوو. من وەک شاعیرە کوردەکەی ئێوەم پێ ناکرێت، مەبەستم لە شێخی جزیرییە. ئەو شاعیرەی عەشقی نەفسانی گەیاندییە عەشقی خودایی، حیکایەتەکەی وەهایە دەگێڕنەوە:
شێخ ئەو وەخت هێشتا جەوانە و تازە مەلایە، تەواو دوانزە عیلمی مەلایەتی دەزانێت و خەریکی غەزەلنووسین و تەرجیعبەند دانانە و دەیەوێت شیعرەکانی پێبگەن، هەر خەرکی نووسینە و هێشتایش بە دڵی نییە، تا ئەوەی ڕۆژێک بە ڕێکەوت شازادەی ئەوینی دەدۆزێتەوە کە تیری لە دڵ دەدات و دەیخات. دەڵێن هەفتەیەک لە جێدا دەکەوێت و مورید و فەقێ و سوختە دەورەی دەدەن، کاتێک مەلا شێخی گەورە تەماشای دەکات، دەڵێت:
- وازی لێبێنن دڵی پێکراوە، چارەی سووتانە!
موریدان و فەقێ و سوختان بەو قسە موچڕکیان پێدا دێت و سوبحانەڵا دەکەن و بڵاوەی لێ دەکەن. شێخی جزیری، کە هێشتا تەنها لاوێک زیاتر نییە، ناو و ناوبانگی زیرەکی لە شەرعدا بەناو جزیرەی بۆتاندا بڵاوبۆتەوە، ئێستە بە دەم لەرزی ئەوینەوە دەناڵێت و دەست دەکات بە هۆنینەوەی غەزەلەکانی بۆ ئەو خانمە غەمزەکەرەی دڵی برد. ئیتر شێخ کاروباری دەبێتە نووسینی غەزەل بە باڵای زوڵف عەنبەرینی خاڵ سیادا. تا نەختێک وەخۆدا دێ، هەواڵی جوانێ دەپرسێ، ئەوانیش دەڵێن قورت بە ماڵ، ئەوە خوشکی میری جزیرەیە و خۆتی لە قەرە مەدە، شێخ کڵپە دەگرێت، داوای تەکبیر لە دۆستان و هاوەڵانی موریدی دەکات، ئەوانیش دەڵێن: چ دەبێ با بێ جارێ بنێرە خوازبێنی، بزانین چ دەڵێن. ئەویش ڕادەسپێرێت و دەنێرێت، وەختێک میر ئەوە دەبیستێت تووڕە دەبێت، دەڵێت وەڵا هەر لەوەمان کەم بوو، فەقێ و سوختە داوای کچانی میر بکەن، بڵێ ئەمجارە دەیبەخشین بە مەلا شێخی گەورە، دووبارەی بکەنەوە جەنابی ئێمە لە ملیان دەدات.
وەختێک شێخی جزیری ئەوە دەبیستێت یەخەی خۆی دادەڕێ وەک ڕەخشی ڕۆستەم بەرەو کێوان هەڕا دەکا، دەناڵێ و ئەلالێ... چل ڕۆژ لە دەشتان دەبێت، دوای چل ڕۆژ مەلا شێخی مەزن حەوت لە موریدە کامڵەکانی دەنێرێت بە شوێنی دا، دەڵێت: پێی بڵێن: سلوکی عەشق سووک نەکات، وەک هەرزەکارێک خۆی نەنوێنێ، کە عەشق و شەهوەتی تێکەڵ کردووە! کاتێک وەهای پێدەڵێن دێتەوە و لە ماڵ ئۆقرە دەگرێت، بە شەو عیبادەت دەکات بە ڕۆژیش دەچێتە گۆڕستانێکی لاپاڵ شار و پاڵ بە گۆڕێکەوە دەداتەوە و غەزەل دەنووسێت. دەگێڕنەوە، هەمیشە کە دەڕۆیشت، لە دوورەوە ماڵی پیرەژنێک هەبوو، پیرەژنە چاودێری دەکرد، کە شێخ دەهاتە ئەوێ، ئەو یەک مشت ئاردی دەکرد بە هەویر و دای دەنا، هەر کە شێخ لە غەزەل دەبووەوە و دەڕۆی، پیرەژنە هەویرەکەی دەنا بە کێلی گۆڕەکە و دەبرژا و دەیخوارد، دەیوت



موبارەکە ئەم کێلە، بە عەشقی ئەو شێخە گەرم بووە. شێخی جزیری لە تاو عەشق ڕۆژ بە ڕۆژ ونبوویەک لەناو خۆیدا دەدۆزێتەوە، ئەو ون بووە وەک نوور لە سیمایدا دەردەکەوێت و لە ناخیدا بڵاو دەبێتەو و دەیکات بە خاوەن کەشف و کەرامات. ئیدی ناوی بە جزیرەدا بڵاو دەبێتەوە و میوانان، کە دێنە لای میر لە شارانی دەوروبەرەوە دەڵێن قوربان ڕاستە لە مەملەکەتی ئێوە شێخێکی لێیە لە عاست شێخی ڕۆمی شیرازیدا؟ ئەویش تەماشای وەزیر دەکات، کە هێشتا نازانێت شتی وا هەیە یان نا، وەزیر دەڵێت:

- بەڵێ قوربان ئەوە شێخی جزیرییە.

ئیتر ئەوکات میر دێتەوە یادی، ئەمە هەرئەو پیاوە بوو کە خوشکی خۆی پێ نەدا. پاش ڕۆیشتنی میوانان جواب دەنێرێت بە شێخی جزیری بڵێن، بێت خوشکمی پێ بدەم کە بێ لەو کێ هەیە هاوشانی میران بێت.
شێخ شیعرێک دەڵێت:
عاشق ئەوە دلبەر ئەوە، زاهیر ئەوە مەزهەر ئەوە
ڕوح و بەدەن، گەوهەر ئەوە، دهەر شاهدەک دوڕدانەدا
ئەودەم دەفەرموویت ئەوە زوو بوو، من ئێستە ئەو عەشقە گەیاندوومی بە عەشقی خودایی، کەست دیتووە ڕازی بێت لە ئاسمانەوە بیهێننەوە ناو قوڕاوی زەوی؟ شێخ وەها لە زەوییەوە بەرەو ئاسمان دەچێت. بەڵام من نەمدەویست حیکایەتم وەهابێت، نە شێخی جزیری بووم، نە زاهیدی خەڵوەسووت، موریدێک بووم ئەودەمەی دەمویست بە شەرابی مەجازی عارفان بگەمە مەستی، نەگەیشتم، کاتێکیش گیرۆیەی عەشقی جوانێ بووم، لە ترسی دینەکەم نەمتوانی بە شەرابی حەقیقیش مەست بم، ئێستا جارجار لە هەردوو شەرابەکە نۆش دەکەم.
ساڵانێک لەناو کوفر و ئیماندابووم، ڕۆژێک بارگەم لای کوفر، ڕۆژێک لای ئیمان بوو. ئێستا تێگەیشتووم هەردووکیان لە یەک لانکەدا جێگەیان دەبێتەوە، ئەوەش کاتێکە من تەواو مەست دەبم... خانم ئەگەر دەڵێت چۆن مەستێک؟ من دەڵێم چ مەستی عاریفان چ هیی زەندیقان، جیاوازییەکیان لە نیواندا نییە. کاتێک بۆم دەرکەوت، من حەوت ساڵان لە کۆڕی موریدان دوور بووم، نە دەچووم تا نەک بگەمە عەشقی خودایی و یاری چاونەرگزم بیر بچێتەوە، کە وا تەمەنم بوو بە چل ساڵ هێشتایش کەم شەو خەونی پێوە نەبینم. بەڵام جارێک لە حیکایەتێکی تۆدا بوومە مورید، ئیتر شەوقی تەکیە دای لە دڵم و جاروجار دەچمە تەکیەی شێخ.
عەسرێکی هاوین ئەو کاتانەی مرۆڤ دڵی تەنگە و پێ نازانێ بۆ، لەبەر ئەوەی زیاد لە پێویست ڕۆژ درێژبۆتەوە، یان لەبەر ئەوەی دەزانێت تەنانەت ڕووناکیی ڕۆژیش جاویدان نییە، دڵی تەنگە، نازانێ لەبەر چ شتانێک... وەها ڕۆژێک بوو سەرمەدی قاسیدت بە شوێنمدا نارد عەلەل عەجەل بچمە حیکایەتخانە، منیش پێم خۆش بوو، هیچ نەبێت شتێک ئەو دڵتەنگییە کپەم بیر باتەوە، کە هۆکەی نازانم. ئەو حیکایەتەی منی تێیدا وەزیر بووم، وەهابوو:
ڕۆژێک لە شام یان لە شیراز، موهیم نییە چ شوێنێک یان قەڵایەک بووە، وەزیرێک دەبێت زەنگین و فرەدەوڵەمەند لافی شاهان لێدەدات، کاتێک شاهی مەملەکەت چووە بۆ حەج، ڕۆژێک بانگ هەڵدێرێت دەچێیە ڕاو، بەو شێوەی لە ماوەی حەوت ڕۆژی مانەوەیدا، حەوت ئاسک و حەفتا پۆڕ و کەو ڕاو بکات، کە هاتەوە دەبێت شار لە پێشوازیدا بوەستن و بارەکەڵای بکەن. حیکایەت وایە وەزیری کەوا سمۆر و کەوش چەرمی یەمەنی و سەڵتە ئەتڵەسی هیندی، لەتەک حەفتا دەست و پێوەند و نۆکەر و کەنیز و غوڵامان دەچێتە ڕاو. بە قەولی خۆی لەبەر شۆڕەسواری و نیشانەپێکییەکەی کە دڵی مێروولەش دەپێکێ، حەوت مامز و حەفتا کەو و پۆڕ ڕاو دەکات و بە کەژاوە و بارگەوبنەوە، دەگەڕێتەوە شار. وەختێک لە پێشوازیدا خەڵکیان کۆکردۆتەوە تا بەرەکەڵڵا و نامەخوا بۆ دەستڕاستی و گوڕ و هێزەکەی بکەن. دەبینێت لە نێوان ئەو خەڵکەی بە بەردەمیاندا دەڕوات کابرایەکی بەرگ شڕۆڵ وەستاوە نە چەپڵە لێدەدا نە بانگ دەدا و نە ئیکلام دەکێشێ، بە خۆی و عەسایەکەوە وەستاوە و زەق زەق تەماشای چاوی وەزیر دەکات، وەزیر ئەمە بە سووکایەتی دادەنێت، و کە دەگاتە بەردەمی دەڵێت:

- بۆ ستایشی وەزیرتان ناکەیت؟
ئەویش دەڵێت:
- بۆ چت کردووە؟
وەزیر تووڕەیی خۆی دەخواتەوە دەڵێت: ڕاومان کردووە.
پیرەی شرۆڵ دەڵێت:
- منیش ڕاو دەکەم.
وەزیر دەڵێت:
- ڕاوی چی؟
پیرەپیاو دەڵێت:
- ڕاوی ڕاوکەر!
وەزیر ڕەنگی تێکدەچێت، نۆکەران و میرغەزەب دەڵێن: قوربان ڕێگەمان بدە لە ملی بەین. وەزیریش دەڵێت: نا سەری بە خۆی دەبەخشم، ئەمە شێت و پەتیارەیە، قسەی لێ ناگیرێت.
کابرای پیر دەڵێت:
- سبەی دەردەکەوێ کێ پەتیارەیە!
حیکایەت باس دەکات، کابرای وەزیر ئێوارە لە گۆشتی مامزان دەخوات و دەخەوێت، نیوەشەو بە دەم قیژەوە ڕادەپەڕێت. تومەز خەو دەبینێت دانیشووە گۆشتی کچان و کوڕانی خۆی دەخوات، پڕ بە کۆشک هاوار دەکات، نۆکەران و پاسەوانان و کەنیز و غولامان کۆ دەبنەوە، وەزیر ناڵەی بەرزتر دەبێت و کراسی بەری خۆی دەدڕێنێت، دەست بە قوڕگیدا دەکات تا چی خواردووە هەڵیبێنێتەوە. بەو نیوەشەوە حەکیمباشی بۆ دەهێنن، بەڵام نایەڵێت دەرمانی بکات، دەقیڕێنێت و دەگری بە سینگیدا دەکێشێت، وڕێنە و قسەی بێ مانا دەکات و دەمی کەف دەکات. ئەو شەوە تا سێ شەوی تریش ئەوە حاڵی کۆشک دەبێت، وەزیر دەیەوێت بڕشێتەوە، ناوێرێت تەنانەت قومێک ئاویش لە زار نێت، ڕۆژی سێیەم کە وەزیر زەوای نەچۆتە دەم وەختە گیان بسپێرێت، یەکێک لە غولامانی وەزیر، ناسراوە بە نوێژجوان و ئیماندار دەچێتە کن وەزیر و دەڵێت:
- قوربان؛ من عەرزت کەم، دەرمانی تۆ لای کێیە؟
ئەویش قسەی سووک و ناشرین دەڵێت و فەرمان دەدات لە سەری بەن، کە وەها بە نەخۆشی دەزانن، غولامە دەڵێت:
- قوربان هەر لە سەرم دەدەی، با قسەکەم بکەم، چاری تۆ لای شێخی منە، کە ناسراوە بە شێخەی نیەتپاک.
ئەویش دەڵێت:
- ئەم شێخە لە کوێیە بیهێنن، ئەگەر ئەم غولامە ڕاست بکات دە کیسە لیرەی بدەنێ، ئەگەریش درۆی کرد لە سەرا لە داری بدەن. ڕوو لە پیاوی خۆی دەکات و دەڵێت:
- ئەو شێخە کێیە ئێوە دەیناسن؟
پیاوی دڵسۆز و ژیری دەڵێت:

- بەڵێ قوربان شێخێکە و چل مورید و هەزار شوێنکەوتووی هەن، بەرد دەکات بە ئاو و جنۆکان دەکاتە غوڵام.
شێخ دەڵێت:
- کێیە؟
ئەویش دەڵێت:
- قوربان ئەو پیاوەی ئەو ڕۆژە پێت وت شێت...!
وەزیرە بە بیستنی ئەوە فێی لێ دێت، کەف بە دەمیدا دێتە خوارەوە، هەموو گیانی خۆی دەرنێت. غوڵامان دەستی دەگرن و حەکیم بێ هۆشی دەکات. لەگەڵ هۆشهاتنەوەیدا بە غوڵامە دەڵێت: بمبەن بۆ لای شێخ. دەیبەنە تەکیەی شێخ.
شێخ دەفەرموویێت:
- وەزیر کێ شێتە؟
وەزیر دەست دەکات بە لە خۆدان و گریان، عەرزی شێخ دەکەن سێ ڕۆژە زا نەچۆتە دەمی، دەڵێت: گۆشتی منداڵی خۆم ناخۆم. شێخ بە دەستی موبارەکی خۆی جامێ ئاو بە دەمیەوە دەکات و وەزیر ئەهوەن دەبێتەوە، شێخ دەست بە خوێندنی ویردان دەکات، دەڵێت:
- شۆربای تەکیە بۆ ئەم موریدە بێنن.
شۆربای بۆ دێنن و وەزیر دەیخوات، جا دێتەوە سەر خۆی و شێخەی نیەتپاک دەڵێت: وەختی نوێژی نێوەڕۆیە، وەزیر و گزیر و هەمووان نوێژ دادەبەستن، کە سەلام دەدەنەوە، شێخ دەفەرموویێت:
- لە خزمەت مەرەخەس بن.
هەمووان هەڵدەستن بڕۆن، دەبینن وەزیر هەڵناستێ، دەڵێت: قوربان شوکر بۆ خوا بە دەماخ و ساغیت، بەڵام ئەو دەڵێت:
- هیچ موریدێک تەکیە جێ ناهێڵێ، وەک چۆن هیچ پاشایەک کورسی جێ ناهێڵێت، ئێوە بڕۆن من لە شوێنی خۆمم.
بەو شێوەیە وەزیر واز لە کورسی و ماڵ و کەنیز دێنێت، دەبێتە چل و یەکەمین موریدی شێخ. لە کۆڕی زیکردا ویرد دەخوێنێ، شەو و تا بەیان نوێژ دەکات، دەخولێتەوە عارفانە و عاشقانە بە خودادا دەڵێت.
خانم من لە دوای ئەو حیکایەتەوە هەوای تەکیە دای لە سەرم، لە حیکایەتەکەدا بیری شێخی خۆمم کەوتەوە، دڵم گەرم بوو، ڕۆژی پێنج شەممە بوو. هەر زوو دوکانەم داخست، غوسڵێکم کرد و بە ترسەوە خۆم بە حەوشی تەکیەدا کرد، چوومە کونجی لاسەروو و لەژێر سنەوبەرێکدا دانیشتم. شێخ لەگەڵ موریدان لە لای حەوزی ناوەڕاستی حەوشەکەدا بوو چاوی چووە سەر من، بێ ئەوی قسەکەی ببڕێت بزەیەکی کرد و موریدان منیان نەبینی. تاریک داهات و نوێژ کرا، نان خورا و دەستکرا بە زیکر. منیش چووم لە گۆشەی خوارەوە ڕێک لای ئەو شوێنەی خەلیفە ڕیش چەرموو لێی دادەنیشت کزۆڵەم کرد، موناجاتم دەوتەوە و دڵم کڵپەی کرد، ئاهـ خاتوون ئاگری ژێر خۆڵەمێش تاوی سەند و حاڵ گرتمی، ئەو شەوە مەستبووم، مەست مەست، وەک ئەوەی کەون بە دەوری مندا بخولێتەوە وەها خولامەوە... خانم زۆرن ئەوانەی گلەیان لە تۆ هەیە، بەڵام من تا دەمرم مەمنوونی ئەو حیکایەتەی تۆم، کە جارێکی تر مەستی بێ شەرابی کردمەوە... خانم؛ من گیرۆدەم گیرۆدە... خانم... عەیب نییە پیاو بگری.. من گیرۆدەی کفر و ئیمانم، نوور و زوڵمەت...

# شەوی پێنجەم

بە ناوی ئەو خودایەی خۆی وەڵامدەرەوەی عەبدەکانییەتی، ڕجاوەرگر و نزاخواستە. تکای لا دەکەم خاس بیت و نزا دەکەم باش بم. ساڵانێکە نزا بۆ تۆ بۆ خۆم، بۆ یارت دەکەم... ساڵانێکە دوعا دەکەم و گیرا نەبووە، ساڵانێکی زۆرە. جارێک دڵم تەنگ بوو، لەو دڵتەنگییانەی کە پەڵەیەکی ڕەشی توندی تورتی تاڵڕەگ، دێت و داگیرت دەکات، بۆ خۆیت قۆرغت دەکات، بە دڵێکی تەنگەوە چوومە لای مەلا خەدیجە، وتی:

- بۆ دڵت تەنگە؟

لەبەر حەوزەکە دانیشتبوو سێوی بۆ مامۆستا نجوم دەشوشتەوە، منیش وتم:

- دوعا دەکەم و هیچم گیرا نابێت، دەپاڕێمەوە کەچی ئەو باری تەعالایە لێم وەرناگرێت، ئاخر تۆ بڵێی من لە سەگ پیستر بم، دوعام وەرناگرێت؟

وەهام وت و وتی:

- ڕۆرە وا مەرێ، بۆ زارت باش ناهێنێ، یا موجیب بکە، کە تەنها خوا وەرامدەرەوەی نزاکانمانە.

بۆی باسکردم لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە پێغەمبەر فەرموویەتی: (دوعا مۆخی عیبادەتە)، مەلا خەدیجە بۆی باسکردم، خودا پاڕانەوەی فرەی پێ خۆشە. دەیوت لە زومرەی دوعاکەراندا دوو چەشن هەن، جۆرێکیان دوعایان ناخۆشە و تووڕە و بە هەڵپەن و ئادابی دوعا نازانن، ناپاڕێنەوە داوا دەکەن، جۆرێکی تریان تووڕە نین، دڵتەنگ و ئارامن، دوعا دەکەن و دەپاڕێنەوە، نزا دەکەن و دەگرین و دەبن بە تنۆکێک ئاو. ئەم دووانە وەک دوو کەس وەهان، کە داوای شتت لێبکەن، تۆیش وەعدت داوە دڵیان نەشکێنێ، هەردووکیان لەبەر دەرکەت وەستاون و داوا دەکەن، تۆ لە پێشدا ئەوەی تووڕەیە ڕایی دەکەیت و دەڵێیت بەشی خۆی بدەنێ با زوو بڕوات، بەڵام ئەوەی ئارام و ئەهوەنە دڵ دەکاتەوە، پێی دەڵێن چاوەڕێ کە بەشی تۆ نەماوە چوون بۆت بێنن، وەرە دانیشە لە حەوشە، تا دێت. ئیدی خوداش وەهایە، پاڕانەوەی کەسە هێمنەکەی خۆشدەوێت، دەیوت بڕۆ مەقالاتی مەولانا بخوێنەوە چەندە جوان باس دەکات، دەزانم ڕۆرە تۆیش لەو خۆشزارانەی بۆیە خوا ڕای گرتوویت، پەلەت نەبێت. خانم تۆیش پەلەت نەبێت، کە دیسانەوە دوعا بکە، دڵنیابە خۆی وەڵام دەرەوەیە.

شەهرەزاد دەبێت من بە برینداری بێم و لە نوکەوە شتەکان باس بکەم، کەس وەک من لەم بەڵایەیا بریندار نییە، کەس. دەبێت هەموو شتت بیر بخەمەوە شەهرەزاد، کە بڕیار بووە هەرگیز لای خۆت باسی نەکەم. من و تۆ لەسەر ئەوە



ڕێک کەوتین هەرگیز ئەو شتانەی بۆ یەکمان درکاندووە، باس نەکەینەوە. ئاهـ من باسی چی دەکەم؟ دەستم بەرێ، بێنە ئەزیزم دەستتم بدەرێ. حەکیمباشی دەڵێت ناوی کەسەکانیشت لە یاد نییە، ئەمە بۆ من قورسە، ڕایان سپاردم یەکەم شەو من بێم، وتم: چاوم بەرایی نایەت، ناتوانم، زۆریان لێ کردم، وتم با چەند شەوێک تێپەڕیت جا من دەچم، خەمتان نەبێت هەموو شەوێک دەچم.

شەهرەزاد؛ تەماشای ناوچاوم کە؛ من ڕووبابەم! دەستەگوڵە تاقانەکەی شارت، ڕووباب وێنەی تۆ، وێنە تاریک و خەمبارەکەی خۆت لە شار. پێکەوە بیرۆکەی زۆرترین حیکایەتت دادەڕژین و من دەچم، دڵتەنگترین، بکوژترین جۆری



حیکایەتەکان ئەوانەن کە منی تێدام. منم ڕووباب، دەناڵم و لە تاو ناڵە ئەو ناوەت لێ ناوم. دەناڵم، دوعا دەکەم و تاریکیم لێ دەتکێ. تۆیش دەمخەیتە ئەو حیکایەتانەی مرۆڤکوژن. کە ون دەبم، بە بۆنی تاریکی دەمناسنەوە، بە هەر کوچەیەکدا دەڕۆم بۆنەکەم دەمێنێتەوە، لە هەر شوێنێک دادەنیشم خەرمانەیەکی تاریکی وەک تەمی ڕەش لە شوێن خۆم جێدێڵم. بەڵای من تاریکییە، تاریکیش دەرمانی تۆ. شەهرەزاد، بڕوانە خۆم حاڵم ناباشە، خۆم ئەوەندە سەلامەت نیم، تا تۆیش وەها ببینم. بانگیان کردم تابزانن، من لە تۆوە نزیکم گومان لە کێ و لە چی دەبەم. منیش لەوە بێ ئاگاترم زەینم بۆ کەس و هیچ بجووڵێت، وتم نازانم. بەو قسەیە ئەوەندەی تر دوژمنم بۆ خۆم دروستکرد. گوێم لە چەند ژنێک بوو وتیان ئەم

شەیتانی مەملەکەتەیان کردووە بە فریشتە لێمان، ئەوەتەی هەیە دەڵێت نازانم، بلێ دەمبۆگەنی وەک ئەو چییە وەهای بۆ دەکەن. من گوێم لێبوو ئاورێکم بۆ دانەوە، هیچم نەوت تەماشای ناوچاوام کرد، سەریان داخست. دیسانەوە بە میرزا ئادەمم وت، گومانم لە کەس نییە. شاڵەکەم لە خۆم پێچا و هاتمە دەر. شەهرەزاد بۆچی قەدەری من ئەوەیە؟ شەهرەزاد ئەگەر ئەمە باجی رووباب بوونمە، ئەم باجە تەواو نەبوو؟ شەهرەزاد ئەگەر ئەوە باجی حیکایەتخوانیتە، ئەوە بۆ تەواو نەبوو؟ شەهرەزادی بەدبەخت، هەستە، بەشکو ئەم هەواڵە ترسناکە خەوێک بێ، لێی راچڵەکم، هەستە بەلەنگازیی تۆ برینی من پاراوتر دەکات.
سێ ساڵ پێش ئێستا مانگی بەفرانبار، بێتاقەت بووم، هاتمە لات چاییەکم دەمکرد و یەکی کوپێکمان گرت بە دەستمانەوە خەیاڵ بردمییەوە. من هیچم نەبوو بیڵێم، تەنها چێژم لە عەزاب و چایی و بەفر وەردەگرت. تۆ دەمێک تەماشات کردم، وتت: بۆ ناچیت بۆ لای موشتاقولیقا؟ منیش وتم: هەفتەی پێشوو سەرم لێ داوە، تۆ وتت: سەردان نا، بچۆ بزانە چۆن کار دەکات؟ کەس لەم شارەدا وەک ئەو خولقێنەر نییە. بەمزوانە حیکایەتێک هەیە دەبێت بیگێرمەوە. پێم سەیربوو، بۆچی باسی ناکەیت و ناتەوێ من بیزانم. ئەو ئێوارەیە چاییەکەم خواردەوە، پێش تاریکبوون چوومە لای موشتاقولیقا، وتم:
ای چشمه آگاهی شاگرد نمی خواهی؟
چه حیله کنم تا من خود را به تو دردوزم؟
بزەیەکی کرد، وتی: کێ تۆ کێ کێ؟ وەرە دانیشە بزانم چ ماجەرایە؟ منیش وتم: لە سبەیەوە بۆ یەک هەفتەیە شاگردی تۆم، وتی من هیچم نییە تۆ فێر بکەم، بەڵام وەرە موشەرفمان دەکەیت. خۆت دەزانی من و موشتاقولیقا چۆن بە رەمز و تەشەر و شۆخی قسە دەکەین، من قەرارم مەولانا بوو، ئەو جەوابی شەمسی تەورێزی. هەفتەیەک تەماشای دەستەکانیم کرد، بۆنی خاکم هەڵمژی، نەشمدەزانی بۆ لەوێم، بەڵام دڵم خۆش بوو. شیعری خەییامم بۆ دەخوێندەوە، ئەویش باسی چاوخوماری خۆیی بۆ دەکردم. ئەو پیاوە سەیرە، هەمیشە چاوی پڕە لە غوباری زەمەن و دەستەکانیشی میهرەبانی لێ دەچۆڕێت. دوای هەفتەیەک هاتمەوە لات، وتت لە حیکایەتێکدایت، نە ناوت هەیە نە ناونیشان، دەستبەکار بە. دەمزانی مەیلت لە گێرانەوەی شتێکە تا ئێستا من و تۆ بۆی نەچووبین، تا بیسەلمێنی، بە تەنها تۆ خالقیت و من هیچم پێ ناکرێت. بەوە دەتویست چی بکەیت؟ من هەرگیز نەمزانی ئەو حیکایەتەت بۆ بە تەنها دانا، کە دوایی هەردووکمان بەبێ تاقەتییەکی قووڵ باجەکەیمان دا. حیکایەتەکە وەها بوو، من وەستایەکی سەنەمساز بم. ئاهـ لەم حیکایەتە، چونکە حاڵت خراپ بوو ناگێڕێتەوە دەخوێنرێتەوە راوەست:
خودایەکی نەپەرستراو
حیکایەتەکان باسی کچێک دەکەن، کە دەیویست بپەرسترێت، پەرستنێک لە تەوتەم، لە خودای مەعبەدەکانی هیند، لە هیی چین، لە ئاتەشەکانی زەردەشتی نەچێت. پەرستنێک لە هیچ پەرستنێک نەچێت، پەرستنی عەشق نەبێت!
حیکایەتەکان ئەو کچەیان لە بیر نەچۆتەوە، هەرگیز نەپەرسترا، حیکایەتەکان بێ رەحم نین، زەمەن بێ رەحمە، شەهرەزاد ئەوەی گێڕاوەتەوە...
من بیرم نایەت، بەڵام باپیرم هەمیشە دەڵێت: لە دووری دوو رۆژەڕێ لە (رەی)یەوە، مەعبەدێکی گەورەی پڕ لە خوداوەندی جۆراوجۆری لێبوو. خودای هەمەچەشن، خودای نیوەمرۆڤ، نیوەفریشتە، خودای شەیتانشێوە، مرۆڤڕەنگ،



خودای مەمیموون. تەنانەت خودای کەڵبەی گورگیشی لێبوو. خوداکان وەزیفەیان جیابوو. خەڵکان لە شام و شیراز و کوفە و هەراتەوە، تەنانەت سەمەرقەند و ئەندەلووسەوە، بۆ ئەم مەعبەدە دەهاتن، خودای خۆیان ئەدۆزییەوە، ئەیان برد و ئەیانپەرست. هەیشبوو بە ناوی کڕینی خوداوەندەوە دەهات لەوێ جوانترین کچانی شیرازی دەدی و لەگەڵ خۆیدا دەیبردەوە و ئەوی بە خوای خۆی دەکرد. من بیرم نایەت باپیرم باوکی، ئەویش باپیرەگەورەی بۆی گێراوەتەوە: لەو مەعبەدە گەورەدا، زۆرێک لە جوانترین کچانی مەملەکەتەکان دەهاتن و بۆ خزمەتی خوداکان خۆیان بە مەعبەدخانە دەبەخشی، ئەوان دەیانزانی بەو خزمەتە گەورەتر دەبن، دڵنیابوون لەوەی ئەمان لە خوداوەندەکان زیاتر دەپەرسترێن،

بۆیە هاتبوونە مەعبەدەکە و لەوێ خزمەتکار بوون.
لە شارە دوورەکانەوە باسی خوداوەندە ڕۆحدارەکانی مەعبەد ورووژابوو، ئەو خوداوەندانەی مێینەیان لێ دەبارێت. هەم زەمین بوون بۆ پیاوان هەم زەمان، هەم خودا بوون، هەم ئینسان... پیاوان دەهاتن و خودایەکی بەردین و خودایەکی ڕاستەقینەیان دەبردەوە. ئیدی خۆشبەختیان دەکڕی و گرەوی بەهەشتیان لە باخەڵ دەنا... خوداوەکانی مەعبەد، سەرەیان بۆ دەگیرا، هەم زیندووان و هەم مردووان، کیژ هەبوو مەرجی دەبەست، مەرجی سەخت، بۆ ئەوەی بزانێت داخۆ بەڕاستی خودای دوو دنیایە یان نا؟ موئمینەی بەدبەختی دەناردە ژێرزەمینی مەعبەد و داوای لێ دەکرد تا حەوتسەد ڕۆژ لەوێ بیر بکاتەوە بزانێت بەڕاست ئەم خودایە ئەوەیە، کە ئەو دەیەوێ ؟... ئاهـ ئەم خوایانە چیان ئەکرد.
باپیرم کە باپیری بۆی باس کردووە، ئەویش بیستوویەتی؛ دەڵێت: مەعەبەدەکە هەموو جۆرە خوایەکی لێ بوو، ئەو خوایانە جاری وابوون لە وەرزی پاییزا نەدەمان، ئەو کاتەی هەمووان لە تەنهایی و سەرما و دڵتەنگییەکی قورسیی زستان ئەترسان، ئەهاتن بۆ بردنی خوایان. هیی واشیان هەبوو خودای ئەگۆری، لە فیلێکەوە بۆ ئاسک یان لە فریشتەوە بۆ نیوەمرۆڤ، هەبوو سەرەی ئەگرت، حەوت شەو نۆکەری وەستای دەکرد، تا خوداکەی بۆ دروستکات و ئەم زستانەی بۆ شووم نەبێت. هەمووان لە بیری خواوەندەکانیان بوون، کەس بیری لەو بوتسازەی دروستکەری ئەو هەموو خوایە نەدەکردەوە، کەس کەس.
باپیرە گەورەی باوکم بیستوویەتی، وەستاکە لە دووری حەوت فەرسخی مەعبەدەکەوە، لەماڵێکی لە دار چێکراوی نیمچە بچووکدا، خەریکی تاشینی بەرد سمارتەکردنی دار و نەخشکاری ئێسک و تەوتەمەکان بووە. دەڵێت: خۆی هەرگیز هیچ خودایەکی تایبەتی نەبووە و کەس نەیزانیوە کامە خودای ئەوە، کەس کەس... دەڵێن جارێک ڕێبوارێکی بێ خودا ڕێی دەکەوێتە ماڵۆچکەکەی و پێی دەڵێت: ها وەستاااا! کامە خودای تۆیە من ئەوە دەکڕم! دەڵێن کچەی بوتساز کە کەس ناوی نازانێت، بۆ تاوێک دەست لە پەیکەرەکەی بەردەمی هەڵدەگرێ و بەوپەڕی ماندووی، بە بزەیەکی تاڵەوە تەماشای ڕێبوارەکە دەکات، دەڵێت: خودای من ناکڕدرێت بە تۆ! جا ڕێبوارە دەڵێت: بەڵام من دەیکڕم و لەگەڵ خۆم دەیبەم.
ئاهـ دەڵێن هەرگیز کەس نەیوێراوە وەها قسە لەگەڵ خاتوونی سەنەماندا بکات. بوتساز هەرگیز بێ ڕێزی بەرامبەر نەکراوە، هەمووان زانیویانە تاکە کەسە خوایان بداتێ. دەڵێن ئەوانەی لەوێ بوون، دوو کوڕی گەنج و ژنێکی ئیختیار بوون. ژنەکە دەستی ڕامووسیوە، کوڕەکان وتوویانە لە بری ئەو، ئێمە خەجاڵەتین. بەڵام وەستای کارساز بێدەنگ بێدەنگ بەو چاوە لە کچ نەچووانەیەوە، بەو دەستە خوێن لێهاتووانەیەوە بزەیەک دەکات و هەر لەوێشەوە ئیتر پێ دەخاتە حیکایەتی شوومی خۆی، چونکە تێدەگات خۆی دەبێتە خودایەک، خودایەکی تر...
باپیریشم بیستوویەتی و نازانێ یەکەمجار لە کێی بیستووە، خوداساز لەو کاتەوە دەیەوێ بپەرسترێت، حەز دەکات یەکێ بیپەرستێت، ئەو یەکەش غەریبە نەناسراوەکەیە، کە دڵی ئەمی بردووە. وەستا دەیەوێت ئەمیش خواوەند بێت، کچەی خوداخولقێن خۆی بە شیرازییە چاوگەورەکان بەراورد دەکات، کە ئەوان بە ئاسانی دەپەرسترێن و ئەم نا. دەڵێن: وەستا دەوەستێ تا ڕێبوارەکە پاش حەفتا ڕۆژ دێتەوە، ئەوسا بە بزەی شەیتانێکی عاشقەوە، دەڵێت: من هاتووم بۆ خودای خۆم. وەستا دڵی دەکەوێتە تەپە تەپ، دەترسێ، ڕەنگی دەپەڕێ. ڕێبوارە دەڵێت:
- من خودای خۆمم دۆزیوەتەوە!



دادەنەوێتەوە مشتێک خاکی بەرپێی سەنەمساز هەڵدەگرێت و ماچی دەکات، دەڵێت:
- تۆ خودای منیت!
دەڵێن ئەوانەی بیستوویانە هەستیان کردەوە دەنگی ڕێبوارە لەرزیوە و گریاوە، وتوویەتی قبوڵی کە... وەستا سێ شەو و سێ ڕۆژ لە جێ دەکەوێ، هیچ خوایەک دروست ناکات. بۆ یەکەمجار تامی پەرستن دەکات، تێدەگات بۆ ئەو خەڵکە لە دووری هەزاران فەرسەخەوە دێنە لای ئەم تا خوایان بۆ بسازێنێ، چونکە پەرستن شیرینە... دەڵێن: ئەو سێ ڕۆژە ڕێبوارەی بێ ئیمان نەوازشی دەکات و دەیپەرستێ، ئەودەم چا دەبێتەوە، وەستا باشترین و شاکارترین خوداوەندەکانی دروست دەکات، باپیرە گەورەم دەڵێت: ڕێبوارەی بێ خودا دوای ڕۆیشتن و هاتنەوە زۆرەکانی ڕۆژێک دەڕوات و دەڵێت:
من ئەمەوێت لە دوورەوە بتپەرستم، ئەمەوێت لەناو دڵما لەگەڵ خۆم بتگێڕم، ڕۆژێک دێمەوە لات ئەی خوداوەندم!
وەک هەموو حیکایەتەکان، ئەم حیکایەتەش دوای ئەم قسەیە دەشکێ، چونکە ساڵانێک بوتساز چاوەڕێ دەکات، دەیەوێ

بۆ یەکجاری تر چێژی خودایەتی بکات، بەڵام هەرگیز نایکات، ئیدی وەستا ڕقی لە هەموو ئەو خودایانە دەبێتەوە، قینی لەو هەموو گەمژەیە ئەبێتەوە کە خەریکی پەرستنن. کچەی بوتساز نیوەشەوێک بڕیار ئەیات مەعبەد و کچە شیرازی و پیاوە زۆرەخوداویستەکان، بەجێ بێڵێت. بە دوای خودایەکدا وێڵ بێت، شێوەی نەبێت، خودایەک نە مرۆڤ نە بەرد بێت. دەڕوات و هەرگیز کەس نایبینێتەوە. وەک هەموو حیکایەتەکان حەوت شەو دوای نەمانی خانمەی سەنەم، ڕێبوارە بە دەم لەرزەوە دێتەوە، بەڵام خودای ئەو ونە... بوتساز لەوێ نەماوە، بوتساز لە هیچ شوێنێکی ئەم زەمینە نییە!

بیرتە کاتێک حیکایەتەکە تەواوبوو، چیمان لێهات؟ ئاهـ ماڵ کاول چیت لە هەردووکمان کرد. قەتماغەی برینت هەڵدامەوە، تلوخوێت کردە سەری. بە سەری خەنجەرێک برینەی کۆنت کڕاندم و تەڕوتازەت کردەوە. دوای حیکایەتەکە، هیچ هیچم نەوت، تەنها مات بووم، جگەرەیەکم داگیرساند و لە بەینی پەنجەما بوو، بیرم نەبوو نەفەسی لێ بدەم تەماشای بارینی بەفرم دەکرد، کپ بوو، شەوێکی سپی کپ بوو. قومێکم لە چاییە ساردە تاڵە دا و شاڵەکەم دام بە شانما، لە بەردەرگا وتت مەڕۆ، من ئاوڕێکم لێ دایەوە، بزەیەکی تاڵی لاوازم کرد. بەو نیوەشەوە گەڕامەوە ناو ماڵە قوڕینەکەم. بەو نیوەشەوە تورەکەی سیگارەکە و قۆرییە بچووکەکەی کە باپیریم لە حەج بۆی هێنابووم بردمە ژێرخانەکە. سۆپە بچووکەکەم و بەشێکی کتێبەکانیشم بردە ئەوێ، بیرمە بە خاوی ڕێم دەکرد، لەبەر خۆوە ئاوازێکم دەچڕی هەڵگری برینەکانم بوو. تا هەفتەیەک لەوێ بووم. تۆیش منت نەدۆزییەوە، نەمەویست بتبینم، نەمدەویست... دڵنیام ویستت بەوە هەردووکمان بەرامبەر بە دڵتەنیگمان، بە برینمان بەوەفا بین. بۆیە دیسانەوە کە باش دەبووم و دەهاتمە دەر، دەستمان پێ دەکردەوە، من و تۆ لە ماندووبوون، ماندوو نەبووین! ئەو حیکایەتە بۆ ماوەیەک منی لە تۆ تەرە کرد، یەکێکیشی بەدبەخت کرد، کە نامەوێ هیچت بۆ باس بکەم، هیچ هیچ هیچ...

# شەوی شەشەم

بە ناوی ئەو خودایەی خۆشی دەوێین، ئەو خودایەی خۆی موحیبە، داوای لێ دەکەین، بە خۆشەویستی جەوابی ئێمەیش باتەوە. زۆر دەمێکە دەمەوێت قسەت لەگەڵ کەم. نازانم بۆ نەمدەتوانی بێم و قسەی دڵم بکەم. ئەم دیدارە زۆر دواکەوت تا ئەم بەڵایە رووی تێکردی. کاتێک بۆیان باسکردم، وتم: من حەقایەتی زۆرم هەن بیکەم، رێگەم بدەن من بچم. ئیتر ئەم شەوم بۆ خۆم پچڕی. ڕەنگە زۆر منت نەدی بێت، چون بە تەبیعەتی حاڵ زۆر دەرناکەوم، ڕوحنەوازی کوڕی داودی ئاوێنەسازم. باوکم خەڵکی خۆراسانە و ساڵانێکە عەمری خوای کردووە و پیشەکەی بۆ من جێماوە. لە شاری قەلەندەران مرۆڤ نازانێت چی بکات، ئەگەر شتێک سەرقاڵی نەکات بیر لە ڕاکردن دەکاتەوە. بنەماڵەی ئێمە جوون، بەڵام من خۆم نازانم بڕوام بە چی هەیە، لەوانەیە بە هیچ، لەوانەشە بە تاقی تەنیا بە موحیب.
دیارییەکی بچووکم بۆ هێناویت، ئاوێنەیەکی زیوینی نقێم پیرۆزیی دەستوو درێژ و ڕازاوە بە تیلە یاقووت، شاهانەترین جۆری ئاوێنەی گۆییە، کاتێک خاتوونیکی نازداری وەک تۆ بیەوێت خۆی تێدا تەماشاکات. تەمەننا دەکەم پشکی هەبێت لە بیرخستەوەی شتێکدا بۆت، هەر شتێک بێت. خاتوونم، ڕەنگە ئەمشەو تەواو بتکەمە مەحرەمی ڕاز، لە بارەی زۆر شتانەوە بپەیڤم، لە بارەی قەلەندەرخانەکەت، خاتوونان و دڵفەریبان و پیاوان و بازرگانان، زۆرت بۆ نەقڵ دەکەم. ئاه خاتوون تەمەننا دەکەم ئەمشەو لە درێژترین شەوەکان بێت، درێژ وەک شەوە تاریکە غەمبارەکانم، درێژ وەک ئەو شەوانەی زستان کە تایەکی زۆرت لێدێت و وا زەن دەکەیت هەرگیز ڕۆژ نابێتەوە. درێژ وەک شەوی یەڵدا. دەمەوێت ئەم شەو حیکایەتی خۆمت بۆ باس بکەم. خاتوونان میهرەبانترن، ئەوەی لای تۆ دەیدرکێنم، هەرگیز ناتوانم لای برادەرانم بیانڵێم. نایلی کەریمۆک کە شتێکی بۆ باس دەکەم وەک شۆخی ئاسایی هەمیشەی دەڵێت: فەلەی حیز تۆ چیت تووشی عەشق بیت. ئێواران کە دەستیان بەتاڵ دەبێت دێنە لام، دوکانەکەم دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی پردەگاورەوە، ئێواران کیژان و کوڕان کۆ دەبنەوە لەسەر ئەو پردە دێرینە خشتییەی کە خۆرئاوابوون لێوەی مەستانە و شاعیرانەیە. لە پشت پردەکەوە بەرەو ڕۆژئاوا بازاڕی سەوزەومیوە و ماسیفرۆشان و جەڵەبچییەکانە. کەس وەک من ئەم زێی و پردە ناناسێت، کەس نازانێ بۆ وا مەملەکەتی کەرت کردووە. پەنجەرەیەکی بەسەر پردەکەیا دەڕوانێت و دەرگەکەشم بەسەر لایەکی ئاودا، ئێواران بۆنی ئاو و مێخەک و بوغورد مەستم دەکات. ماوەیەکە فێربووم شەیدایانە بۆنی مێخەک ئەکەم، وەک شێت بوغورد داگیرسێنم و جارجارەش بە ڕۆژی ڕوون مۆمێک لەسەر تاقچەی شەشەمم هەڵدەکەم. دوکانەکەم کۆنترین دوکانی لای پردەگاورە و حەوت تاقی تیایە، ناوەڕاستەکەی قوبەیەکی گەورەیە کە لە ڕووی دەرەوە گومەزێکی



خاکییە بە کەمەرەیەکی کاشیی شین. دڵم بەم دوکانە خۆشە، لە منالییەوە لەگەڵ بابم لێرەم، بەڵام کاتێک بووم بە نۆزدە ساڵان، دەبینم ئەم دوکانەم خۆشەوێ، کە باوکیشم ئەمری هەقی بەجێ هێنا، زانیم من شەیدای ئەم شوێن و مەکانەم. ئاهـ خاتوونەکەم لە دڵی خۆتدا بە کەمفام و شێتم مەخەمڵێنە، ڕێگەم بدە قسەت بۆ بکەم، ورد و درشتت بۆ باس بکەم، ئیزنم بدە هیچم لە قەڵەم جێنەمێنێ، ڕێگەم بدە شەهرەزادی جیهان.

زۆر کەمن ئەوانەی لە قەلەندەرخانەکەت من دەبینن، چونکە لە دوکانەکەم نایەمە دەر، بەڵام لەم دواییەدا من هەموو مەملەکەتم ئەزبەرە، یەکبەیەکی هەموویان دەناسم. هەموویان کەسانی باشن، یان ڕەنگە هیی ئەوە بێت من عاشق بووم، دەڵێن کە عاشق دەبیت ئیتر هەموو کەونت خۆشدەوێ، دەڵێن زەویت بە کڵاشەکانییەوە، ئاسمانت بە جەمەدانەکەیەوە خۆشدەوێ، لەوانەیە ڕاست بێت. خاتوون؛ ئەمن کەمدووم، بەڵام ئەمشەو خوێنبایی بێدەنگییەکەم قسانت بۆ دەکەم.

ختورەی خراپ لە دڵت نەدا خاتوون گیان، دەستەپاچە و شەرمیۆنم، با تۆ مەحرەمی ڕاز، خوشکی گەورەی من بیت.
ساڵانێک لەم شارەم وجودی کەسم نەزانیوە، جوانترین ئاوێنەکانم دروست دەکرد و بۆم گرنگ نەبوو خۆم لە ئاوێنەیەکدا ببینم. بەڵام ڕۆژێک هەموو شت گۆڕا، خانم هەمیشە وەهایە ڕیتمی حیکایەت بە یەک نەفەس دەڕوا، تا ئەوەی بەیانییەک شتەکان دەگۆڕدرێن، وەک خۆیان نامێنن. ئیتر تۆ جۆرێکی ترت لێدێت کە هەرگیز وانەبوویت. ڕەنگە کەسێک بێتە ناوەوە و کۆی حیکایەتەکەت لێ تێک بدات. وابزانم کارکردنی تۆیش وەهایە، هەموو شتەکان خۆڕەون، بەڵام لە چرکەساتێکدا هیچ شتێک وەک خۆی نامێنێت. منیش ڕۆژێک بەسەر پردەگاوردا دەپەڕیمەوە بەرەو دوکان، بۆ یەکەمجار مەیلی خۆدیتنەوەم هەبوو، دەمویست بەتەواوی خۆم لە ئاوێنەکاندا ببینم. زۆرجار لەسەر پردەگاور وەستاوم و لە ئاوەکەدا بۆ وێنەی خۆمم ڕوانیوە، بەڵام خۆمم نەدیتووە. هەر ئەو پردەی من لە هەمووان زیاتر لەگەڵی هەست بە نزیکی دەکەم. دەڵێن و کەس نازانێت چۆن بیستراوە، ساڵانی زوو ماڵە گاورێکی زێڕینگەر لەوبەر ئاوەکە دەژین، تاقە کوڕێکیان دەبێت، بەهارێک کە تۆف و باران هێند زۆر دەبن و ئاوەکە دوو بەرابەر دەکەن. کوڕەی تاقانە لەگەڵ باوکی دەیانەوێت بەسەر پردە ڕووخاوێکی داڕزاوا بپەڕنەوە، لە ناوەخت بە شەپۆلێکی توند پردەکە تەختەیەکی جێرجێرەکەری دەترازێت و کوڕەی تاقانە دەکەوێتە ناو ئاوەکە. دەڵێن: باوکەی گاور، دەستبەجێ، نەزر دەکات بۆ ئەو پیریەعقوبی خاسانەی کە هەمووان باوەڕیان پێیەتی، کوڕم نەمرێ، باشترین پرد دروست کەم! دەڵێن نەزرەی گیرا دەبێت، کوڕە ڕزگاری دەبێت و نامرێت. ئەوسا دەچێتە زیارەتی پیریەعقوب و مانگی گوڵان دەست دەکات بە هێنانی وەستا لە ئەستەنبوڵەوە دەکات، بە ماوەی سێ ساڵ ئەم پردە دروست دەبێت، کە سێ تاقچەی هەیە و لەمسەری خانێکە و ئەوسەریشی دوکانی خونچەبۆی بۆنسازە.
خانم سەرگوزەشتەکەم لەو شەوەوە دەستی پێکرد، منت بردە ناو حیکایەتێکی سەیر. حیکایەتێک کە هەموو قەدەری منی گۆڕی، ڕەنگە ئەم قسەیە زەبەلاح بێت، چونکە کەس نازانێ قەدەرمە یان نا. بەڵام هەموو شتی گۆڕی. خانم بە پڕرووم مەزانە. ئەو شەوەی ناردت بە شوێنم دا، بە سەرمەدی قاسیدم وت، ئەم حیکایەتە کێی تیایە، ئەویش وەک سیفاتی هەمیشەیی بزەیەکی کرد و هیچی لە بارەوە نەوت، هێند نەبێت، وتی: خۆشبەحاڵت. کاتێک گەیشتمە حیکایەتخانە، تەماشا دەکەم کێی لێیە؟ ڕووبابە خاتوونی کافر. ئاهـ خاتوون شەرمەندەم ئەمە دەڵێم، ڕووبابەی تۆ، ڕووبابەی زوڵف قەترانی، باڵا عەرعەری، ڕەنگ زەرد، ڕووبابە کەس نازانێ لە کوێوە هاتووە و چییە و چی نییە، ئەفسانەی ئەم قەڵەندەرخانەیە، کاتێک دیم بێ باکانە سیگارێکی بە دەستەوە بوو. تەنوورەیەکی ئاودامانی هەزارچینی زەرد و کراسێکی ئەتڵەس و ئێلەکێکی وەنەوشەیی شەوهەڵوەر، وای خوایە دە دەور ملوانک و حەتحەتۆکی لە مل و بەر سینگان بوو. شاڵێکی بە شاندا دابوو، دڵەڕاوکێی هەبوو وەک ئەوەی شتێک پەرێشانی کردبێت، شتێک هەراسانی بکات، دەتگوت لەسەر ئاگرە، خەیاڵی لە شوێنێکی دوور بوو، وای خوایە کە دیم لە ئاوێنەی دەکرد، خۆمم تێدا بینی. ئەو کچە لە جوانترینی کچانی شارەکەت نییە، بەڵام لە هیچ نەچووی ناو حیکایەتەکانە، ئەو ڕووبابە، لاموباڵاتەی ئێوارەیەک جەوانانی دۆستم باسیان کرد ئەمەیە؟ ئەوان خۆشیان نەدەویست، بە خۆپەسەند باسیان کرد، من بابەتم پێ گۆڕین، چونکە ئەسڵەن قەشمەریم لە خەڵقی وەها دەهات. بەڵام شەهرەزادی مەحری ڕازم، وای ئەو شەوە ڕووبابە چی بوو. خاتوون گرنگ نییە ئەو شایەعەی بڵاوبۆتەوە ئێمە وەهم و خەیاڵاتی تۆین، بەڵام پێم بڵێ ئەی ڕووباب وەهمی کێیە؟ ئەو کچەی غارەتگەری دینی نەبوومە،

ئەو دڵپەشێوەی دڵارامی مەیە و مرۆڤ دەیەوێت وەک دورێک بیکاتە ناو تاجێک و لە سەری نێت. تا ڕەنگە ئەمە وەسفی شاعیرانی دیوەخانانی قەڵەمڕەوەکەی تۆ بێت، چونکە تۆ مەلەک و پەرییەکەت دەوێت، لەبەر ئەوەی خانمە، لەبەر ئەوەی دەستی لێ بدەیت و خەجاڵەتم هیچ نەبێت جارێک دەستەکانی بگریت و بیخەیتە سەر چاوت. خاتوون ئەو شەوە ئەو بێ ئارام بوو، سیگاری بە سیگار دادەگیرساند و بۆ شوێنێکی دوور زۆر دوور دەیڕوانی.

لە حیکایەتی خودایەکی نەپەرستراودا بووین، ئەو بەو هەیبەتەوەی دەبوو ورد بێتەوە تا مێینەی بدۆزێتەوە، بوتساز بوو، لەو حیکایەتەدا چەندە شیرین بوو، هەمیشە فوستانێکی خەنەیی و کەوایەکی گوڵقولاپی وەنەوشەیی لەبەر بوو، سەروبەستێکی ئاوریشمینی شینی گوڵ نارجی، ڕەنگی زەردتر دەینواند و پرچی لە پشتییەوە شۆڕ ببوویەوە. لە ماڵێکی خاکی بۆی خۆڵ، بۆی مێخەکدا، خەریکی دروستکردنی سەنەم بوو. ئای خاتوون چ خالقێکی فریودەریت، ڕووباب لەو حیکایەتەدا ناوی نەبوو، تەواو خەریکی خەلقی بووت و لات و عەزا جیاوازەکان بوو، تا ئەوەی لە حیکایەتەکەدا ڕێبوارێک دەردەکەوێت و ڕێبوارە دەیەوێت ئەو ببێت بە خودای. ئای لەو ڕێبوارە داماوە کە من بووم، دەزانی هەر بەڕاست خاکی بەرپێیم ماچ کرد و داوام لێکرد خودای من بێت؟ دەزانی؟ چی دەبوو لەناو جەبری وشەدا نەبین و تۆ ڕێڕەومان پێ نەڵێیت، بۆ دەبوو کورە خراپەکە من بم، بۆ؟ تۆ ئەگەر بەڕاست دەتویست شتێک بگێڕیتەوە، بۆ دەبێت مەرگەسات بێت؟ خانم من بەڕاستی دەمویست، دەمویست بڕۆی وی عیبادەتخانەم بێت، ئێستاش بمبینە پیاوێکی بریندار لەبەردەمتدا دەگریم و دەڵێم: دەمەوێت خودام، تەبیبم، حەکیمم بێت. کاتێک لە حیکایەتەکەدا من دەگەڕێمەوە و ئەو نابینم، ئیتر من ئەژنۆم شکا، تەواو لە کەسیرە کەوتم. زانیم دڵم بۆتە بارمتەی و قوڕ بە ماڵم کراوە. ئاهـ کە لە حیکایەتخانە دەرچووین وتم: خاتوو ڕووبابە درەنگوەختە دەتانەوێ بتانگەیەنم؟ بزۆیەکی بەرز کردەوە، وتی: ماشاڵا پیاو زۆر بوون... وای لەو تەشەرەی کە زانی دڵم توندبووە، وتی نا دەچمە لای خانم! سیمای تەواو گۆڕابوو، قووڵ و کپ وەک ئەوەی بەفری دنیا بەسەر دڵی ئەودا باری بێت و قورسیان کردبێت، چۆن بانێکی گڵ کپ دەکات. هەستم دەکرد تاوێکی تر دڵی دەڕووخێت. ئەو ڕۆیشت و من ماڵم کاول بوو. لێرەوە من وێرانبووم، نەچوومەوە ماڵ، حاڵم خاس نەبوو، خۆم کرد بە کوچەی خەراباتیان و بۆ مەیخانەکەی سلێوە عیسا شۆڕ بوومەوە، ئەو مەیخانە لە دووانەکەی دی ناچێت، بە سێ پلە دادەبەزیت بۆ ئەو خەرابخانەیەی تاوێ ئەهوەنت دەکاتەوە. ئەو شەوە باش نەبووم، گرتبوومی و هۆشم بە خۆم نەما، دەمەو بەیان لەوێ هەستام و ڕێک و ڕاست چووم دوکانەم کردەوە و بەردەرکەم ئاورشێن کرد و بۆ یەکەمجار تەماشای خۆمم کرد! خاتوون بۆ یەکەمجار لە ئاوێنەکەدا بۆ خۆم دەگەڕام. ئەوکات هەستم دەکرد، من هەم، هەستێکی سەیر کە پێشتر نەم بووە. خاتوون، من دەمەتەقێم لەگەڵ کچانی شار و غەممازاندا کردووە، بەس هەرگیز وەها هیچ کەسێک نەیخستوومەتە سەر مەراق!

خاتوون ئۆقرەم لەبەر برا، ئەو ڕۆژە دوکانەکەم بە مێخەک بوغورد قاندا، تا ئێوارە لەوێ مامەوە، بۆ ڕۆژی دووەم چوومە هەموو ئەو شوێنانەی قەلەندەرئاوا، کە مەزندەی ئەوە دەکرا ڕووبابەی لێ بێت. چوومە لای موشتاقولیقای گۆزەگەر، دانیشتم و باسی ئاوێنەم کرد، باسی نقێم، باسی هەر شتێک تا بچێت سەر باسی ئەو، باسی گۆزەم کرد، باسی ئەو حیکایەتەم بۆ کرد دوێنێ ئێمەی تێدابووین، وتی: ڕووباب هەفتەیەک لای من بوو. وەی ئاگر گرتمی، لەبەر خۆیەوە وتی: ڕووبابی بەلەنگاز. ئیتر من گۆزەیەکم لێ کڕی و ڕۆیشتم. ڕۆژانی دوایی دەچوومە حەوشەی تەکیە و مزگەوت



و تەنانە یەک دووجار بە لای گەرماوی گشتیی ژناندا چووم، ماڵیانم دۆزییەوە شەو تا بەیانی بەو ناودا هاتم و چووم، لە منداڵێکی هاوسێیانم پرسی، وتی: یەک هەفتەیە کەس نەیدیوە خاتوونیش بۆی دەگەڕێت. خاتوون؛ ئەو هەفتەیە چی لێهاتبوو؟ منی بەدبەخت خەریک بوو بۆ لیقای دەسووتام. چوومە لای هەردوو کچانی مووروو‌ناس لەیلی و شیرین، داوای ملوانکەیەکم لێکردن، هەرگیز هەرگیز کەس نەیبووبێ، کیسەیەک یاقووت و مووررووی ئەڵوەن و پیرۆزەیی شاخبەند و ئاوێنەیەکی گردم دانێ بۆمی بکەن بە ملوانکەیەک، کیژان تەماشایان کرد، وتیان ئەفسانەییترین ملوانکە دەبێت، کە تا ئێستا کردوومانە!

من گەردنبەندە مێخەک و سمڵ و ئاوێنەبەند و نقیم ڕێزەکەم، لەگەڵ نامەیەکدا بە سەرمەدی قاسیددا نارد، ئەوەی

نووسیم به دەم مەستی و گریان و دڵقورسییەکی سەیرەوە بوو، پێموت من ئاوێنەسازی شارم، ناوم ڕوحنەوازە و تۆ بە پەنجەکانت هەزار ئاوازت لە ڕۆحم هێناوە. پێموت: دەمتەوێ خودام بێت، دەخوازم هیی من بێت، گەرەکمە ڕۆژێک لە حەکایەتێکی ڕاستەقینەدا بۆ ئەبەد هیی یەک بین. وای خاتوون شتێک زیاتر ڕۆیشتبووم، بەڵام هیچ لەگەڵ عەشق ناکرێت. خاتوون تۆ دەزانی، کە عەشق هات چی دەکات؟ ئاهـ ڕووبابەی تۆ، هەمووان دەزانن لە تووە نزیکە، هەمووان ئەو بێباکییەیان لەلا سەیرە. هەموو وەڵامی نامە حەوت پەڕەییە خورشیدییەکەم ئەوە بوو:

- من هیچم بۆ تۆ پێ ناکرێت، کەس هیچی بۆ کەس پێ ناکرێت! دیارییەکەت هەڵدەگرم، چونکە دڵنەوازە!

وای خاتوون ئەو ڕستەیەم هەزاران جار خوێندەوە، دەگریام و بە خۆما دەمکێشا بۆ هیچی تیا نییە؟ بۆ تڕووسکایی نییە؟ هەفتەیەک هەموو ڕۆژ نامەم بۆ دەنووسی و سەرمەد دەیبرد، لە ڕۆژی حەوتەمدا دەمی بانگی عەسری موسوڵمانان، لەگەڵ خونچەبۆی بۆنسازدا، خۆیان بە دوکانەکەدا کرد. خاتوون بۆ وەختی وا هەیە مرۆڤ باڵی لێ نارِوێت؟ بۆ مرۆڤ ناتوانێت بفڕێ؟ هاتە ژوور گەردەنبەندەکەی لە گەردن بوو، خەیاڵی لە جێیەکی دوور دوور بوو، دانیشت جگەرەیەکی داگیرساند، دەتوت ئێرە نابینێ، داوای ئاوێنەیەکیان کرد، بۆ دیاری بشێت، ڕووی لە من کرد:

- ئێوە جەنابی ڕوحنەوازن؟

منیش ڕەنگم گۆڕا، خۆم نەمدی، بەڵام خوێن لە دەمارەکانمدا وورووژمیان هێنا، دەترسام بە دەموچاویدا فیچقە بکات، وتم:

- بەڵێ موشتاقی لیقام!

سەرێکی لەقاند وەک ئەوەی بڵێت گاڵتەم لێت دێت، وەک ئەوەی بڵێ موسوڵمان بە، وەک ئەوەی بڵێ درەنگە، وەک ئەوەی بڵێ گەمژە، وەک ئەوەی بڵێ من مەعشوقی خۆم کە ونە، کەونە، وەک ئەوی بڵێ... هەزار بڵێم دۆزییەوە. ئەوسا وتی: سوپاس بۆ دیارییە دۆستانەکەت، تکایە هیچ هەنگاوێ مەیە پێش. جا جگەرەیەکی تری داگیرساند، ئاوێنەکەیان هەڵبژارد و ڕۆیشتن. خانم بۆ هەندێ کات هەیە زەوی لەت نابێت تێی بکەویت، بۆ نابێتە خەرەندێکی قووڵ و لە وەها کاتێکدا بکەوێت و هەپروون بە هەپروون بێت؟ بۆ؟ بۆ؟...

# شەوی حەوتەم

بە ناوی ئەو خودایەی تاک و تەنهایە، کەسی لێ نەبووە و کەسی لێ نابێت. پشت بەو دەبەستین، کە خۆی بە تاقوتەنیا هەمووومان بەڕێوە دەبات. قەزاتگرم، ئەم ماوەیە واتەواتی سەیروسەمەرە هەیە، خوا تۆبە شتی وا دەڵێن عەقڵی بنیام نایبڕێت، شتی زۆر سەیر، کە نیشانەکانی ڕۆژی ئاخرت وەبیر دێننەوە، هەر ئەوەی کە تۆی بێوەی، تۆی کەم نەفس، کەم قسە و ڕێکوپێک، تووشی بەڵا دەکەن و هیچت بیر نامێنێ. بە حەولی خوا باشەبیت، ئێمە ئاگامان لێت دەبێت تا باش بێت، خوا دەکات کار بە حیقایەتەوە دەوەستێ، هەموو شت باشەبێت. ڕۆڵە گیان دەڵێن کەس ناناسیتەوە، من باجی ئەجاوی میمکە جەمەم، مامانم و گوێ ئەسمم. بە ئەسڵ خەڵکی ئەو بابانەین، ساڵانێک لێرەم و بە تاقوتەنیا لە ماڵێکدام. لە ئیشی خۆم ڕازیم و هەقی خەڵکی ترم نییە. خوای گەورە ئاگایارت بێت، لە هیچم کەم نییە. پیشەکەی من قەیروحورمەتی تیایایە و لەبەر خوا دەیکەم، ئیش و کارم نییە، بۆ یارمەتیی ژنانی بەردار نەدەم، ژیان لەوانەوە دێت و لەوانەنیشەوەیە زیندووین. ئافرەت وەک گۆزە وایە، لەناو خۆیدا شتێک هەڵدەگرێت تا پێدەگات و بە کەڵکی خواردن دێت، ئافرەت گۆزەیە، گۆزەیەکی خوایی.

لەم شارەدا مامانی زۆر کەس بووم، بە ڕەحمەت بێت لە دایکمەوە مامانیم بۆ ماوەتەوە، هەتا مردیش کە چاوی لە دەست دابوو، بەبێ دەستنوێژ مامانی نەکرد. دەیگوت کۆرپە وەک پەڕەی قورئان موبارەکە، نابێت بێ دەستنوێژ دەستی لێ بدەیت. کەس لێرە حیکایەتی من نازانێ، کەس کەس، چونکە ئەو حیکایەتە دەگەڕێتەوە بۆ شەست ساڵ لەمەوپێش و کەسیش موتەحەیر نابێت لە حیکایەتێک، کە شەست ساڵ پێشتر ڕووی دابێت، مەگەر ئەوەی کە گێرامەوە بڵێم پاروپێرار، خەڵکی وەهان زیاتر تاسەیان بۆ ئەم حیکایەتە ڕاستییانە هەیە، کە دوێنێ پار، پێرار قەومابێ، نەک شەست ساڵ پێش ئێستا...

بە ڕەحمەت بێت دایکم قەت هیچی لێ نەشاردمەوە. حیکایەتی من وەهایە کچی خۆم:

ئەو کاتەی دایکم مامانی ناو مەملەکەتی بابانەکانە، هەمووان باوەڕیان پێیەتی و نهێنیی ژنانەی خۆیانی لا دەدرکێنن. نیوەشەوێکی پاییز دەنێرن بە شوێن دایکمدا، بۆ مامانی، ڕووداوەکە وەها دەبێت لە ماڵێکی هەژاردا ژنێک بە حەوت مانگی ژان دەیگرێت، کاتێک تەماشای ژنە دەکات، دەبینێ، حەوت کچی پەری ئاسا دەورەیان لێداوە، دەگرین و دوعا دەکەن. دەڵێن: باوکمان تەلاقی خواردووە ئەگەر کچی بێت دەیکوژێت. کاتێک میمکە جەمە پرسیارجۆ دەبێت، دەڵێت: باوکتان لە کوێیە؟ ئەوانیش دەڵێن: چوار مانگە چووەتە شام بە بەردەستی غوڵام عەلی مسگەر و نەهاتۆتەوە. ژنەی فریشتەڕەنگ



ژانە دەیگرێت و کچێکی دەبێت، بە جارێ هەر حەوت کچە دەدەنە هاڕە و گرمەی گریان، میمکە جەمە دەڵێت:

- مەگرین، من لە داوێنی خۆم منداڵم نەبووە، ئەم کچە ناو دەنێم ئەجێ و لەگەڵ خۆمی دەبەم. لای هەمووان بڵێن ژانەپێشوەخت گرتوویەتی و منداڵەی بە خنکاوی بووە.

ئیتر میمکە جەمە، کچە قوماتە دەکات، بەو نیوەشەوە دەیباتە ماڵی خۆی، بۆ سبەنێی ئەوێ جێ دێڵێت. ئاوهایە حیکایەتی من.

زۆر جار بیری ئەو حەوت پەریڕەنگە دەکەم، مەعلوم یەکیان زوڵف شۆڕ و ئەوی دیکەیان کەمەر تەنگێ و چاوخوماریێ و نازدارانی جوان بوون. بەڵام ئەمە قەدەرە و دەبێت پێی ڕازیبین، خۆ ئەستەغفیرەڵا شەڕ بە خوا نافرۆشین. من هەرگیز دایکی خۆمم نەدیتووە، بەڵام لەو دنیا میمکە جەمە بە دایکی خۆم ناو دەبەم، ئەجری بە سەرمەوەیە.

سەیروسەمەرەم زۆر بیستووە لە بارەی مامانان و بوون و نەبوونەوە. ژن بە بەرەوە جوانە، پیاو بە نەوەوە. ئەوەی کە دەبێت تاقوتەنیا بگوزەرێنێت خوای گەورەیە. زۆر ژنم دی لە داوێنی خۆی نائومێد، زۆر پیاوم دی لە پشتی خۆی دڵتەنگ، شتی سەمەرە و موجیزەم دی. بەڵام قەت ڕازی کەسم لای کەسی تر نەدرکاندووە.

ئەم شەو حیقایەتت بۆ دەگێڕمەوە، نەختێ خەم بە با بکەین و تۆیش شتێک بەیادبهێنیتەوە. دایکم دایمە هەقایەتێکی ترسناکی بۆ دەگێڕامەوە، ئەویش لە دایکی خۆیی بیستبوو. بە ڕەحمەت بێ ئامۆجیاری دەکردم، نزیک نەبمەوە لە نێرینە، چونکە بەڵان و ئابڕووتکێنن، ئابڕوو یەک قەترەیە کە تکا دەتکێ. دەگێڕنەوە، زەمەنی زوو، لە مەملەکەتێک پیاوانی ئاڵۆشاوی زۆر دەبن، بە ژن و دووانی خۆیان تێر نابن، دەست دەدەنە خراپە و پەلامار و شەروالپیسی، پیاوان هێند گیر دەبن بۆ ژنان و خوشکانیان ئەگەر خۆیانیان لەگەڵ نەبێت، هەرگیز ناهێڵێن لەناو کەژاوەشدا بچنە دەر، چونکە بە ڕۆژی ڕوون ژن لەسەر جادە دزراوە و خراپەیان لەگەڵ کردووە. دەڵێن هەر لەو شارە خراپەکارە، کە خوا پەنامان بات لە قەومی لوت خراپتر و داوێنپیسترن، پیاوێک دەبێت، پەرژینێ قایم بێ، هەموو شەو دەچێتە وێژەی کەرەکەیان. دەڵێن شەوان دوای دوو ژنەکەی ئاوقەوی کەرە دەبێت، تا کەرە ئاوس دەبێت، لەبەر ئەوەی پیاوە هەموو شەو ئاوقەی بووە دەترسێت و مامانێک دینێت تا بزانێت کەرە چی دەبێت، خوایە تۆبە کاتێک دایەنە دەبەنە ناو تەوێڵەکە ئاگای لە زانی کەرە دەبێت، دەڕوانێت جانەوەرێکی بووە، سەری کەر و لاشەی بنیام. دەڵێن پیاوە لە ترساندا، سەد دینار دەدات بە مامانە تا قسە نەکات، کەرە و کچە دەباتە، کەلاوەیەک لە دوور ئاوایی و دوو ساڵ لەوێ دایان دەنێت، تا ئەوەی کچە لە نەسلی کەرە زوو گەورە دەبێت هێندەی ماکەرێک، کچە و دایکە پێکەوە لە تەوێڵەیەک دەمێننەوە. ڕۆژێک پیاوە کچە دەباتە ژێرزەمینێک و سەری بە سەرپۆشێک دەبەستێت، بە پارەیەکی کەم پیاوانی بۆ دەهێنێتەوە... دەڵێن ئەمە تا چل شەو وا دەبێت و باسی کچەی سەر ئەستووری نەبینراو بڵاو دەبێتەوە، کە کاتێک لەژێر پیاواندا بە دەنگی گڕ ناڵە و نرکەیەتی، دەگریەت و دەکڕۆزێتەوە، پیاوان زیاتر دەبزوێن. تا شەوێک، کوڕێکی ڕێبوار ڕێی دەکەوێتە شار و یەکەم شت ئەو هەواڵە دەیبیستێت. ئەویش یەک دیناری پێیە، نۆرە دەگرێت، ئەو دەمەی دەچێتە ئامێزی، هیچ ناکات تەنیا بە کەرەی مرۆڤ لەش دەڵێت: حیقایەتی خۆتم بۆ وەگێڕە. کچەش، سەری لادەبات و هەموو شتی بۆ باس دەکات. ڕێبوارە، پیاوەی گەواد، کە حەرەسی بەر دەرکەیە بانگ و دەڵێت: دینارێکی ترت دەدەمێ بۆم تازە بکەوە. کە دێتە ژوور، دەرکەی لە پشت سەر دادەخات و خەنجەری بەر کەمەری لە دڵی گەوادەی دەچەقێنێت، سەری بە دەسماڵێک دەبەستێت و لە جێ دەیخەوێنێ... جلەکانی پیاوە دەکاتە بەر کچەی کەللەخەر و لەتەک خۆی دەیبات، دەڕوات تا دەگاتە سەر کێوێک، لە ناکاو هەورەتریشقەیەک دێتەخوار و لە کچە دەدات، کچەی کەر کەللە، دەبێتە کیژێکی فریشتەپەیکەر و گورج گیانی دەردەچێت. جا هەورەتریشقە بەرەو مەملەکەت دەچێت و شارەکە لە قەهری ئیلاهی دەبێتە قەرەبرووت.

کچەکەم؛ دایکم ئاوها نەسیحەتی دەکردم، تا خۆم بپارێزم و گیرۆدەی ماری ناو شەروالی پیاوان نەبم.

# شەوی هەشتەم

"فاذكروني أذكركم واشكروا لي ولا تكفرون بەقەرە." ئەی ئیمانداران ئەگەر یادی من بکەن، منیش یادی ئێوە دەکەم و سوپاسگوزاری من بن، سوپاس ناپەزێر و سپڵەیی بەرامبەرم مەکەن.
سڵاوی خوا لە جەنابت و سەرجەم بوونەوەرانی کەون و کائینات، کە بەبێ ناو و یادی ئەو، فێری غەفڵەت و ڕووکەشگەرایی دنیا دەبین و فریوخواردووی شەیتان دەچینەوە. بە ناوی هو، مەجلیسمان دائەمەزرێنین تا قسەی دنیایی ڕووڕەشمان نەکات و سینەی بێ کینەمان تووشی لەکە نەکات.
حەوت موریدی تەکیەی گەیلانین، هاتووین لە مەجلیسی عارفان، باس و خواسی شێخان و زاهیداندا بەهرە لە یەک بەین و ئیشەڵا بە باسی پیاوساڵحان و مەجلیسی ئەولیایان دەروون و زەینی تۆیش موشەڕەف بێت.
هەریەکەمان و سەربهووردی خۆمانمان هەیە، ئیشەڵا خوا یاربێت، بۆیەکی نەقڵ دەکەین. برایانم هەقی یەکەمیان بە من دا، بۆیە بە زیکری"لا إله إلا الله" کە هیچ کەس شیاوی پەرستن نییە، خودا نەبێت، ئەو خودایەی ئاسمانی بۆ هەڵواسیوین و زەوی بۆ ڕاخستووین. بە زکری لا ئیلاهە ئیللەڵا دەست پێدەکەم و خۆم دەناسێنم. خەڵکی مازەندەرانم، یەزدانی مازەندەرانییم پێ دەوترێت. لە موریدانی حەزرەتی غەوسی گەیلانیم قدەسەڵاهو سیرەهو.
واز لەو قسەوباسە باوەی نێو مەملەکەت دەهێنین و خۆمانی لە قەرە نادەین. موریدانی وەک من و هاوەڵانم، هەموو ژیانمان بە حیکایەتەوە پەیوەستە، چەندەها جار پێکەوە باسی ئەوەمان کردووە. ئەم شەو من حیکایەتی خۆم نەقڵ دەکەم.
حەکایەتی من دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی دایک و باوکم بوو بە شەڕێکی قورسیان و باوکم وتی سەری خۆم هەڵدەگرم و نایەمەوە، باوکە ڕۆیشت و سێ مانگ دیار نەبوو، من و دایکم لە تاوا عەرزمان بە خۆمان نەدەگرت، ئەودەم تەمەنم سیانزە ساڵ بوو، دایکم وتی: وەرە بچین بۆ زیارەتی خەیرونیساء ئەمشەو هاتوتە خەوم وتوویەتی: ئەوە بۆ سەرم لێ نادەی، منیش وەختێ جۆیای ئەو شەخسە بووم و دایکم وتی: ژنە، حەپەسام. چۆن دەبێت بچینە زیارەتی ژن، لە کەسم نەبیستووە شێخ، ژن بێت و قیسن و گومەزی هەبێت. دایکم چارشێوی لە خۆی پێچاو منی پێش خۆی دا بۆ سۆمەعە، چووینە زیارەتی ئەو قسنەی لەناو کوچەیەکی تەنگەبەردا بوو، زیارەت و نزامان کرد، دایکم حیکایەتی ئەو ژنەی ناوی سەیدە فاتیمەیە و دایکی گەورەترین فریادڕەسی دەروێشان و موریدان و عارفانە، بۆ گێرامەوە. ئەو هەمیشە بە تەسبیحەکەی فاتیحای بۆ دەخوێند، خۆی ئەو موریدی ئەو دەزانی.

شەهرەزاد خانم؛ دایکم بۆ یەکەم جار حیکایەتی شێخی گەیلانی و چل دزەکەی بۆ گێڕامەوە، کە منی کرد بە موریدی ئەو شێخەی، بە غەوسی سەقەلەین ناسراوە.
خانم کاتێک دایکم حیکایەتەکەی بۆ نەقڵ کردم، من خۆشم ویست، بە دڵ و دوایش بە ئەتوار بوومە شوێنکەوتووی. دایکم شەوانە بۆ ئەوەی بخەوم، لە بارەی شێخی گەیلانییەوە حیکایەتی تری بۆ دەکردم و هاواری لێ دەکرد، دەیوت غەوسی ماڵ لە دوور، وەلێ من تێنەدەگەیشتم. حیکایەتەکە وەها بوو:
وەختی خۆی لە گوێ ئاوی دیجلە، پیرەژنێک هەموو بەیانییەک دەمەوەختی خۆرهەڵاتن تا دەمەو مەغریب تەماشای ئاوەکە دەکات و قوڵپ قوڵپ دەگری. ئەوانەی لەوێن دەڵێن: حەوت ساڵە ئەمە حاڵی ئەو ژنەیە. ڕۆژێک شێخ لەوێوە دەڕوات و چمکی عەباکەی شانی بەر پیرەژنە دەکەوێت، یەکسەر هەڵدەستێ و دەڵێت: هەبێ و نەبێ تۆ شێخی گەیلانیت. دەست بە چمکی عەباکەیەوە دەگرێت تەڵەبی زیندووکردنەوەی کوڕ و بووکەکەی لێ دەکات. لەوێدا جەنابی شێخ لە ماسیگرێک دەپرسێت حاڵ و مەسەلە چییە؟ کابرای ماسیگر دەڵێت قوربان، حەوت ساڵ لەمەوبەر ئەم پیرەژنە، بووکی بۆ تاقە کوڕەکەی هێنا کە بە بێوەژنی بەخێوی کردبوو، زەماوەند و گۆڤەندی لەناو کەشتییەکدا بۆ ڕێخستن تا بڕۆنە ئەوبەر ئاو، کەچی تۆفان و لافاو هات کەشتییەکەی نغرۆ کرد. ئەم پیرەژنە حەوت ساڵە کاری شیوەن و زارییە، دەڵێت: غەوسی گەیلانی هاوارە بۆم بهێنیتەوە. ئەوە جەنابتان تەشریفتان هاتووە، قوربان پێی بفەرموون شتی وا مەحاڵە، پیرەژنە چمکی عەبا قاوەییەکەی شێخ دەگرێت و دەڵێت:
– ناهومێدم مەکە، کوڕ و بووکەکەم بۆ زیندوو بکەوە.
دەڵێن: شێخ لەوێدا عەباکەی ڕادەخات، دوو ڕکاعەت نوێژ دادەبەستێت و سوجدەیەکی درێژ دەبات، هێندەی پێ ناچێت تۆفانێ لە دەریاوە هەڵدەستێت، کەشتییەکی لێ یەتەدەر کە پڕە لە خەڵکی زەماوەندکەر و بووک و زاوایەکیشیان لە ناودایە، ئیتر پیرەژنە خۆی ئەیات بە قاچی شێخدا و دەڵێت:
– تۆ فریادڕەسی من بوویت.
دایمە دایکم، کە ئەم حیکایەتەی بۆم دەگێڕامەوە دەگریا، دەیوت: وەک پیرەژنی گوێ شەتەکە دەپاڕێمەوە، هۆ غەوسی ماڵ لە دوور.
من وەها شەیدای بووم و هەستام چوومە بەغدا، شەوێک بەر لەوەی بگەمە ناو شاری بەغدا، قەتار و قافڵە لە خانێک لاماندا بحەوێینەوە، ئەو حەزرەتە ڕۆحم بە فیدای بێت هاتە خەوم. زاتێکی باریک ئەندامی، باڵاناوەندی، سینەپانی گەنمرەنگ بوو، ڕیشێکی درێژ و بڕۆیەکی پەیوەستی هەبوو. چاوەکانی گەورە و ڕەش بوون، سیمانوورین و دەنگی زوڵاڵ بوو، ویقارێکی هەبوو، پیاوی خۆی دەویست تەماشای کات! تەشریفی هاتە بەردەمم و فەرمووی:
– ڕۆڵە بەخێربێت بۆ ژێر سایەی تەریقەتەکەی من!
خودایە لە شیرینی ئەو خەوە چیم لێ نەهات، بەیانی زوو پێش بانگ وەخەبەر هاتم، بە پێخاوسی و بە غار و نەشارەزا، بەرەو شار بۆ زیارتی ئەو زاتە ڕێکەوتم. گەیشتمە مەرقەدەکەی و بە خزمەتی گەیشتم. ئیتر هەر لەوێش خۆم کرد بە موریدی و قەولم دا تا ئەبەد موریدی ئەو بم.
لە گەڕانەوەمدا ڕێم کەوتە ئەم شارەی تۆ، تەکیەی گەیلانیم دۆزییەوە لەگەڵ براکانم بۆ پاکردنەوی نەفس و گوناهەکانمان

خەریکی تاعەت و عیبادەتی ئیلاهین. شێخی مەزن بەرنامەی یادکردنەوەی خودای بۆ داناوین، کە حەوت زیکرە و من بە زیکری لائیلاهەئیلەڵا دەستم پێکرد، پاکەرەوەی نەفس و هەوای "متمەئینە"یە. حەزرەت لە کتێبی فەتح و الربانی دا ئامۆژگاریمان دەکات، بۆ پاکردنەوەی نەفس تا بتوانین بەشە پەنهانییەکەی وجود ببینین. خۆ تا ئەو پەردانەی نەفس نەدرێنین و لە ناویان نەبەین توانای وەها کارێکی گرانمان نییە. دەفەرمووێت:

ئەی غوڵام، تەماشای سەنعەتی ئیلاهی بکە تا بگەیت بە سانع، خواپەرستی عارف دوو جۆر بینینی هەیە، یەکێک زاهیر و ئەوی دی باتن. بە چاوی ڕوو کە زاهیرە ئەوی خودای پەروەردگار ئەفراندوویەتی دەبینێت و بە چاوی ناوەوە، تەماشای شتە سەیرەکانی دنیای باڵا و عەلەوی دەکات تا هەموو پەردەکان لەبەر چاویدا وەلاکەون و بگاتە پلەی نزیکی لە خوداوەندەوە. چونکە هیچ شتێک لە کەسی نزیک و خۆشەویست ناشارێتەوە، ئێوە بە دیدی ناوەوە تەماشا کەن، لە ئیلاهی نزیک بن تا هیچیتان لێ نەشارێتەوە. کاتێک پەردە تاریکەکان لە دڵی خوداپەرست هەڵدەگیرێت لە تەواوی هەوای نەفسانی و شەیتانی ناوەوە ڕووت دەبێتەوە، ئەودەم گەنجینەکانی غەیبی دەکەوێتە دەست.

شێخی مە وەها ئامۆجیاریمان دەکات، بۆیە ئێمە دەمانەوێت ئەو پەردانە لابەین ڕووت بینەوە لە هەر پەردەیەک، ئەوەش بە زیکری ئیلاهی دەبێت. شێخی گەیلانی موریدی لە هەموو ڕۆژهەڵات زەمیندا هەس.

حەقایەتی زۆر هەن لە بارەی شێخی گەیلانییەوە، کە دەزانم مایەی شیفایە بۆت. دەڵێن: وەختی خۆی لە هیندستان ئافرەتێکی موریدێکی شێخ، کە لە ڕێی خەلیفەکانییەوە تەریقەتی وەرگرتووە و هەرگیز بە خزمەتی شێخ نەگەیشتووە. ڕۆژێک پیاوێک دێتە وێزەی و دەیەوێت تەعەدای لێ بکات، ژنە نازانێ چی بکات، هاوار بۆ عەبدولقادری شێخی مەزن دەبات و دەڵێت: یا غەوسی بەغدا بگە دادم. دەڵێن لەو کاتەدا، عەبدولقادر لە شاری بەغدا گوێی لێ دەبێت ڕادەچڵەکێ، تاکێکی قاپقاپەکەی دەگرێتە پیاوە لە هیند، بەر پیاوە دەکەوێت، پیاوە لە ترسا تووشی پەرکەم دەبێت. شێخ ئێستا دەروێشەکانی لە ڕاجستان و دلهی زۆرن، کاتێک دەچنە زیارەتی نزرگەکەی، نەزر دەکەن نزیکەی حەوت شەو بە پێی پەتی و بە هەڵکردنی بەیداخی سەوزەوە بچنە خزمەتی. دەڵێن یەکێک لە کوڕەکانی بە ناوی شێخ عەبدولعەزیز لەم ئاکرێیەیە و زۆر کەس دەچنە زیارەتی.

دۆستانمان هەموو حیکایەتی شێخی سەنعان و کچەی گاور و تەرسایان بیستووە. حیکایەت ئەو شێخی سەنعانە دەگەڕێتەوە بۆ شێخی شێخان. دەڵێن وەختی خۆی کاتێک شێخ خەون دەبینێ پێغەمبەر سەڵات و سەلامی خوای لێبێت کردوویەتی بە جێگری خۆی، بەوەش مەقامی لە وەلییەوە دەچێتە مەخدەع، کە بە مانای سندووقی ئەسرار دێت و لە وتارێکدا دەڵێت: (پێی من لەسەر شانی شێخانە) وەختێک لە باتنەوە ئەوە دەگات بە قوتبی میسر دەڵێت:

- ئەوە قبوڵم کرد.

شێخی یەمەن دەڵێت:

- بە ئیفتیخارەوە.

پیری شیراز دەڵێت:

- ئەمە گەورەییە بۆ من.

شێخان بە دڵ و بە گیان قبوڵی دەکەن، بەڵام کاتێک شێخی سەنعان کە هەشتا هەزار موریدی هەیە، بە زاهیر دەیبیستێت،

دەڵێت:
-من خۆم شێخ، هیچم لەو کەمتر نییە!
جەنابی شێخ ئەمە دەبیستێت، دڵی گەرد دەگرێت و دەڵێت:
- باشە پێی بڵێن قاچی من نا، قاچی بەرازان لەسەر شانی بێت.
ڕاوی دەڵێن: شێخ کە تەمەنی لە پەنجا ساڵ گوزەرابوو. ڕۆژێک لەتەک موریدانی لە ڕێی چوونە حەج لە دەشتێک چاوی دەکەوێتە کیژە فەلەیەکی چاوخوماری و زوڵف لوولی قەدباریک، شێخ دەیبینێ حەیرانی دەبێت، موریدان حاڵی شێخ دەبینن و شەرمەزار دەبن، شێخ دەڵێت:
- موریدان بڕۆن، داغداری زوڵفی جانان و شیفتەی ئەبرۆی گاورانم، من تووشم بووە بە تووشی ئەم دڵڕووبایەوە.
شێخە دەچێتە بەرەوە لێی و ڕازی دڵی خۆی بۆ کیژە دەدرکێنێت، ئەویش بە غەمزەیەکی وەهاوە تەماشای دەکات، شێخ هێندەی تر گیرۆدەی شکەنجی زوڵفان دەبێت، دەڵێت:
- پیری وەکو تۆ چی داوە لە من، ئەمن چی لە تۆ بکەم؟ شێخ دەکەوێتە گریە و زاری و تکا و پاڕانەوە و شیعر و شانامە، کیژە دەڵێت:
-وەرە حەوت ساڵان ببە بە شوانی بەرازانم، ئەوجا دەبمە دڵدارت.
وەڵا شێخە لەوێ عەبا و عەمامە توڕ دەدات، زنار دەبەستێتە پشتی و موریدان ئیزن دەدات. موریدان دەست بە شین و زاری و واوەیلا و باوکەڕۆ دەکەن. تازە کار لە کار ترازاوە. شێخەی ماڵ لە قوڕنراو، دەچێتە سەر دینی کچەی تەرسا دەبێتە شوان، ئەوسا چل موریدی زۆر دڵسۆزی نەبێت، موریدان تەفرەقەیان تێدەکەوێت و بڵاوە دەکەن. ئەم چلە دەمێننەوە و شەو و ڕۆژ دوعای بۆ دەکەن. ڕۆژێک موریدان کۆ دەبنەوە، تەکبیر دەکەن بچینە خزمەت غەوسی بەغدا و تکا لەو بکەن. ئەوسا دێنە خزمەتی، حاڵ و مەسەلەی عەرز دەکەن، دەڵێن: قوربان ئەوە حەوت ساڵە نەهاتوتەوە، بە جەزای خۆی گەیشت، کەرەم کە و لێی خۆش بە. ڕاوی دەڵێن: شێخ عەباکەی خۆ دادەکەنێت و دەڵێت:
- بۆی ببەن، بیدەن بە شانیدا تا هۆشی دێتەوە.
چل موریدەی وەفدار هەڵدەستن دەچنە دێر و لەوێ شێخیان بە مەستی دەبینن، عەباکە دەدەن بەسەریا، هێند نابا شێخی سەنعان قوڵپ قوڵپ دەداتە گریانی وەکوڵ و یەخەی خۆی دادەڕێ، ڕادەکاتە گوێ ئاوەکە و وسڵ و تۆبە و ئیسیغفار دەکات. کاتێک کچە ئەمە ئەبینێ ئەویش وسڵ و تۆبە دەکات و لەگەڵ چل موریدە دەچنە حەج، دوای ئەوەی فەریزە بەجێ دەهێنن هەرتکیان گیانیان دەردەچێت.
شێخی ئێمە جڵەوی نەفسی بەدکارمانی کردووە، تا شوێن هەوا و هەوەست نەکەوین، خوا پەنامان بدات. لەسەر فەرمایشتی بە سەد هەزار جار گوتنی لائیلاهە ئیلەڵلا ڕێگای دووری دەروێشی خۆمان دەست پێدەکەین، تا هەوا و نەفسی (ئەمارە)مان لە کوڵ بێتەوە، ڕێگای گەیشتن بە حەق دوورە و ناکرێت ئەو هەموو کوڵەبارەمان پێ بێت، شێخمان حەوت کوڵمان پێ فڕێ دەدات تا ڕێی دوورمان بۆ نزیک بێتەوە. خودای موتەعال لە سورەی یوسفدا دەفەرمووێت: "نەفس زۆر فەرماندەرە بە گوناهـ و هەڵە و تاوان" شێخی ئێمە ئەو دێوە ئەمرکەر و فەرماندەرەی بەسەر کوڵمانەوەیە بەم زیکرە، دادەگرێت. وتنەوەی ئەم یادە دەڵێینەوە، دەبێت بە دڵ بێت، تا بە دڵ نەبێت نیشانەکانی دەرناکەون، دەروێش

خەون دەبینێ، خەونی سەیر سەیر، بە بەراز و سەگ و فیل، گوێدرێژ، مار دووپشک، ئەسپێ و کێچ و مشک و ئاوی مەنگ و ئاوی ڕۆیشتوو، حەشیە و ئەفیونەوە دەبینێت. هەر یەک لە خەوەکان نیشانەی سیفاتێکن و دەروێش دەبێت پرس بە شێخ یان بە خەلیفە بکات، تا خەوەکەی بۆ لێک بداتەوە و ڕێنمایی بکات. ئەگەر مورید لەم نەفسە ڕزگاری بوو، ئەوە بەرەو خودا دەڕوات.

خاتوون تۆیش ئەم زیکرە بکە، تەسبیحێک بگرە دەستت و چاو بنوقێنە، دڵت بە شەوقی بەرەو حەق چوون گەرم دەبێت، بەرەو زمانگۆکردن!

# شەوی نۆیەم

بە ناوی ئەڵڵا دەست پێدەکەم، وەک چۆن لە مەجلیسی دوێشەو بە ناو و زیکری لائیلاهەئیلەڵڵا برامان یەزدانی مازەندەرانی دەستی پێکرد. ئەمشەو لە خزمەت ئەو و دۆستان و جەنابتدا، مەجلیسمان بە باسی زانایان و دانایان دەرازێنینەوە. بە ناوی ئەڵڵا کە شێخمان دێوی دووەمان بە وتنەوەی حەفتاوهەشت هەزار و هەشتاوچوار جار، ئەڵڵا لە کۆڵ دادەگرێت و بە بارسووکی تر بەو کێوە بەرزەیا بۆ لای هەڵدەگەڕێن.

ئەم دێوە نەفسی (لەوامەیە)، ئەو نەفسەی لە قورئانی موبارەکدا خوا بە زاری خۆی قەسەمی پێ دەخوات: "سوێند دەخۆم بە ویژدانی زیندوو و نەفسی ڕەخنە لە خۆگر کە لۆمەی خۆی دەکات". جێی ئەم نەفسە ناو دڵە، ڕەمزی زەردە، مورید ئەگەر پاکبووەوە لە لۆمەکردن، عجوب، تێفکرینی خراپ، ئیعترازی نابەجێ، ئەوا ڕەنگی زەرد دەبینێت. پێش ئەوەی ئەم ڕەنگەش ببینێ لە دەمەوەختی زیکروفیکردا، خەونی نەوعاونەوع دەبینێ، وەک مانگا، مەڕ، حوشتر، هەنگ، ماڵ و کۆشک و مۆمی بێ گڕ، کەپر، هەنگوین و شەربەت، کە شێخ لێکی دەداتەوە و ڕێنمایی موریدی دەکات. باشترینیان ئەوەیە خەو بە ماڵ و کۆشک و کەپرەوە ببینێ، نیشانەی داسکنانی دڵی موریدە. مورید دوای کوشتنی ئەم نەفسە، بەرەو خودا دەچێت، بەرەو بەرزەخ، مەیلی بۆ سۆفیگەریی زیاد دەبێت، لە شەریعەتەوە دەچێتە تەریقەت.

ئاە لە یادم نەبوو، بەندە ناوم دەروێش مینەی مسگەرە، لە دەروێشەکانی تەکیەی گەیلانیم ڕۆحم بە فیدای بێت. پێش ئەوەی بێمە ئێرە یەکێک بووم لە دەروێشەکانی قاپی کەسنەزان. هیچیان فەرقیان نییە، وەلێ من دەروێشی شێخ کاکەحەمەی خاکنیشین بووم. گیانم بە فیدای بێت، شێخی وا کەی لە دنیادا هەیە. یەکەمجار لە دەشتی گەرمیانەوە لەگەڵ باوک و دایک و دوو خوشکی بچووکما بە قافڵە و وڵاخ، پیر بە سوار و گەنج بە پیادە بە دوو ڕۆژ گەیشتینە کربچنە، بە قەتار و قۆتر و مەلۆتکەوە شەوێ لای گردەکە ئۆقرەمان گرت، بۆ بەیانی ڕۆژی دووەم کەوتینەوە ڕێ، ئیتر هەر قافڵە بوو بەرەو ئەوێ دەهاتن، ژنانی شار و پیاوانی بارزگانیی کەمەندکێش، هەبوو خەوی دیبوو، شێخ وتبووی وەرە سەردانم. حاجییەکی بازرگان بە قافڵەی دوو خوشکی پیری شوونەکردووی و خێزانەکەیەوە، لە ڕێ بوون، حاجی سێ شەو لەوەو پێش خەوی دی بوو، دەیوت تازە لە بەغدا گەڕاوەتەوە، لەوێ حەکیمێکی دۆزیوەتەوە ژنەکەی چارە بکات، بەشکو ئەمە خوایە بکەوێتە سکوزا و خوا ڕۆڵەیەکیان پێ کەرەم کات. شەو کە دەخەوێت، شێخی خاکنشین دەچێتە خەوی و دەڵێت:

– ڕۆڵە ئەو پارەی ئەیدەی بە ڕێی بەغدا، ڕوبعێکی بدە بە قەند بۆ دەروێشەکانی تەکیە، ئیشەڵڵا خوا مورازت حاسڵ

دەکات.
بەیانی بەخەبەر دێ، بۆ خێزانی دەگێڕێتەوە، ئەویش دەڵێت: پیاوەکە دشەکانم دنیادیدەن با بچین بۆیان بگێڕینەوە بزانین تەکبیر چییە. وەختێک بۆیان باس دەکەن، دەگرین و دەڵێن: باوکیان وەختی خۆی دەروێشی شێخان بووە، دوایی دڵی ڕەنجاوە، ئیدی هەرگیز باسی نەکردوون، با قافڵە ڕێ خەین و ئەم چوار شەممەیە بچین. بارێک کەڵلەقەندی پێوو، وەختێ گەیشتین، شێخ پێی فەرموو کەمەندکێش؛ مورازت حاسڵ دەبێت، بڕۆ قەندەکەت بشکێنە ئەم شەو کوڕی زیکرە با بخورێت. پیاوەی بارزگان کە لە ماڵ قەرەواش و کارەکەری هەبوو، مشکی و ڕەشتی لێداگرت، دوو تاق خەریکی قەند شکاند بوو. دوایی شێخ بانگی کردن، پێی فەرموون:
- دەبنە دەروێش؟
ئەوانیش وتیان:
- قوربان ئێمە خۆمان خستۆتە ماڵەکەی جەنابتان.
شێخ تەریقەتی دادان، ئەویش بە وتنەوەی ناوی سیلسیلەی شێخان لە قەیمەوە تا دەهاتە دەستی شێخ، دەست بە دەست ئەم تەریقەتە گەیشتبوو، هەر ئەوکات خەلیفە وتی قوربان دەستەیەک لە پیر و جەوان لێرەن با ئەوانیش بە یەک جار تۆبە دادەن، پیاوان لە سەفی پێشەوە و ژنان لە دواوە، دەستەیەک منداڵیش، دانیشتین لە خزمەت شێخ و بۆ یەکەمین جار لەگەڵ پیاوەی بازرگان و ژنەکەی تەریقەتمان وەرگرت. شێخ فەرمووی هەرچیم وت بیڵێنەوە، پارچە پارچە، ئێمەیش دەمانوتەوە:
ئەم تەریقەتە خوای تەعالا لە تەرەف حەزرەتی جوبریلەوە بە خەڵات ناردی بۆ پێغەمبەر (سەلەڵاهوعەلەیهی وەسەلەم)، ئێمەیش سەندمانەوە، لە حەزرەتی ڕەسولەڵاوە هاتە سەر دەستی حەزرەتی عەلی شێری خودا، ئیمامی حسین و ئیمامی زینەلعابدین، ئیمام موحەمەد باقر، ئیمام جەعفەری سادیق، ئیمام موسای کازم، ئیمام عەلی ڕەزا، شێخ مەعروفی کەرخی، شێخ سیری سەقەتی، شێخ جونەیدی بەغدادی، شێخ ئەبوبەکری شیبلی، شێخ عەبدولواحیدی یەمانی، شێخ ئەبو فەرەجی تەرتوسی، شێخ عەلی هەکاری، شێخ ئەبو سەعیدی مەخزومی، شێخ عەبدولقادری گەیلانی، شێخ عەبدولرزاق، شێخ داودی سانی، شێخ محەممەد غەریبوڵڵا، شێخ عەبدولفەتاحی سیاح، شێخ محەممەد قاسم و شێخ حسین بەسرائی، شێخ ئەحمەدی ئەحسائی، شێخ ئیسماعیلی ولیانی، شێخ محیەدینی کەرکووکی، شێخ عبدولسەمەدی گڵەزەردە، شێخ عبدولقادری قازانقایە، شێخ عەبدولکەریمی شاهی کەسنەزانی، شێخ عەبدولقادی مولەقەب بە شێخی موهاجیر، هاتە ئێرە.
"کە شێخ مەقسودی جەنابی خۆی بوو" ئەوسا فەرمووی بڵێن: قبوڵمان کرد، ئێمەیش بە یەک دەنگ، ژنان و پیاوان منداڵ پێکەوە کە سام، ترس، لەزەت گرتبوویني وتمانەوە قبوڵمان کرد. فەرمووی ڕۆڵە ئێوە لە ئەڵقەی تەریقەت دان و خودا دەتان پارێزێت، بچن بۆ لای خەلیفە با ڕێنماییتان بۆ زیکر و ویردخوێندن بکات.
ئینجا شێخ دەستی برد حەوت دەنک خورمای هێنا، ویرد و دوعای بەسەردا خوێند، بە بازرگانەی فەرموو، ڕۆڵە سێ دەنک و لەتێک تۆ و سێ دەنک و لەتەکەی تری خێزانت، بیخۆن و یەکی دە تەسبیح سڵاوات بخوێنن، ئینشائەڵاهو تەعالا وەجاختان ڕووناک ڕادەگیرێ.
ئاوها بوو ئێمە بووینە دەروێشی کەسنەزانی و شێخی خاکنیشین، کە دەڵێن خۆی و براکەی بە ناوی شێخ عەبدولکەریم

ڕاوی دێوان و جنۆکانیان کردووە. پێشتر تەریقەتەکەمان قادری بوو، ئێستە قادری کەسنەزانییەوە، وەختێ لە خەلیفەمان پرسی، بۆی گێڕاینەوە :
وەختێ خۆی شێخ کەریمی کەسنەزان، خوا لێی ڕازی بێت، هەر خەریکی تاعەت و عیبادەتە و ڕۆژ بە ڕۆژ مات و بێتاقەتتر دەبێت، شەوێک خاتوو حەلیمەی خێزانی لێی دەپرسێت، قوربان بۆ حاڵت وەها زار و نەزارە؟ ئەویش ئەفەرموێت، ئافرەت لێرە عیبادەت ناکرێ، لەناو جێی گەرم و خواردنی خۆش و ژن! دەبێت بڕۆم، تا نەنێرم بۆ لات و نەڵێم کراسم بۆ بنێرە، بە خراپ و باش ناوی منت لە زار نەیەتە دەر، کەس نازانێ دەمرم یان دەژیم، ئەگەر نەهاتمەوە، تەلاقی خۆتان وەرگرن و شوو بکەنەوە، خاتوو حەلیمە فرمێسک بە چاویا قەتارە دەبەستێت، پریاسکەیەک دێنێ، نەختێ نانەوردەی و بڕێک خورما ڕەقەی لەناو دەنێت و ماڵاوایی لێ دەکات، شێخیش بە کێوی گێلاناوادا سەردەکەوێت. لە کێوان و لە چاوان ون دەبێت، چل چلە دەکێشێ. موریدان دەڵێن شێخی ئێمە ون بووە و کەس نازانێ چی لێهاتووە، لە دێهات و لە شاران بۆی دەگەڕێن، کەس سۆراغی نازانێت. چی دەروێشی هەیە لە گوندان و لە شاران بە بیستنی هەواڵی ون بوونی، دەست دەکەن بە شین و گرین و دوعا و پاڕانەوە لە دەرگای یەزدان کە شێخیان کەسنازانێ چی لێهاتووە. پیاوانی مورید ڕۆژ بە دێهات و شەو بە کێوانەوە بانگ دەکەن هۆ شێخی کەسنەزان تۆ لە کوێی. هیچ، دەنگ و باسی شێخ ونە و کەس نازانێ ماوە یان مردووە. تا ناچار پرسە و تەزیەی بۆ دەگرن. ڕۆژ دێت و ڕۆژ دەچێت، هەندێک دەڵێن خەلیفەیەک هەندێکی تر دەڵێن شێخی برای خەو دەبینێ، لە خەونیدا شێخ پێی دەفەرمووێ، من ماوم و نەمردووم، بەیانی زوو کەشکۆڵ هەڵدەگرێ و بەرەو کێوان دەچێت، هێند دەگەڕێت تا دەیدۆزێتەوە، دەیبینێ شێخ کەریمەسوورەی ئاوێنەڕوو، مشتێ ئێسقانە لە دەستێ کەواو و سەڵتەی پۆرتکاودا، کە خەریکە هەڵدەوەرێ، خەلیفە دەڵێت: قوربان خەوم دیوە و هاتووم بتبەمەوە، دەروێشان و خاوخێزان پەرێشان و سەرگەردانن، وەک مەڕی بێ شوانان چاوەڕێی تەشریف هێنانەوەی جەنابتن، دەستم بەرێ با بڕۆین. شێخ پێی دەفەرموێت، سەبر کە سەبر، نەفسێ ماوە تا ئەویش نەکوژم، نایەوە.
خەلیفە بەلایەوەیە دەمێنێتەوە تا لە تاعەت و عیبادەت و ویرد و سوجدەی شەو و ڕۆژی تەواو دەبێت، جا دەیدا بە کوڵیدا بۆ ئاوایی، لە ڕێ شوانێکیان پێدەگات، شێخ دەفەرمووێ هەواڵی هاتنەوەم دەبێت حەلیمە بیبیستێ و بڵاوی بکاتەوە، بڕۆ بڵێ شێخ ناردوویەتی بۆ دەستێک کەوا و سەڵتە. شوانە دەگاتە دێ و عەرزی خاتوو حەلیمە خان دەکات، هەمووان دەڵێن: ئەمە شێت بووە، خاتوو حەلیمە دەستێ کەوا و سەڵتەی شینباوی بۆ لە بوخچە دەنێت، بە دەنگی بەرز سڵاواتێک دەدات، دەڵێت:
-مژدە بێت، موریدان شێخی کەسنەزان زیندووە.
شوانە بوخچە دەبات و شێخ دەگۆڕن و دەیهێننەوە، دەڵێن ئەو بەرگە پواوەی شوانە هەڵی دەگرێت و بەرکەت لە ماڵی نابڕێ، هەر کەس نەخۆشی بێت پارچەیەکی بۆ لێ دەکاتەوە لە ژوور سەری دەنێ و چا دەبێتەوە.
ئیتر وەها بوو شێخ ناسرا بە شێخ کەسنەزان، دەڵێن کە هاتۆتەوە گەورەترین کوڕی زیکر بەستراوە، دە هەزار مورید بە جارێ پرچیان ڕاوەشاندووە و حەی ئەڵلایان گوتووە. خەلیفە بۆی گێڕاینەوە شێخ هەتا عەمری خوایشی کردووە، هەموو عەسرێ بە زکری عەسران، ئاگری تێبەربووە، کە ئاویان پێدا دەکرد دەبووە هەڵم. دەڵێن:
- مار و دووپشک لە ئیجازەی ئەوا بووە. دەڵێن:

– دایمە فەقیانەی سپی دەبەست و دەستێ جلی قاوەیی دەپۆشی، فەرووەیەکی ئەستووری بە شاندا دەدا و عەسایەک نەخش ماری بە دەستەوە بوو، چاوی دادەخست و تەسبیحاتی دەکرد، خەریکی کاری باتنی بوو، کاری زاهیری و ڕێنمایی دەروێشانیشی دابووە دەسەت خەلیفان.
ڕۆحم بە ساقەی بێت، وەختی خۆی شێخ دەچێتە خەونی شاهی ئێرانزەمینەوە، ئەویش کەمندکێش دەبێت و مەرقەد و مزگەوتێکی شاهانە لە دێیەکە دروست دەکات.
دەڵێن وەختی خۆی، شاقادر، بە دەروێش و خەلیفانی دەڵێت:
– ئەوا من ڕۆژێک دەمرم و دەچمە جێی هەق، دەبێت تەریقەتەکە بدەمە دەست یەکێ لە کوڕەکان کە کوێری نەکاتەوە، ئێوە تێفکرن، چ کوڕێکم تاعەت و عیبادەتی کرد، ئەوە ئەو دەبێتە جێنشین.
خەلیفان دەکەونە تاقیبی کوڕان، دەبینن هەموویان تاعەت و عیبادەت دەکەن، وەلێ دەڕوانن شەو پێش خۆرکەوتن، کاکە حەمەی چاو عەسەلی تەخت دەموچاو پانی لووت بەرانی، لەبان گوێسەوان لەسەر قاچێ وەستاوە و ڕوو لە قیبلە سەڵەوات دەدا، ئەوکات خەلیفان دەچنە خزمەتی و دەڵێن ئێمە موخلیسین، بەو تەرزە شێخی ئێمە دەبێتە جێنشین. ڕۆحم بە فیدایان بێت شاهانی کەسنەزانی، موریدی وەهایان هەبوو، لەوانەی کە دەڵێن خوا لەبەر یەک دانەیان حەفتا گوناهبار لە جەهەنەم دەبەخشێ. باوکم بۆی گێڕامەوە ئەویش باوکی بۆی باسکردووە. وەختی خۆی مەلا مەحموودە ڕووتە دەروێشی کەسنەزانییەکان دەبێت، دایمە یەک دەرپێی خامی سەرخەرمان و فانیلەیەکی لەبەر دەبێت، عیبادەت و تاعەت دەکات، چلە دەکێشێ و ڕیازەت دەگرێ و نان و ئاو نەبێت زەوا ناچێتە دەمی، دەڵێن شێخ حسینی بۆ خوا سووتاو ڕۆژێک مەلا مەحموود بانگ دەکات و پێی دەفەرمووێ:
خولە گیان ژن بێنە و با منالت بێ، تۆ منالەکانت ئەولیا و کچ و کوڕی بە حیکمەت ئەبن، بۆ ڕێنمایی خەڵکان. مەلا دەڵێت:
قوربان من و ژن و ماڵیان نەوتووە من عیبادەت دەکەم، شێخ دەڵێت خۆ بە دەستی تۆ نییە، تۆ کوڕمی کوڕ لە قسەی باوکی دەرناچێت، مەلا ئەفەرمووێ من بچووکتم. ئینجا دەنێرن ئامینە خاتوونێکی پاک سروشت، مارە دەبڕن لە مەلا، شێخ لە ماڵی خۆی خێزانی دەنێرێت جل و پۆشاکی بۆ دەکەن، بووکە بەڕێ دەکەن. دەڵێن: مەلا مەحموود ئەو شەوە دەنگی نەکرد کە بووکی دی لە کراسی کەتانی گوڵگوڵی و کەوای ئەتڵس و هەوری و کوڵوانەی جورجێتدا، سبەینێ ڕووی لە خاتوو ئامین کرد بە زارێکی شیرین و ویردخوێن، جا قسەیەک لە دەمێکەوە بێتە دەر کە بێ لە ناوی خوا هیچی بە زاردا نەهاتبێ، دەبێ چەند لەتیف و حەنیف بێت و دەڵێت:
ئامە گیان، خودات خۆشگەرەک یان من؟ خاتوو ئامینەش دەڵێت: تۆم خۆشدەوێ، بەڵام خودا زیاتر، مەلا پێی دەڵێت ئەم جلانەت لەبەر من کردووە، من نامەوێت و تۆم بێ ئەوانە دەوێ، ئەگەر خوات خۆشەوێ مەیکە، ئەم جلە بە باق و بریقانە هیی کەسانێکە چاویان لە ماڵی دنیا بێت، نەک ئاخیرەت، ئامە گیان تۆ ماڵی دنیات لا خۆشەویستە یان ئاخیرەت؟ خاتوو ئامیش دەڵێت ماڵی دنیا هیچ نییە و فانییە، ماڵی ئاخیرت نەوڕاوە. مەلا دەڵێت بەیانی دەنێرم بۆ شار جلت بۆ بێنن، دەنێرێت دوو دەست کەوای فاسۆن و سەڵتە و هێلەک و کراسی لە خومکراوی بۆ دێنن، ئەوجا مەلا مەحموود دەڵێت: دە ئامەگیان جلە بووکێنییەکانت (کە دەقی نەشکا بوو) بێنە بینێرە بۆ کەسێکی دنیاویست، یان بووکێکی منداڵۆچکە، یان بەلەنگاز و نەدارێک کە دڵی پێی خۆش بێت. دەڵێت ئەو ژن و پیاوە نووریان لێ دەباری و منداڵەکانییان بە کوڕ و کچەوە

هیچیان له ئەولیا کەمتر نەبوو.
خاتوون ئەم حیکایەتانە هیی مەملەکەتەکەی تۆ نین، بەڵام ڕەگیان لە وجودی تۆدا ڕۆچووە و نووریان لە سیمای تۆیا چاندووە.

# شەوی دەیەم

بە ناوی (هو)، پاکەرەوەی نەفسی مولهەمەیە. شێخی گەیلانی وەک دەوای دەرد بۆ ئەم نەفسە، چلوچوار هەزار و شەش سەدجار وتنی یا هو. ئەی ئەو، زیندوو ئەوە، زیندەگی بەخشیش هەر ئەوەی داناوە. خودا خۆی لە سورەی پیرۆزی شەمسدا دەفەرموویت: "سوێند بە نەفس و ئەو زاتەی کە بە ڕێکوپێکی بەدیهێناوە. جا توانای خراپە و چاکە و خوانەناسی و خواناسی تێدا دابین کردووە." وەختێک ئێمە ئەم زیکرە دەکەین، واتە لەسەر هو نەفسمان ئیش دەکات، لانکەی ئەم نەفسەش ڕۆحە. وەک مورشیدیمان دەفەرموویت، دەروێش بەم زیکرە لە موحیبەتەوە بۆ عەشق دەچێت، لە تەریقەتەوە بۆ مەعریفەت وەڕێ دەکەوێت. بەڵام هەروا ئاسان نییە و نابڕێ، موریدی زیکرخوێن، لە دەمووەختی خوێندنی ئەم زیکرەدا خەونی ئەعجائیب و غەرائیب دەبینێت، خەو بە "ئافرەت، بەشەری بێباوەڕ و کافر، غەزەلخوان و قەوال، کۆسە، دەڵاڵ، قەساب، لۆتی، کوێر، لاڵ، کەڕ، حەسحە"وە دەبینێت. پاش دیتنی هەر خەوێک دەبێت بچێتە خزمەت شێخ یان خەلیفە تا جۆیای حاڵی باتنی بێت و بزانێت ئەم زیکرە چەندێکی لە دەردی دەوا کردووە. خەلیفە ڕیش چەرموو، زۆرجاران، وەهای نەقڵ دەکرد، ئەگەر مورید لە دەمووەختی خوێندنی زیکری یا هودا، خەون بە ئافرەتەوە ببینێ، ئەوە عەقڵی نوقوستانە و دەبێت خەلیفە ویردێکی بۆ عەقڵ پێبدات. ئەگەر خەونی بە کەسێکی شەلەوە دیت، ئەوە بانگەشە بۆ حەق دەکات، کەچی خۆی پەیڕەوی حەق نییە، ئەگەر خومار و مەیزەدە و سەرخۆشی دیت، ئەوە خەریکی عەشقی مەجازییە، ئەگەر بە قەساب و گروونەوە خەونی دی، ئەوە دڵڕەقە. ئاوها بەهۆی خەونەوە خەلیفە لە باتنی مورید تێدەگات و ڕێنمایی بۆ چاکسازیی دەکات.

دەی خاتوو شەهرزاد زیکری یاهو بکە، تا نووری سوور ببینیت و سەخاوەت و قەناعەت و تەوازیع و تەحەمولت تیا چەکەرە بکات. خاتوون پاش زیکری یاهو خۆم دەناسێنم، بەندە موریدی نوربەخشم. ناوم چراغ عەلی دەستگیر و خەڵکی ئەفغانستانم. لەوانەیە هەموو تەریقەتەکان هەموویان یەک شت بن لە بنەڕەتەوە. چونکە تەریقەتەکەمان بەشێکی لە هەواری ئێوەوە هاتووە، بۆ یەکەمجار لە سەید محەمەدی نوربەخش، کە دەکاتە کوڕی بابا عەلی هەمەدانی، بڵاو دەبێتەوە. باوکی شێخی مەزنمان، بۆ بەدەستهێنانی عیلمی زاهیر و باتین دەبێتە جیهانگەڕێکی باشی ناو شارانی خۆراسان و شیراز و ئیسفەهان و بەغدا و کوفە و یەمەن و حەرەمەین، پاش وەدەستهێنانیان لە شاری هەمەدان دەگیرسێتەوە، موریدانێکی زۆری لە دەور جەم دەبنەوە و دوایی دەبنە خواجەی ناودار، ئەمسالیان شێخ مەحموودی شەبەستەریی شەرحکەری گوڵشەنی ڕاز و خواجە ئیسحاقی خەتلانییە. کە هەم خواجەیە دوای دەبێتە پێگەیەنەری شێخی نووربەخش و هەردوو

برای بە ناوی شێخ عیسا و شێخ موسای بەرزنجی، هەر لەسەر دەستی خواجەدا کە خەلیفەی بابیانە دەگەنە پلەی مورشیدی و هەریەکەیان ڕوو لە هەوار و دیارێک دەکەن بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامەکەیان. شێخ محەممەدی نووربەخش ڕوو لە هەراتی ئێمە دەکات، خەڵکانێکی زۆر دەبنە شوێنکەوتوو و موردید و مەنسوبی. باپیری حەوتەمی من یەکێک بووە لە خەلیفە دڵسۆزەکانی، پێش ئەوەی گیان بسپێرێت وەسیەتی کردووە لە هەر نەوەیەکی کوڕێکیان شوێنکەوتووی نووربەخشی بن، تا نەکەونە ناو زوڵوماتی زەمانە و لەو نوورە کە ئەم سەرچاوەکەی دیتووە بێ بەش نەبن.
دەگێڕنەوە، پێش ئەوەی شێخ محەممەد ڕوو لە هەرات بکات، لەگەڵ براکانی دەچنە زیارەتی حەرەمەین، مەناسیک بەجێ دێنن و دەستومۆچ دەکەن، نەک دیارە و قیامەت بکەون، شێخی ئێمە دەڵێت من دەچمە ئەفغانستان و هەردوو جووتە براش دەڵێن ئێمەیش دەگەڕێنەوە و بەو شوێنانەی پێیدا دەگوزەرێن ئیرشادی خۆمان دەکەین، حەکایەت وەها دەبێت ڕێیان دەکەوێتە خاکی کوردان.
حیکایەتەکان وەهان، کە وەختێک دەگەڕێنەوە دێنە بەغدا و دوایش دەبێت بە کوردستاندا ڕەت بن، دڵیان ئەو جێیە دەگرێت کە بەرزە و پاکە خواپەرستی تێیدا سەفای هەیە، بۆیە دەمێننەوە و لەوێ دەست بە ئیرشاد و بڵاوکردنەوەی پەیامەکەیان دەکەن. ڕاوییان بە جۆرێکی تریش حیکایەتی شێخ عیسا و شێخ موسا نەقڵ دەکەن. گوایە وەختێ دەگەڕێنەوە ڕێیان دەکەوێتە کوردستان و شەوێک برای گەورە کە شێخ موسایە، خەون بە حەزرەتی ڕەسوڵەوە دەبینێت، پێی دەفەرمووێت ئەم بەرزەجایەن بکەنە مەڵبەندی بڵاوکردنەوەی ڕێبازی باوک و باپیرانتان، ئەودەم پێی موبارەکی دەخاتە ناو کانییەکی کوێرەوەبوو، بەردێکی ڕەشیش هەڵدەدات، دەفەرمووێت لەوێ مەعبەد و مزگەوت چێ بکەن و بگیرسێنەوە. ئیتر شێخان دەڕۆن بۆ دۆزینەوەی ئەو شوێنەی پێی دەوترێت بەرزنجە، دەبینن ئەو شوێنە بووە کە بە خەون دیویانە و بەردیکی ڕەش لەوێیە کە پارچەیەک لە حەجەرەلئەسوەدی مەدینە. شێخان دەیانەوێت بناغەی مزگەوت دانێن، خەڵکی ئاوایی دەڵێن: ئێوە دوو لاوی غەوارە چۆن کاری وادەکەن، ئەوە ماڵ و موڵکی حاجی خاڵە، شێر لە ترسی ئەو دەلەرزێ، پێ بزانێت ڕۆحتان لەبەر دەردەکات، ئەوانیش گوێ بە قسان نادەن و دەفەرموون ڕۆحی ئێمە کەس پێی دەرناکرێ مەگەر ئیزنی خالقی لەسەر بێت، بۆیە دەست بە دروستکردنی مزگەوت دەکەن، کاتێک ئەم هەواڵە بە حاجی خاڵ دەگات، دەڵێن سوار پشتی پڵنگان دەبێت، دەنەڕێنێ: ئێستە نیشانیان دەدەم کێ ڕۆحی بە دەستە، کاتێک نزیک دەبێتەوە خەڵکی دێ دەچنە خزمەت شێخ موسا و دەڵێن: لاو بڕۆن وا هات، بەزەییتان بە جەوانیتاندا بێتەوە، ئەویش دەچێتە سەر دیوارەکە و بە ئەمری خوا دیوار دەکەوێتە ڕێ و بەرامبەر بە حاجی خاڵ دەوەستێ، کاتێک پڵنگە دەگاتە بەردەمی سەر بۆ شێخ دادەنەوێنێ، خاڵ زارەترەک دەبێت، دەڵێت: ئەلحەق شێخی مەزنی، لەسەر دەستی بەیعەت دەکات و دەبێت بە موریدی.
دەڵێن: دوای ئەوە خەڵکی ئاوایی دەبنە مورید و لە دەوری شێخان گرد دەبنەوە، عەلەل خسوس کاتێک خەریکی دروستکردنی مزگەوتەکەن، شێخ عیسا بە برای گەورەی دەڵێت کاکە، کۆڵەکەکە کورتە، ناگاتە میچ، کاکە لێی وەردەگرێت و دەڵێت بە ئیزنی خوا بکشێ، کاریتەکە دەکشێ و درێژ دەبێت، ئیتر خەڵکی کە ئەوە دەبینن، دەگرین و دەست دەکەن بە زیکر و کۆڕی زیکر گەرم دەکەن. دەڵێن ناو و ناوبانگیان لەناو موسوڵمانی ئەستەنبوڵ و ئێران و بەغدا بڵاو دەبێتەوە و شێخان و زاهیدان ڕووی تێدەکەن. تەریقەتەکەیان وەک برای گەورەیان بە نووربەخش بڵاو دەبێتەوە.
کاتێک من ناو و ناوبانگی برایانی شێخی نووربەخش و حیکایەتیانم بیست، هاتمە خاکی بابان و ویستم زیارەتی ئەو

دوو زاتە و دوو زاتی تریش بکەم، کە شێخ مارفی نۆدێ و کوڕەکەیەتی بە ناوی حاجی کاک ئەحمەدی شێخ. خوشکە شەهرەزاد حیکایەت منی لە هەراتەوە گەیاندە ئێرە!
خوشکە لە نەوەی ئەو شێخانە، شێخ مارفی نۆدێیە کە بە زیندووکەرەوەی ڕێبازی قادری دادەنرێت. دەڵێن ئانی خۆی پێش ئەوەی خودا کوڕێکی پێ ببەخشێ، تەمەنێکی گەورەی هەبوو، دەستی کرد بە نووسینی کتێبێک بۆ کوڕەکەی تا بە دروستی زمانی عەرەبی بە شێوەی شیعر فێر بێت، کوڕێک کە هێشتا لە دایک نەبووە و دوای سێ ساڵ بە موعجیزە دەبێت. ئەو کتێبە ساڵانێکی زۆرە لە حوجرکاندا دەیڵێنەوە و من بۆ خۆم لەبەرم کردووە، جارێک لە خانێک لەگەڵ فەقێیەکی کورددا باسی ئەوەمان کرد، ئەو وتی: ئێمە لە زەماوەندیش بە تەپڵەوە دەیڵێینەوە و هەڵدەپەڕین.
دەگێڕنەوە ئەم کاک ئەحمەدی شێخە، هێند خاوەنی کەرامات بووە، یەکێک بووە لەو شێخە سەختگیرانەی تا تەواو دڵنیا نەبووە لە مورید وەری نەگرتووە و نەیهێشتووە بێتە ناو هەڵقەی موریدانییەوە. دەگێڕنەوە لە دەمی خۆیدا موفتی بابان و کاک ئەحمەدی شێخ نامەیەک بۆ سوڵتان عبدولحەمیدی عوسمانی دەنێرن لەگەڵ نامەکەدا دوعایەکی تایبەتی تێدایە، کە ناوی گوللەبەندە و ناسراوە بە دوعای کاک ئەحمەدی شێخ و پاریزەری ئینسانە مەگەر ئەوەی ڕۆژی تەواو بوو بێت، نێردراوەکە دەبێتە جێگەی ڕێزی سوڵتان، بەڵام لەبەر ئەوەی هەندێ لە ناحەزانی تەریقەت لە دەوری سوڵتان دەبن، بە سوڵتان دەڵێن: قوربان با بیکەینە ملی گایەک بزانین، ڕاستەکا، ئەودەم دەیکەنە مەزاق و کەیف و گایەکی مل ئەستوور دێنن، دوعای گوللەبەندەکە دەکەنە ملی و بەر گوللەی دەدەن، بەڵام گوللە نایبڕێ و گاکە وەک خۆی دەمێنێتەوە. سوڵتان دەڵێت: بێگومان ئەمە شێخی خاوەن کەشفە و دەگەڕێتەوە حەرەم و بەرەو ژوورەکەی دەچێت، دەبینێت نامەیەک لەسەر مێزەیەکەتی، بە خەتی کاک ئەحمەد نووسراوە و گلەی کردووە لەوەی چۆن زاتی کردووە سووکایەتی بە دوعای ئەو بکات. سوڵتان ئەوە دەبینێت واقی وڕ دەمێنێ چۆن و کەی ئەو نامەیە گەیشت، ئیتر خۆی بە موردی ئەو دەزانێ و چەند دێیەکی پێشکەش دەکات.
وەختی گەیشتمە بەرزنجە و مەرقەدی شێخان و بەردی ڕەشم زیارەت کرد، چوومە زیارەتی شێخان، باوک و کوڕ، لە گەڕانەوەمدا، ڕێم کەوتە قەلەندەرخانە. لە پاسەوانی بەردەروازەم پرسی ئێرە کوێیە؟ وتی: ئێرە مەملەکەتی قەلەندەرانە، تەزوویەک بە لەشما هات و وتم با بچم، یان سەرم دائەنێم یان ئەگەڕێمەوە لەوە زیاتر نییە. ئیتر ئەوەیە کە دەبینی نە سەرم دانا نە مردم، نە دەشتوانم دەستبەرداری ئێرە بم، لە خودا بەزیاد بێت موریدان و مەنسوبان لێرەش هەن، خوداش لە گشت شوێنێ، بۆیە حەوجەم بە سوڵتان نییە، ئەز لە بەرگی گەدایاندا سوڵتانم.

# شەوی یازدەیەم

زیندوو ئەوە، زیندەگی بەخشیش هەر ئەو. بە ناوی حەی. خودا لە قورئاندا فەرموویەتی بە ئیماندارانی سەرفراز لە سەرەمەرگدا دەوترێت: "ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی موتمەئین ئەی ئادەمیزادی ژیر و هۆشمەند کە لە تەمەنی کۆتایی دنیادا پەروەردگارت ناسی و بە جوانی دەتپەرست. بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆ ڕازییە". شێخی گەیلانی بۆی داناوین چوارەمین یاد، بۆ پاکبوونەوەی نەفسی ئارام و دڵنیایی، چوارەمین هاوار و بانگ، یا حەی بێت. بۆیە هەر دەروێشێک بیست هەزار و نەوەدودوو جار، ئەم زیکرە دەخوێنێت. مورید کاتێک متمانەی بە دنیا هەیە و شەکی نییە، ئەوە بزانە دنیاویستە و دوورە لە ئادابی دەروێشانەوە، بۆیە دەبێت لە ڕێگای سلوکدا بەم زیکرانە خۆی پاک بکاتەوە، تا دڵی لەگەڵ خودادا بێت. جێگەی ئەم نەفسە سیڕە کە دڵی دڵە. مورید لە ئانی زیکردا خەون دەبینێت، خەونی جۆراوجۆر. خەون بە سوڵتانان، ئەنبیایان، ئەولیایان، پیران و شێخان، قازی، کەعبە، تیروکەوان، مێرخاس. هەر یەکە لەو شتانە ڕێنماییکەری دەروێشن بۆ پەڕینەوە لە سێ پلەی پێشووەوە بۆ سێ پلەی دوای، وەک چۆن شایەنی تەرازوو، دوو قاپ ڕادەگریت، وەها ئەم زیکرە مورید ڕادەگرێت لە نێوان پاکبوونەوە و نەبوونەوەدا. ئەگەر مورید لە دەموەختی خوێندنی زیکری یاحەی دا، خەونی بە سوڵتانەوە دیت، ئەوە بەسەر نەفسیدا زاڵە، خۆ ئەگەر لە خەونیدا قازی دیت، واتە ئەمری خودای بەجێ گەیاندووە و گوێ لە مستی تەعالایە. دەروێشان لەم سایەی ئەم زیکرەوە لە عەشقەوە دەگەنە وەسلەت، لە مەعریفەتەوە بارگە دەپێچنەوە بۆ حەقیقەت و هێزی ڕازی بوون بە قەدەری ئیلاهی، تەوکول، شوکرانەیان تێدا کڵپە دەسەنێت. خاتوون زیکری یاحەی بکە، تا نووری سپی و ڕەنگی سپی ببینیت و نیشانەی پاکبوونەوە و ڕێ نزیکبوونەوەت بێت.

شەهرەزاد خاتوون خۆم دەناسێنم: ئەوەڵ بە ناوی عەشق و لەیلوعشق: بە ناوی عەشق دەست پێدەکەم کە لەناو ئێمەدا وەک برای حازریم غوڵام وەلی نیشابووری موریدی مەولەوی بڕوای تەواومان بە عەشق هەیە، هەموو شتەکان لەناو عەشقەوە دێن و دەچنەوە ناو عەشق! هاوەڵانی ئێمە لەباتی بەیانی باش و ئێوارە باش بەیانی عەشق و شەو عەشق دەڵێینەوە.(صباح لر عشق السون، عاکشام لر خیر السون) شەو باش، کەسی بەرامبەر لە جەوابدا دەڵێت: عشقین جمال السون، جەمالی تۆ عەشقە. ئیدی ئەمە تەنانەت لە کاتی خواردنەوەش لە بری نۆشت بێ ئێوەدا دەڵێین. منیش بە عەشق دەست پێدەکەم شەوت عەشق!

بە ناوی زاتی ئەو کە دایم زیندووە، بە ناوی ئەو دەست پێدەکەم و حیکایەتی خۆم ئەگێڕمەوە. بەندە موریدێکی تەریقەتی

بەکتاشیم، ناوم بابا جان وێردی و خەڵکی ئەستەنبوڵم. حیکایەتێکی گرنگ نییە تا باسی بکەم، بەڵام دەمەوێ حیکایەتی شێخی مەزنمان باس بکەم، کە تەریقەتەکە لە دەست و جڵەوی دایە.
حیکایەتی تەریقەتی ئێمە بۆ حاجی بەکتاشی وەلی و زاهیدی خۆراسانی دەگەڕێتەوە، ئەم تەریقەتە لە ئەنادۆڵەوە دێ و ژمارەیەکی زۆر مورید لە دەوری خۆی گرد دەکاتەوە، بێ لە تورکیا، سوریا، میسر و ئەلبانیا موریدان لە دەوری جەم دەبنەوە. شێخی ئێمە داوای سێ بنەڕەتی لێ دەکردین و مورید دەبوو پەیڕەوی بکات وەک چۆن زەردەشتیان بڕوایان کردەی چاک، گوتەی چاک، بیری چاک بوو، وەهاش ئێمە دەبێت ئەم سێ گوتەیە پەیڕەو بکەین:
- دەستت بێ ئازار، دەمت ڕازدار، کەمەرت پایەدار ڕاگرە.
ئەم شێخەی ئێمە وەک شێخ و پیاوچاکانی تری موریدانی برام خاوەن کەشف و کەرامات بووە، دەڵێن:
- وەختی خۆی حاجی بەکتاش کە ناسراوە بە خونکار، لە تەمەنی چوارساڵیدا دەنێرێت بۆ لای لوقمانی پەرەندە، کە یەکێک لە خەلیفە خاوەن کەراماتەکانی ئەحمەد یەسەوییە، دەگێڕنەوە ڕۆژێک لوقمانی پەرەندە دەچێتە دەر و درەنگ دێتەوە حوجرە، کاتێک دێتە ژوور دەبینێت دوو کەس سەرتاپا ون لە نووردا، خەریکی قسەکردنن لەتەک حاجی بەکتاش. مەکتەبخانەکە لە تاو نووری ئەمان بۆتە چراخان، یەکێک لای چەپ و ئەوی دی لای ڕاستی لێ گرتووە و وانەی قورئانی فێر دەکەن. لوقمان بەم دیمەنە موتەحەیر دەبێت، نزیکتر دەبێتەوە هەردوو نوورەکە ون دەبن، بەکتاش ئاوڕ دەداتەوە و ئوستادەکەی دەبینێ، دەڵێت: ئەی مامۆستا دەزانی ئەو دووانە کێ بوون؟ لوقمانی پەرەندەش دەڵێت: نا بەکتاش کێ بوون؟ بەکتاش لە جەوابدا دەڵێت: ئەوەی لای ڕاستم گەورەی نێردراوان و باپیری خۆم حەزرەتی محەمەدەلموستەفا بوو، ئەوی لای دەستەچەپیشم، قوتبی ویلایەت، ساقی کەوسەر، شێری خودا، ئەمیری موئیمین عەلی مورتەزا بوو. هەردووکیان بە فەرمانی خودا عیلمی باتن و ئەوی دی عیلمی زاهیریان فێر دەکردم. لوقمانی پەرەندە سەری لەم منداڵە سووڕ دەمێنێت، دڵی لە حەژمەت بیستنی ئەم قسانە پڕ دەبێت لە نوور.
هەر لەسەر کەراماتی دەمی منداڵیی شێخی مەزنمان دەگێڕنەوە، ڕۆژێک پەرەندە دەیویست دەستنوێژ هەڵگرێت، بانگی بەکتاش دەکات دۆڵچەیەک ئاوی بۆ بێنێ، بەکتاش بە پەرەندە دەڵێت: قوربان چی دەبێت ئەگەر لە ڕووی باڵاییەوە، کەرم کەیت لەناو مەکتەبخانەوە کانیاوێک هەڵقوڵێت، تا ئیتر پێویست نەکات بۆ ئاو هاوردن بچینە دەر؟ پەرەندەش جەواب گۆی دەبێت: ئەمن لە دەستم نایەت، ئەگەر تۆ لە دەستت دێ لە ڕووی کەرەمەوە بیکە! دەگێڕنەوە هەر لەو ئانەدا شێخ بەکتاش دەست بە دوعا بەرز دەکاتەوە، تەڵەب دەکا و لوقمانیش ئامین دەکات، بە ئەمری خودا لەناو مەکتەبخانەوە کانیاوێکی ڕوون و زوڵاڵ هەڵدەقوڵێ، کاتێکیش لوقمان ئەمە دەبینێ ناوی هونکار لە حاجی بەکتاش دەنێت.
خاتوو شەهرەزاد وەک چۆن هاوەڵانمان قسەیان لەسەر یەکبوونی شێخان و پەیمان کرد، کە جوگرافیا هیچ نییە، بێ لە خەیاڵ، ئاواش دەگێڕنەوە لە دەمی خۆیدا شێخی بەکتاش ڕێی دەکەوێتە وڵاتی کوردان، لە ڕێ لەگەڵ دەستەیەک لە شوێنکەوتوانیدا بە لای ڕووبارێکدا تێدەپەڕن، لە ناکاو ماسییەکان لە ئاو دێنە دەر و سڵاو لە شێخی بەکتاش دەکەن، کاتێک خەڵکی ئەو ناوە ئەمە دەبینن هەمووان لە شێخ کۆ دەبنەوە، شێخ دوعا بۆ ماسیانی دەریا دەکات، دەڵێت: بڕۆنە ناو ئاو سەرقاڵی یادی خودا بن و لە یادی ئەو غافڵ مەبن. خەڵکەکە بەمە بەیعەتی پێدەکەن و دەبنە شوێنکەوتووی.
خانم وەک عەزرم کردن ناوم بابا جان وێردییە، لەناو پەیڕەوانی تەریقەتی ئێمەدا، کەسانێکی دوورە ئێمە، مەیلیان بۆ بابا

و تەریقەت هەیە پێیان دەوترێت موحیب، کە بە شتێک بەستراوە بە ئێمەوە، کە ئەو شتە مەیل و خۆشویستنی دوورە، لە دوای ئەو پلەی دروێشمان هەیە، بە موحیبان دەوترێت کە مەیلیان هەیە و دەیانەوێت بێنە ناو ئەڵقەکەوە بۆیە نزیک دەبنەوە و دێنە تەکیە، لە سەرەتادا کڵاوێکی عەرەقچنی لەسەر دەکەن و وەک سوختەکانی مزگەوت کاری کڕین و شوانی و بەردەستی دەرەوەی تەکیەی پێدەکەن، پاش ئەوەی تاقیکرایەوە دەبێتە دەروێشێکی جێگیر. لە پاش ئەمە زۆرجار دەروێشان داوای لە خەلیفە دەکەن پلەی دەروێشێکان بۆ بەرز بکاتەوە تا سەرپەرشتی موحیبان و دروێشان بکات، خەلیفەش کەسێک دیاری دەکات و ئیجازەی پێ دەدات ببێتە بابا. لە بابا پلەیەکی بەرزتر هەیە، کەسی ڕەبەنە، دەروێش یان بابای ڕەبەن، کە بڕیار دەدات بە سەڵتی بمێنێتەوە، سەری دەتاشێت و گوێی ڕاستی دەسمێت و بە لە گوێکردنی هەڵقەیەک بۆ هەمیشە خۆی دەخاتە خزمەت تەریقەت. لە پاشا ئەمان بەرزترن پلە دێت، ئەویش وەها دەبێت کە سێ بابای ڕەبەن، دەتوانن بابایەکی تر بە پلەی خەلیفە هەڵبژێرین.

خاتوون، ئەگەر خەیاڵی تۆ بین، من چۆن ئەم شتانە لە بارەی شێخ و خۆمەوە دەزانم، ها خاتوون؟

# شەوی دوازدەهەم

بە ناوی تاکو تەنهایی خوا و بە زیکری ئەو واریدی مەجلیس دەبم. نەوەدوسێ هەزار و دووسەد و چل جار بۆ نەفسی ڕازییە یا واحید دەڵێمەوە. بەو وتنەوە زۆرانە تەزکیەی نەفس دەکەین و خۆمان پاک دەکەینەوە، دەروونمان بە نووری ئیلاهی ئارایشت دەدەین. شێخی ئێمە دەفەرموویێت شەشەم زیکرتان ئەو زیکرە بێت، مورید هەموو شتێکی دەبێت بە خودا و درک دەکات کولی ئەحوال لە خواوەیە. ئەم نەفسە لە سەرائیرە و دەچێتە پەنامەکی و مورید دەچێتەوە عالەمی شەهادە و شەریعەت، حاڵی لە غینا و شەتەحەوە دەبێت بە حیرەت و مەفتوونی عەشقی خودایی. مورید ئەگەر بە دروستی زیکرەکەی بکات، نووری ڕەنگ ڕەش دەبینێت. بە قەندیل و چلچرا و خۆر و مانگ و ئەستێران و هەورەبرووسکەوە خەون دەبینێت. خۆ ئەگەر مورید هەر خەونێکی دیت، دەبێت بچێتەوە کن شێخ تا ڕێنموونی بکات. خاتوو شەهرەزاد، زیکری یا واحید بکە تا حەیاتت و مەماتیشیت ئاوەدان بێت!

عەرزت کەم بەندە ناوم ئاماجی خان و خەڵکی وڵاتی هیندستانم، یەکێکم لە مورید و منسوبانی تەریقەتی نەقشبەندی، ناوی نەقشبەندی بۆ شێخی مەزنمان شێخ محەممەد بەهائەدینی نەقشبەندی ڕەحمەتی خوا لێ بێت دەگەڕێتەوە، وەگەرنا پێشتر تەریقەکەمان بە ناوی تەریقەتی خواجەگانەوە ناسرا بوو. شێخی مەزنمان لە دێیەک بە ناوی قەسری هیندوان نزیک بوخارا لەدایک دەبێت. وەختێک شێخی مەزنمان وەک خۆر لە دنیا هەڵدێت، باپیری بە ناوی شێخ محەممەدی جەلالەدین کە موریدی تەریقەتی خواجەگانە و لەسەر دەستی خواجە محەممەد بابا سەماسی تەریقەتی وەرگرتووە. میوانداری شێخی خۆی دەکات کە بە قەستی ئیرشاد لەو ناوچانە، خواجە سەماسی بە خۆی و ژمارەیەکی فرەی موریدان و شوێنکەوتوانە دێنە قەسری هیندوان، شێخی ئێمە ئەو دەمە تەمەنی تەنها سێ ڕۆژ دەبێت، باپیری کە موریدی جواجەگانە، شێخی نەوخونچەمان بە مەلۆتۆکەیی دێنێتە خزمەت ئوستادی خۆی تا موبارەکی بکات و دەستێک بەسەریدا بهێنێت، خواجەی گەورە دەفەرموویێت: ئەم نەوەیەت دەبێتە پێشەوایەکی مەزن، مژدەبێت.

دوایش قسەی خواجە دێتە دی و دەبێتە شێخی نەقشبەندی. نەقش بە مانای نەخش و نیگار دێت و بەندیش بە واتای هەڵکۆڵین، ئەمەش بۆ ئەو دەگەڕێتەوە کە موریدانمان دەڵێن دەبێت یادی خودا و جوانییەکانی وەک نەخش لەناو دڵدا هەڵکۆڵرێ. دەگێڕنەوە شێخمان دەیەوێت بگات بە مەقامێکی باڵا و ناگات، هاوار لە شێخی گەیلانی دەکات، دەڵێت: ئەی پیری دەستگیر دەستمان بگرە، وەها دەستمان بگرە کە دەستبەردار نەبین. شێخ دێتە خەوی دەفەرموویێت: دەستی تۆمان گرت، تۆیش نەقشبەند بە لەوەی وەریدەگری. ئیدی دەگاتە مەقامی باڵا و عیبادەتی وەک نەقش لەسەر وجودی

هەڵدەکۆڵرێ.
ئەم تەریقەتە لە هیندستانەوە بڵاوە دەکات، وەهاش دەگاتە کوردستانی ئێوە، کە شێخ خالید نەقشبەندی لە شێخ عەبدوڵڵای دەهلەوی وەردەگریت و بەناو کورداندا بڵاو دەبێتەوە. لە زۆرێک لە مەملەکەتان خانەقای نەقشیان هەن، وەختی خۆی من بە قەسدی بینینی شوێنی شێخ خالید هاتمە ئێرە، ڕێم کەوتە شاری قەلەندەرانی تۆوە. ئەمێستا لەگەڵ هاوەڵانمدا زیکری خۆمان لە تەکیەی گەیلانی دەکەین. ڕێبازی ئێمە پێمان دەڵێت لە ڕێگای مودام زیکرکردن و موراقەبە و دەستەوداوێنبوونی شێخەوە دەگەنە سەر ڕێگەی دۆزینەوەی حەق. تەکیەی گەیلانی جێی هەموو موریدانی دنیایە، وەک چۆن بارگەی، ئەو زاتی ماڵ لە بەغدایە، جێی پیرانی ئێمەیش بووە. دەڵێن وەختی خۆی مەولانا خالیدی نەقشبەندی خەلیفەی شێخ عەبدوڵڵای دەهلەوی لە هیندستانەوە دەگەڕێتەوە بۆ بەغدا بە ئەمری مورشید خۆی، یەکەم جێ ڕووی تێدەکات تەکیەی گەیلانییە. ئیدی خۆی بە شوێنکەوتووی ڕێبازی گەیلانی و قادری دەزانێت، ژمارەیەکی زۆر مورید لە دەوری گرد دەبنەوە، هەر لەوێش بۆ یەکەمجار شێخ عوسمانی بیارە لە خزمەتیدا دەبێتە خەلیفە و جێنشین، ئیزنی تەریقەتدان وەردەگرێت.
مورید لە خانەقای نەقشبەندی دەبێت یازدە فەرمان بەجێ بهێنێت، تا ڕێگای بە حەق گەیشتن دروستانە تەی بکات، ئەم فەرمانانەش وەک چۆن لە تەریقەتی عەلەویدا بە بویرق و فەرمان و فەرمایشتان ناسراوە و شێخ سەفییەدین دایناوە، لای ئێمەیش بەشێکی شێخ عەبدولخالقی غەجدەوانی دایدەنێت و شاهی نەقشبەند تەواوی دەکات، کە ئەمانەن: هۆش دەردەم، نەزەر بەرقەدەم، سەفەر دەروەتەن، خەلوەت دەرئەنجومەن، یادکرد، بازگەشت، پاداشت، وقوفی قەلبی، وقوفی عەدەدی، وقوفی زەمانی. هەر یەکە لەمانە ڕێگەیەکی پرقودرەتن مورید پاش برینی هەموویان دەگاتە سەر شارێ. هۆش دەردەم، مانای ئەوەیە دەبێت کەسی مورید هۆشی لە هەموو ورد و درشتی ڕەفتار و ئەدگاری بێت، تەنانەت هۆشی وەلای هەناسە و دەمیەوە بێت لە هەناسەیەکەوە تا ئەوی دی تووشی غەفڵەت نەبێت و حەق لە بیر نەکات، هەرکات مورید لە نێوان هەناسەکانیدا خودای لە بیر کرد ئەوە لایداوە لە ڕێگە و دەبێت لە ڕێباز دەرچێت. نەزەر دەر قەدەم، بە مانای ئەوە دێت کە مورید دەبێت تەماشای بەردەمی خۆی بکات و بۆ دوور چاو نەگێڕێت، هەم چاوی سەر هەم چاوی مەعنەوی دەبێت بڕوانێتە هەنگاوەکانی، پێی خۆی لەو شوێنە دانێ کە دەبێت داینێ، دوور و نزیکتر تووشی تەهلوکەی دەکات. سەفەر دەروەتەن. مورید دەبێت هەردوو سەفەری مەعنەوی و مادی بکات، مادی بۆ عیلم و زانست بگەڕێ و وەربگرێ، مەعنەوی بەناو خۆیدا بۆ دۆزینەوە و کەشف سەفەر بکات. خەڵوەت دەرئەنجومەن، بەو مانایە دێت، مورید دەبێت خۆی لە شلۆقی دوور بگرێت، خەریکی تاعەت و عیبادەت بێت. یادکردیش بە مانای ئەوەی مورید و سۆفی زیکر و یادی خودا لە زار و دڵیاندا نەقش ببەستێت. بازگشت، بەو مانایە دێت موردی هێند قووڵ زیکر دەکات بێ نەفەس و فرە دەڕوات، دەبێت بگەڕێتەوە تازە بێتەوە. نیگا داشت، بە مانای هێڵانەوە دێت، مورد زیکر و خودناسیی لە دڵدا بهێڵێتەوە نەک هەر لە زار دەری کات. یادداشت، ئەم حاڵە حاڵێکی دوورە مورید دوای فەنا پێی دەگات، بە مانای بەردەوامبوونی ئەو نیگاهداشتە دێت، لە دەستی نەدات. وقوفی زەمانی مورید لێرەدا محاسەبەی دەروونی دەکات و تاوناتاوێ دەوەستێ بزانێ چی کردووە و بە خۆیدا دەچێتەوە. وقوفی عەدەدی، ئەمەش لە کاتی زیکردایە و مورید دەبێت بە تاک ژمارە ویرد بخوێنێت و لە تاکدا بوەستێ، وەک ئەوەی ناوی ئەڵڵا دەبات دەبێت بە یەک نەفەس حەوت جار بیبات ئەوسا نەفەس بات.

وقوفی قەلبیش ئەوەیە مورید بەسەر دڵی خۆیەوە بوەستێ تا یەک جاریش غافڵ نەبێت و لە یادی ئەڵلا نەوەستێ. وەختێک موریدی نەقشبەندی ئەمانەی وەجێ هێنا، جا پاک دەبیتەوە و دەچێتە حزمەتی شێخ یان خەلیفە تا بۆ بڕینی پلەی باڵاتر و شهودی تر ڕێنمای بکات.

خاتوون ئێستا لە تەکیەی گەیلانی موریدی ئەوین و پێڕەوی لە ڕێبازی ئەو دەکەین، شەوانی هەینی کۆڕی زیکرمان هەس، هەریەکەمان حەفتا ویردی تایبەت بە خۆمان و سورەی دیاریکراوی خۆمانمان هەیە، دەبێت چل شەو جارێک بیگۆڕین. ئەی تۆ ئەم چل شەوە چی دەگۆڕیت؟ ئێمە؟ یان حیکایەتەکانت؟ خاتوون پیری ئێمە نەخشی دڵمانە، تۆیش هاواری لێکە، خالق ببێتە نەخشی دڵت!

# شەوی سیازدەهەم

بە ناوی عەزیزەوە شروع دەکەم، لەسەر تەوسییەی شێخمان بە یا عەزیز، ڕێگەی درێژی هاوەڵانمان تەواو دەکەم، تا نەفسی ڕازییە ڕوون بێتەوە و حەوفتاوچوار هەزار و شەش سەد و چلوچوار جار ئەم زیکرە دەخوێنم. خاتوون شێخی ئێمە دەفەرمووێت، مورید وەختێ بە هۆی زیکری یا حەیەوە گەیشتە سیر، ئەوجا بە هۆی یا عەزیزەوە دەگاتە سەرائیر و ڕازی ناو ڕازەکان. لە وەسڵەوە دەچێتە غیناء و شەتەح، ئەگەر تەواو یاد و فکروزکری لای خوداوەند بوو، نووری سەوز دەبینێت. ئەو موریدەی بە دروستی ئەم زیکرە بکات، خەون دەبینێ، خەونی جوان، بە فریشتەی ئاسمانان، غیلمان و حوریەلعەین، بەهەشت و فیردەوس. مورید بە تەبیعەتی حاڵ تەرکی هەموو شتێک کە لە یادی خودا غافڵی بکات، دەکات. دەی خاتوو، دەست بکە بە زیکری یا عەزیز تا ڕۆح و دڵت پڕ بەرەکەت بێت!

بەندە ناوم، غولام وەلی نیشابورییە و موریدی مەولانام، پێش ئەوەی بێمە قەلەندەرئاواکەت، لە نیشابوور بە قەستی زیارەتی شێخم بارگەی سەفەرم بۆ قونییە وەکۆڵ نا، زیارەتی خۆمم کرد و لە هاتنەوەمدا ڕێم کەوتە شارەکەت.

حەکایەتی شێخی من جەرگبڕترین حەکایەتی کەونە، خاتوون! هەموو ئەوانەی ئەهلی دڵن لەو قسەیە تێدەگەن، ئەوانەی عاشقن و ئەوانەی مەعشوقن. خاتوون حیکایەتەکە وەک هەزارلوف بە هەزار جۆر گێڕاوەتەوە، حیکایەتخوانان وەک تیری لە جەرگ ڕۆکراو کە ئازارەکەی لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوێزێت، وەها ئازاری حیکایەتەکە و مەرگەساتەکەیان پێ گوێزیوە.

من لە حیکایەتی شێخم ڕامکرد، ئەو حیکایەتەی وەک مۆرێک بە ناوچاوانی هەموو عاشقانی قوربەماڵن، حیکایەتی شەمس و مەولانا کەس نییە نەیبیستبێت، مورید نییە نەیگێڕابێتەوە، بەڵام خاتوون کەس وەک من نەیچەشت، کەس!

حیکایەتەکان دەگێڕنەوە شێخی ئێمە لە منداڵیدا لەگەڵ سوڵتانولعولەمای باوکی لە بەڵخەوە ڕوو لە شارەکەی ئێمە، نەیشابوور دەکەن و بە خزمەت شێخ عەتتاری نیشابووری دەگەن. لە حیکایەتەکاندا زۆرجاران چەندان شێخی گەورە بە یەک دەگەن، لەم حیکایەدا هەرسێ شێخی مەزن دەکەونە یەک سەردەم، شێخی مەزنی ئێمە؛ ڕۆمی و شێخ عەتتاری نەیشابووری و ئیبن عەرەبی. دەگێڕنەوە کاتێک لە خزمەت شێخ عەتتاردا دەبن، دەستی موبارەکی دێنێت بە سەری شێخماندا و دەفەرمووێت: سبحەینێ ئەم کوڕێژگەیە، پیاوێکی مەزن و شێخێکی گەورەی لێ دەردەچێت. خاتوون دەگێڕنەوە هەر ئەو کاتە نوسخەیەکی ئەسرارنامەکەی خۆی بە دیاری دەدات بەو منداڵەی کە لە ئایندەدا دەبێت بە شێخێکی گەورە. لە حیکایەتەکاندا وەکو دوێنێ برامان باسی کرد شارەکان دەبن بە یەک. ئینسانی بە ئیمان،

ئیمانەکەی موهیمە نەک شارەکەی. دەگێڕنەوە شێخی مەزنمان لەگەڵ سوڵتان عولەمای بابی پێش ئەوەی بێنە قونییە، لە شاری لارەندە دەمێننەوە هەر لەوێش شێخمان کە تەمەنی هەژدە ساڵانە خاتوو گەوهەری کچە نازداری خواجە لالای سەمەرقەندی دەخوازێت، پاشان ڕوو لە قونییە دەکات. لەم حیکایەتەدا نیشابوور و قونییە و سەمەرقەند و هەرات شتی جودانین، لەناو وەحدەتی وجوددا عارفان بیر لە شار ناکەنەوە. مەولانای ئێمە لە بەڵخدا دوای نەمانی بابی کە نازناوی میری زانایانی وەرگرتبوو، موریدانی لە دەور کۆ دەبنەوە.

حیکایەتەکان دەگێڕنەوە شێخی مە، کاتێک ماجەرای لەگەڵ شەمسی تەورێزی، هەرە ونترین شێخی دنیا، دەگاتە مەرگەسات، ئەوسا دەبێتە مەولانا، حیکایەتەکە لەوەدا جەرگبڕە کە تا نەمریت، ناژیت، تا عەشق وێرانت نەکات، ئاوەدان نابیت. ڕاویان دەڵێن: شێخی ئێمە دوای نەمانی شەمس، ڕۆژ بە ڕۆژ کامڵتر و هێمنتر دەبوو، نوورانیتر و ڕووناکتر دەینواند، وەک ئەوەی هاتنی شەمس لافاوێک بۆ وێرانکردنی و فێرکردن و دروستکردنەوەی بووبێت. مەولانا لە تاو عەشق و چێژی خوداناسی و بە یادی منداڵییەوە کە لە نیشابوور ئەسرارنامەی وەرگرت، دەستی دایە نووسینی مەسنەوی مەعنەوی، لەگەڵیشیدا غەزەلی سووتێنەری بە تەخەلوسی شیعری شەمسی تەورێزییەوە دەهۆنییەوە. هەر لەبەر ئەوەش ساڵانی دواتر دیوانەکەی ناونرا دیوانی شەمسی تەورێزی. مەولانای حیکایەت ئاتەشین، لە مزگەوتی گەورە دەستی کرد بە وتنەی وانەکانی لەمەڕ عیرفان و ئەوینەوە، کە وەلەد سوڵتان یان یەکێک لە موریدان دەیانووسییەوە و لە سندووقچەیەکیان دادەنا.

جارێک لە فیهی مافیهیدا خوێندمەوە، لە باسی عەشق بۆ موریدان، بە شێوەیەک باسی مەحبووب دەکات، کە دەبێت جەوابی پرسیاری موریدانی بووبێت لەوەی بۆ شەمسی بە شێخی خۆی پەرزیرفتووە: دەفەرموێت، هەر کەس مەحبووب بێت باشە، پێویست ناکات هەر کەس باشبێت مەحبووب بێت. باشی بەشێکی مەحبووبییە مەحبووبی خودی ئەسڵەکەیە. مادەم مەحبووب هەیە واتە باشە، بەشی لە گشت جیا نابێتەوە و گشت پێویستی پێیەتی. شێخ حیکایەتی مەجنون دەگێڕێتەوە: زۆر کچانی لە لەیلا جوانتر و خوبتر هەبوون، بەڵام مەحبووبی مەجنوون نەبوون. بە مەجنونیان وت: لە لەیلا باشترت بۆ بێنین؟ ئەویش وەڵامی دانەوە: ئاخر من لەیلام وەک شێوە خۆشناوێ، لەیلا شێوە نییە، لەیلا لە دەستی مندا جامێکە، شەرابی پێ دەخۆمەوە. کەوایە من عاشقی شەرابم کە لەوەوە دەیخۆمەوە ئێوە تەنها جامەکە دەبینن و شەرابەکە نابینن کە من لەوەوە دەینۆشم! ئەگەر جام و کاسەکەی من زێڕین و نقێمین بووایە و سرکە یان شتێکی تری تیابووایە، بە دەردی منی نەدەخوارد، کولەکە شکاوێکی شەراب لە توێ، هەزاران کاسەی زەڕین دێنێ... وەها بوو جەوابی مەجنون. دەی ئەمە جەوابی شێخی ئێمەیە بۆ شەمسیش. خاتوون شێخی ئێمە لە شەمسی تەورێزییەوە تامی شەرابی کرد، ئەو شەمسەی کە لە ئەولیایانی مەستوور بوو.

برایانم حیکایەتی شێخانی خۆیانیان باس کرد، حیکایەتی شێخی من ئەزبەرە، ڕێگەم بدەن، دەردی خۆم بەیان و برینی خۆم نیشان بدەم.

خاتوون زاری درێژدادڕیم نییە، بەڵام حیکایەتی من وێنەی شکاوی حیکایەتی مەولانامە، منی بەدبەخت، شەیدای کوڕی شێخم بووم، شەیدا و لەت لەت، وەک ئەوەی خودا نووری خۆیم لەودا نیشان بدات، برایانم بە کوفری مەزانن، باس باسی جەوانیمە، خوا بمبەخشێت، جار هەبوو لەبەر پێیەکانیدا سوجدەم دەبرد، ئاهـ خاتوون، عەشق نایناسێ هیچ ناناسێ،

کوڕەی شێخم، وەختێ گەورەتر بوو، شێخ قەراری ژنهێنانی بۆ دا، من وەک شێت دامە کێوان، چونکە ئیتر شەوان بە دەم سەڵەواتدانەوە نەمدەتوانی پاسەوانی خەوی بگرم و ڕۆژانە ڕووی نوورینی ببینم، خاتوون لە تاو سوێ، لە تاو ئازار بەرەو تەورێز هەڵاتم، وەک شێتان لە دەشتودەر ئەمناڵاند، من کافر ببووم، قیبلەم گۆڕابوو، یان عەشقەکەم لە من ون ببوو؟ ئاهـ مەولانای مەزن لە برین و ئەوین و کوفرم تێدەگات و بەس.

خاتوون حیکایەتەکەم وەهایە کە گەڕامەوە لە شاری شێخی شێخم کە تەورێزە، ڕێم کەوتە شارەکەی تۆ، لە ئێوارەیەکی دەمەو پاییزی هەوا ساردا، یەکەمجار پرسیاری تەکیەم کرد، وتیان سێ تەکیە لێرە هەیە و گەورەترینیان تەکیەی گەیلانییە، هەم تەکیە هەم حوجرە، هەم نان دەدەن و ماڵی ڕێبوارانە. چوومە تەکیە، لەوێ هەڵقەی زیکر گەرم بوو، شیعری مەولانا دەوترا و سۆز و مەقام لە ئەوجدا بوون، منی ماڵ سووتاو و بە غارەت چوو، گڕم گرت و حاڵ گرتمی، دووری تەکیە و غەریبی و حەقایەتی عاشقانەی لەیادنەچووم هاتنەوە یاد، سووتام و سازام. ئەو شەوە کە گوێم لە ئاخەرین غەزەلی مەولانا بوو، گوتم دیارە ئەمانە ئەوەڵ دەزانن بۆیە گەیشتوونەتە ئاخر، ئیتر تەکیەم بە تەکیە خۆم قبوڵ کرد و ئێستا کونەبرینداریکی بێدەنگی نێو موریدانم.

خاتوون دەتەوێ حیکایەتی ئەو دواغەزەلەت بۆ باس بکەم؟ هەڵبەت لەسەر ئیزنی موریدانی برام دوایەمین کەلامی مەولانا جەلالەدین محەممەدِ بەڵخی؟ باشە، حیکایەت وەها دەبێت، غروبی ڕۆژێکی خەمهێن لە شاری قونییە، مەولانا جەلالەدینم لە سەرجێ کەوتبوو، دواچرکەکانی ئەو ژیانە زۆر سەختەی بە نەخۆشی بەسەر دەبرد، تایەکی گەرم گرتبووی و لە هەمان کاتدا بومەلەرزە قونییەی دائەچڵەکاند، ئەو ڕۆژە میوانان، سەردانکەران و دەروێشانی دەست بە دوعا لە دەوری بوون، ئەو وەسێت ئاسا قسانی بۆ دەکردن. لە ناویاندا هاوڕێیان و کەسانی تری وەک ئەزیزانی حیسامەدین و سوڵتان وەلەدی کوڕیشی لەوێ بوون. شەو درەنگان هەمووان ڕۆیشتن، سوڵتان وەلەد نەبێت، دێرە وەختێک مەولانا تەماشای سیمای مات و نیگەران و فرمێسکاوی سوڵتان وەلەدی کرد. فەرمووی برۆ پشوو بە، من خاسم! سوڵتان وەلەد لەبەر ئەو فرمێسکەکانی خواردەوە و لە ژوور چووە دەر. مەولانای سووتاوی ناو عەشق، تەمەنێکی دووورودرێژی لە عەشق و ڕاونان و سووتان و سازانی بردووە سەر، کوڕەکەی لەو کاتەیا بۆ ئەو هەموو عەزابە دەگریا کە باوکی لەبەر عەشق، لەبەر گەیشتن بە نووری باڵا چەشتی. مەولانای لە مرۆڤ ماندوو و ڕەنجاو، لەو کاتەدا ئاخرین شیعری خۆی بەو بەیتە دەستپێکرد:

سەر خەرە سەر سەرینت من جێ بێڵە بە تەنیا... و حیسامەدینی کوری بە دەم گریانەوە دەستی بە نووسینی دوایەمین غەزەلی مەولانای مێژووی هەمووی عیرفانییەت کرد. غەزەلەکە وەهایە:

برۆ سەر خە سەر سەرین، من جێ بێڵە بە تەنیا
تەرکی منی خراپ کە، منی شەوگەڕ، مویتەلا
نێمەین و مەوجی سەودا، شەو تا بە ڕۆژ تەنیا
گەر ئەتەوێ ببەخشە و وەگەرنا بیــکە جەفا
لە من گەڕێ تاکو تۆش لە بەڵاوە نەپێچرێی
ڕێگەی سەلامەتبگرە، تەرکی کە ڕێگەی بەڵا
ئیمەین و ئاوی چاوان، لە کونجی غەم خزاوان
لە ئاوی دیدەمانا دانێ ئاش، تۆ لە سەد جا
بۆ ئیمە زاڵمیکە، دڵی وەک خار و سڕکە
قاتلە و کەسیش ناڵێ، ئەرێ کوانێ خوێن بەها



ئیدی خاتوون کە گوێم لەو غەزەلە بوو منی تەنیا، تەنیاتر بووم، ئەو ئێوارەیە بە برینەوە لە قەلەندەرئابادەکەت بوومە موردیدی تەکیەی گەیلانی، برینی ڕاستەقینە نەک دروستکراوی مشتێک بەشەر کە گوایە خەیالی تۆن، ئاهـ خاتوون وەها بوو حیکایەتی من و شێخم.

# شەوی چواردەهەم

هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی پڕ نووری شێخمان، بە یادی ئەو بە ناوی وەدودەوە مەجلیسی دواشەومان دەبەستم، کە دوازیکرە و نەفس کامل دەکات، ئەگەر مورید دە هەزار و سەد جار، بۆ نەفسی کامیلە بیخوێنێت. تا درک بکات هەموو شت بە خوایە و یەک لە هەموو و هەموو لە یەکە. تا مورید لە حیرەتەوە بگاتە بەقا. هەموو ڕێگەکانی شەریعەت و تەریقەت و حەقیقەت و مەعریفەت لە خۆیدا بهێڵێتەوە. ئەوجا نە ڕەنگ دەبینێ نە نوور، تەنێ خودای تەعالا بۆ دڵڕوونی، باران و ئاو و کانی و زنە و بەفری لە خەوندا نیشان دەدات، تا بزانێ بەر ڕەحمەتی باری تەعالا کەوتووە، یا ڕەبی تۆیش بە ڕەحمەتی خودایی بکەوێت خاتوون!
بەندە موریدی سوهرەوەردیم و خەڵکی کوفەم، حیکایەتێکی زۆر تایبەتم نییە بۆتانی باس بکەم، بەڵام لەبەر مەجلیسی برایان و بە گوێگرتنێ لە مەجلیسی شەش شەوی پێشووی ئەوان منیش حیکایەتی شێخی خۆم باس دەکەم. بەندە ناوم نعمت الله کوفییە و بنەڕەتی تەریقەتی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ شێخ شەهابەدینی سوهرەوەرد ناسراو بە شێخولئیشراق، بەڵام هەندێکی تر وەک دەروێشایەتی و موردید دەیگەڕێننەوە بۆ شێخ ئەبو نەجیبی سوهرەوەرد و ساڵانی دوایی شێخولئیشراق دێت و موریدیان لە دەوری کۆ دەبنەوە. شێخی ئێمە موریدیانی زۆری لە هیندستان و پاکستان و بەغدا هەیە. شێخی مەزن کە ناسراوە بە شێخی ئیشراق، داوا لە موریدانی دەکات کامگیری و جەستەدۆستی و شەهوەتپەرستی وەلاوە نێن، ڕوو لە خودا بکەن، تا ڕۆح و دڵتان لەو پەڵۆخی و ناشرینیانە پاک نەکەنەوە، چۆن نووری ئیلاهی لە قەلبتاندا هەڵدێ؟ بڕۆن، بڕۆن دەروونتان پاک کەنەوە تا خۆری خودا لە دڵتاندا ئیشراق بکات.
ڕۆژێک لەگەڵ سیمورغ باسی شێخی ئیشراقمان کرد، ئەو سیمورغە زۆر دنیادیدە و ناوازەیە، هێندەی شت لە بارەی شێخی ئێمەوە دەزانێت، کە من دواتر ناچار چوومە لای مەکتەبدار و هەواڵی رسالە اشراقم لێ پرسی و خوێندمەوە. دەڵێن مورید بە خوێندنەوە و وردبوونەوە دەگاتە جێ، ئێمەیش زۆرجار لای مەکتەبدار مەجلیس گەرم دەکەین و موناقەشەمان دەبێت.
ئێمە هەموومان لە تەکیەی گەیلانی یەکمان ناسی و ئەم شەو حەوتەم شەوە لە خزمەت جەنابتداین، تا ئێستا حەوت مەجلیسی خۆش و ڕازاوە بە بۆن و بەرامەی زانایان و عارفان براوەتە سەر، ئەگەر برایان ڕێگە بدەن شەوی حەوتەم، باسی ئەو حیکایەتە دەکەم، کە ئێمەی کردە دۆست و لەناو هەزار موریدی باشی تەکیەی گەیلانیدا، ئێمە لە یەک نزیکتر بین. جا خاتوون نازانم خۆی وایە یان چی، دایمە لەناو حیکایەتەکاندا ڕێکەوت جێی تۆخی هەیە. عەسرێک سەرمەدی

قاسیدت نارد بۆ تەکیەی گەیلانی و پێت وتبوو بە خەلیفە بڵێت خاتوون حەوت موریدی دەوێت هەریەکەیان خەڵکی شارێک بن و لە موریدە دێرین و ڕەگداکوتراوەکان بن. خەلیفە حەمەومینی ڕیش چەرموو کاروباری تەکیە بەڕێوە دەبات، لە وەختی تەهلیلەی عەسراندا هاتە ژوور، چاوێکی بەناو ئەڵقە گەورەکەی تەکیەدا گێڕا، هەمووان لە پاڵ یەک بە چوارمشقی بە چاوی داخراوەوە دانیشتبووین و زیکری عەسرانەمان دەکرد. هات و یەک یەک دەستی خستە سەر شانمان و بە چاو تێی گەیاندین لە ئەڵقە بچینە دەر، ئێمەیش هاتینە لای دەرگاکە و چووینە چایخانەکەی بەشی لاخوارووی ناو تەکیە، کە بە حەوت پلەکانە بۆی دەهاتیتە خوار. سەرمەدی قاسید چاییەکی بە دەستەوە بوو، سەلامێکی کرد و وتی: برایانم خاتوون ناردوومی بە شوێن حەوت موریددا، حیکایەتخوان وتی: برۆ بۆ تەکیەی گەیلانی و قسە لەگەڵ ڕیش چەرموو بکە، ئەویش ئێوەی هەڵبژاردووە، تاوەکو تاریکی نەکردووە فەرموون بچین بۆ حیکایەتخانە. ئێمە هەر حەوتمان تا ئێستا زۆر بەر یەک نەکەوتبووین، سەلام و تەوقەی برایانە نەبێت زۆر لە ئەحواڵی یەک شارەزا نەبووین، بەڵام ڕیش چەرموو ئێمەی لە کەفی دەستی باشتر دەناسی. هەمیشە وەها بووە، هەر کەس دێتە تەکیە ئەو بە یەک نەزەر دەزانێ چییە و کێیە و قەستی لە هاتنە بازنەی دەروێشان چییە. ئەو شەوەی پێکەوە لەگەڵ سەرمەد چووینە حیکایەتخانە، تا ئەو حەلە کەسمان لە حیکایەتدا نەبووین، بەڵام لە قاوەخانەکاندا زۆرجار حیکایەتەکانی تۆ دەگێڕدرێتەوە، ئێمە دەترساین تووشمان بکەیت بە تووشی ئافرەت یان قەزییەیەکی خراپەوە، بەڵام وەکو دواتر بیستمان تۆ هێند ڕێزی خەلیفەت دەگرت، قسەت نەشکاند، وتبووی قبوڵی ناکەم تووشی تەهلوکەیان بکەی! ئەو حیکایەتەی تۆ لەو شەوەدا گێڕاوەتەوە وەها بوو:

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو، کەس لە بەندە فەقیرتر و دەستکورتتر نەبوو، دەگێڕنەوە لە بەغدا لەناو هەشت قبیلە و تیرەی زۆر دیاری عەرەباندا، کە بەرەی هەشت بران و هەریەکەیان سەرۆک خێڵی ناوچەیەکی گەورەیە، لەناو هەشتیاندا یەکێکان نۆبەرەی کچە و ئەوانی تر نۆبەرەیان کورە. کاتێک کچەی تاقانەی حەوت خێڵان، تەمەنی دەگاتە چواردە ساڵان، وەک مانگی ئاسمانان دەدرەوشێتەوە و چاوانی وەک ئەستێرە بە بریقەیە و زوڵفی وەک دوو ڕەشمار شۆڕبۆتەوە. یەک بە یەکی حەوت خێڵەکە دەنێرنە خوازبێنی کچی چواردە ساڵانی مانگی چواردە شەوان. بەڵام باوکی دەڵێت: ئەگەر بیدەم بە هەرکامیان ئەوی تریان خوێن دەڕژێت، بۆیە پرس بە موفتی دەکات چی بکات؟ ئەویش ئامۆجیاری دەکات، بڵێت تا نەبێتە هەژدە ساڵان بە شووی نادەم، بەشکو تا ئەو کاتە کوڕەکان بچن ژن بێن و نەکەونە گیانی یەک. میری باوکی کیژە وادەکات، بەڵام دەبینێت ڕۆژ دێت و ڕۆژ دەڕوات هەر حەوت کوڕە شێر و تیر لە یەک دەسوون و توندتر بۆ بردنەوەی کچەکەی کەمەریان بەستووە.

بەم شێوەیە کچە دەبێت هەژدە ساڵان و لە شای پەریان بێ وێنەترە. شەوێک هەر حەوت کوڕە مێزەر توندکردوو، خەنجەر لەبەر کەمەر، تیر لە شان و ئەسپ لەژێر و یەکی بە سندووقێک گەوهەر و زێڕ و مرواریییەوە، دەگەنە ماڵی میر و خوازبێنی کچەی دەکەن. باوکەی میر، نازانێت چ بکات و چیان وەڵام بداتەوە، دەڵێت: بچن کچە بانگ بکەن، بزانن خۆی کێ هەڵدەبژێرێ. بەو قسەیە خوێن چاوی هەموویان دەگرێ، لە ئەندەروون کچە گوێی لە قسەکەی باوکیەتی، میرە لەبەر خۆیەوە دەڵێت: خودایە فریامان کەویت، ئەم خوێنە خۆش کەیت. جا کەنیز دەنێرێت بە شوێن کچەیدا، کەنیز باسی چاوی سووری کوڕان و دەست لەسەر پشتووی خەنجەریان بۆ کیژە دەکات، ئەویش دەست بەرز دەکاتەوە دەڵێت:

- هۆ شێخی چارەساز بگەیتە فریام.

کەنیزان بە چاوی خۆیان دەبینین دێوێک پەیدا دەبێت و کچە لەسەر بەرە و بە پاڵی دوو سەرینەوە لەسەر دەستی هەڵدەگرێت و بەناو دیوەخاندا دەڕوات و مەحف دەبێتەوە. کاتێک کوڕانی تیرەی بەناوبانگی عەرەبان، ئەوە بەدی دەکەن و باوکە و نۆکەر و غوڵامان دێوە چاوە دەکەن، دەمیان دادەچەقن و سوبحانەڵا دەکەن. ئەوسا باوکە ئاهێکی دێتەوە، کەنیزان بانگ دەکات تا بزانێت ئەمە چی بوو، ئەوانیش دەڵێن:

- خاتوون هاواری لە شێخی چارساز کردووە.

حەوت کوڕە، لەو حیکایەتەدا، کە ئەم حەوت دەروێشە بووین، پێ لە ئاوزەنگ سوار ئەسپی کەحێلان دەبن و دەست لەسەر خەنجەر بە شوێن دێوەدا دەکەونە دەشتودەر. هەریەکیان ڕووە شوێنێ دەڕۆن، دەگەنە هەر ئاواییەک پرسیاری وەها شتێک دەکەن، ئەوانیش دەڵێن شتی وامان بەس لە باپیریمان بیستووە، کوا ئێستە شتی وا هەیە؟!

حیکایەت وەها نەقڵە، دوای حەوت شەو، یەکێک لە کوڕان، ڕێی دەکەوێتە مەملەکەتێک، تەماشا دەکات لە دوورەوە ماڵی ناو مەملەکەتەکە، هەمووی بەردن و یەکی کونێکیان تێدایە. وەختێک دەگاتە نزیک و دەڕوانێت چۆڵ و هۆڵە کەسی لێ نییە. سەر بە کونەبەردی یەکەمدا دەکات کە گەورە و فراوانە، کا ڕۆکراوە و پەشمێکی بەسەرا دراوە و سەرینێک دانراوە، لە پاڵیشیدا گۆزەیەک ئاو. ئەسپەکەی دەباتە لای خۆی و دەیبەستێتەوە و دەم دەنێ بە ئاوەکەوە و تێر دەخواتەوە و لێی دەخەوێ. هێند نابات کوڕە لە زرمەزرمێک خەبەری دەبێتەوە، تەماشا دەکات دێوێکی زەبەلاحی باڵا چل گەز، لەبەردەمیایەتی. کوڕە هەڵدەگرێت و پێی دەڵێت:

- ئایەمی! چۆن ناترسی و ئەسپ دەخەیتە ماڵی منەوە؟ نازانی من نوێژکەرم؟ ئێستە یەک فووت لێ دەکەم حەوت مەملەکەت نەگیرسێیتەوە.

دیوە وا دەڵێت و کوڕە چواردەوری پڕ دەبێت لە دێوان، تومەز ئەوێ شاری دێوانە و ئەمیش میریان. کوڕە دەپاڕێتەوە و دەلالێتەوە، میری دێوان خەریکە دڵی نەرم ببێت بەری بات، ڕێک لەو کاتەیا کوڕە خەنجەرێک دەردەهێنێت و لە دەستی دێوەی دەچەقێنێت. دێوەکان، کە ئەمە دەبینن دەڵێن ئەمە خراپەکارە با بیکوژین، وا لەوێ کوڕەش بە دەستی دێوەوە بە هەڵواسراوی ماوەتەوە، هەموویان دەست دەگرنەوە تا بیانداتێ و بیکوژن، لەو کاتەدا کوڕە بە موجیزە، قسەی کچەی مامی دەکاتەوە، دەڵێت:

- یا شێخی چارەساز فریام کەویت.

دیوەکان تەماشای یەک دەکەن و دەڵێن، خوا بتبەخشێ بەو. بەری دەدەن و دەیخەنە سەر ئەسپەکەی و دەیدەن بە دێوی تەتەر بۆ ماڵی شێخی چارەسازی ببات.

جا با ئێمە جێی بێڵین بچینە لای کوڕی دووەم. دووەم کوڕ دەڕوات دەڕوات تا نیوەشەوێک ڕێی دەکەوێتە ئاوەدانییەک، دنیا تاریک و نوتەکە خۆی بە خانێکدا دەکات و لێی ئەخەوێ. کاتێک بەیانی بەخەبەر دێت، تەماشا دەکات، قاچێکی بۆتە بەرد و ناجووڵێت. بە هەر جۆرێک بووە تەکان دەدات و هەڵدەستێ قاچە بە دوای خۆیدا ڕائەکێشێ و دەچێتە بەردەرگا، دەبینێت قاچێکی ئەسپەیشی بۆتە بەرد. کە سەیر دەکات ئەم شارە پڕە لە مرۆڤی بەرد و هەندێکیان تەواو بوون بە بەرد هەندێکیان نیوەیان، بازێکی تریان یەک قاچیان. دەپرسێت حیکایەتی ئەم شارە چییە و بۆ وەهایە؟ ئەوانیش دەڵێن:

وەختی خۆی خەڵکی ئەم مەملەکەتە کاری ناشرینیان کردووە، ئەویش دەڵێت:

- چۆن بووە؟
لە وەڵامدا دەڵێن:
- دەگێڕنەوە کاتی خۆی شێخێکی نوورانی باڵاناوەندی دەموچاو سوور و سپی، کە هێی نووری خوابووە، بە دەستێک جلی خاکی دڕاوەوە ڕێی دەکەوێتە ئێرە و لەمدیو دەروازەی شارەوە دەکەوێت و بە داروغە دەڵێت: چل شەوە زا نەچۆتە دەمم، غەریبم جامێ ئاوم بۆ بێنن، داروغەش خەڵکەکەی لێ کۆ دەکاتەوە، دەیکات بە قەشمەری و دەڵێت:
- سەیری ئەم پیرە بکەن، درۆ دەکات دەڵێت: چل شەوە ئاوم نەخواردووە، وەرە با کاسەیەک میزی بدەینێ ئەگەر بەڕاست چل شەو بێ ئاوی نەخواردبێتەوە مەجبورە بیخواتەوە، خۆ ئەگەر نەیخواتەوە، ئەوە لە ملی ئەدەین چونکە درۆی کردووە.
خەڵکەکەش دەیکەنە هوتافکێشان و کاسەیەک میزی بۆ دێنن، کاتێک شێخە ئەوە دەبینێت سەرێک دەلەقێنێ و دەڵێت:
- خودایە خۆت فەرمووتە ئەوەی عەزێتی ئەولیای من بدات، من خۆم عەزێتی ئەدەم. ئەگەر منت بە ئەولیای خۆت قبوڵە، بڕوانە حاڵم!
دەڵێن لەو کاتەدا لە ئاسمانانەوە خودا غوڵامێکی کاکۆل زێڕینی سیمانوورین بە جامێ ئاوی کەوسەرەوە نازڵ دەکات، ئاوکە دەکات بە دەمی شێخەوە. خەڵکەکە، ئەمە دەبینین، دەڵێن:
- پەنا بە خوا لەم سیحرباز و فیتنەیە.
کە غوڵامەکە ئەوە دەبیستێت دەست دەکات بە کەمەربەندەکەیدا و تورەکەیەک خۆڵ دەردێنێ، خۆڵەکە دەخاتە سەر دەستی و بەرەو خەڵک و مەملەکەت فووی لێ دەکات. ئەوکات هەر لەوێدا یەکی دەستێک یان قاچێکیان دەبێتە بەرد. ئیدی لەو کاتەوە ڕۆژ بە ڕۆژ تا بچنە تەمەنەوە زیاتر دەبنە بەرد، هیچ کەسێکیش ناتوانێت لەم شارە بترازێ، جادووەکەی وەهایە!
کابرای حیکایەتگۆ دەڵێت: قوڕت بەسەر تازە تۆیش دەبیتە بەرد و ناچاریت ڕۆژ بە ڕۆژ قورسیی خۆت هەڵگری تا ئەوەی سێیەکی لەشت دەبێتە بەرد و ڕۆژێک لە برساندا دەمریت. کوڕە زۆر دڵی تەنگ دەبێت و لەبەر خۆیەوە دەڵێت: چیم دابوو لە کچە مام، هەر کچ زۆر بوو، بۆ وام لە خۆم کرد؟ تازە دەرچوونم نییە. بەو پەرێشانییەوە دوعا دەکات و ئەپاڕێتەوە تا دەبێتە سێ شەو، دەستێکیشی دەبێتە بەرد. بەیانی ڕۆژی سێیەم، لە خانەکە دەچێتە دەر، دەڵێت: هۆ خەڵکی کۆبنەوە هۆ... خەڵکەکە لە دەوری گرد ئەبنەوە، ئەوەشی نیوەبەردە لە دوورەوە گوێ قوڵاخ دەبێت. دەڵێت: من دەزانم ئەو شێخە کێیە وەرن با بە یەکەوە داوای لێخۆشبوونی لێ بکەین، ئەوانیش دەس بە دوعا چاو دادەخەن و دەڵێن:
- هۆ شێخی چارەساز بگە فریامان.
سێ جار ئەوە دەڵێنەوە و کاتێک چاو دەکەنەوە هەموویان خۆشە بوون، ئینجا دەبینین دێوێک لەوێیە و دەڵێت کێ بوو هاواری کرد؟ شێخ منی ناردووە تا بیبەمە خزمەتی. بەو شێوەیە کوڕە و حەوت پیاوماقوڵی مەملەکەت دەچنە سەر دەستی دێوە، تا بیانبات بۆ لای شێخی چارەساز و دێوەش دەیانگەیێنێت بە شێخی چارەساز.
با واز لەمیش بێنین، بچینە لای کوڕی سێیەم. ئەم کوڕە هەر دەڕوات هەر دەڕوات تا بە ئاوایییەک دەگات. لە ڕێوە دێهاتییەکان ڕێنمایی دەکەن بچێتە ماڵی میری ئاوایی. ئەویش لە دەرگا دەدات، غوڵامان بەخێرهاتنی دەکەن، خزمەتی

دەکەن، نانی دەدەنێ، دەیخەوێنن، تا ماندووی ئەحەسێتەوە، ئەوسا کە لە خەو هەڵدەستێ دەیبەن بۆ لای میریان، ئەویش بەخێرهاتنی دەکات و دەڵێن:

- ئێمە خودامان جنۆکەیە، چل شەوە داوامان لێ کردووە یەکێک بۆ بەردەرگەمان بنێرێت، تا لە بری سەگە هەوشارەکەمان، کە تۆپیوە پاسی دەرگامان بکات، سوپاس بۆ خوامان کە تۆی نارد.

وەڵا کوڕە بە بیستنی ئەمە دەتۆقێ، غوڵامان کوڕە دەگرن و سەری دەتاشن و دوو ئەڵقەی زلی لە گوێ دەکەن، زنجیر دەخەنە ملی و لە بەردەرگا دەیبەستنەوە. کوڕە کە نۆبەرەی بابێتی لەبەر دۆتمامی بووە بە سەگی قاپیی جنۆکەپەرستان. گەلێک سەغلەت دەبێت، سێ شەو سێ ڕۆژ ئەمە حاڵیەتی، کەسێکی غەیری دی دەبێت بحەپێنێ، بۆ کەسانی ئاشناش کلکەسووتێ بکات. لەبەر خۆوە دەڵێت: جا من کچی مامم بۆچی بوو، تووشی ئەم تەهلوکەیەی کردم، هەر کچ زۆرە. بەو قسەیەدا بیری دوعای دۆتمامی خۆی دەکەوێتەوە، ئەویش دەڵێت:

- یا شێخی چارەساز بگەیتە فریام.

لە ناکاو دێوێک پەیدا دەبێت و زنجیری لە مل دەپسێنێ و دەڵێت: وەرە بتبەمە خزمەتی.

با واز لەمیش بێنین، بزانین کوڕی چوارەم چی لێ بەسەرهاتووە. کوڕی چوارەم دەڕوات تا دەگاتە مەملەکەتیکی ئاوەدانی سەرسەوز. دەچێتە ناو شارەکە دەبینێ هەمووان لەسەر جادە و لەسەر دیوار، ناو باخ و بوستان دانیشتوون شەراب دەخۆنەوە و پێدەکەنن، ئەویش دەست دەکات بە خواردنەوە پێکەنین. دوای سەعاتێک هەموویان دەست دەکەن بە ڕشتنی شەراب و تەشتەقوڕ دەگرنەوە، دەیگرنە سەریان و شین و ڕۆڕۆ دەکەن. ئەویش ناچار دەکەن دەست بکات بە لە خۆدان و شێوەنکردن و قوڕگرتنەخۆ، بە دەم قوڕگرتنەخۆوە لە کابرایەک دەپرسێ:

- لالۆ ئەوە چییە؟ بۆ ئەم خەڵکە وا دەکەن؟

ئەویش دەڵێت:

- هیچ مەپرسە، خەڵکی ئەم شارە دوعایان لێ کراوە.

ئەویش دەڵێت:

- ئەوە چۆن بووە؟ بۆم باس بکە.

پیاوە بە دەم لە خۆدان و خۆکوتانەوە دەڵێت:

وەختێ خۆی لەم شارە، خەڵکان هەموو سپێدەیەک بە دڵخۆشی ڕۆژ دەکەنەوە، شەراب هەنگوین دەخۆن و گۆرانی دەڵێنەوە. ڕۆژێک پیرەژنێک ڕێی دەکەوێتە ئەم شارە، دەگاتە ناوەندی شار، ڕوو دەکاتە خەڵکەکە و دەڵێت:

-نەختێ هەنگوینم بەنێ، نەفسم لەسەریێتی.

ئەوانیش بە دەم مەستیی و بێ ئاگاییەوە دەڵێن:

- پیری وەکو تۆ بمرێ باشترە، چی لە هەنگوین ئەکەی پیرەژن!

ژنە بەم قسەیە فرمێسک بە چاویا دێتە خوارەوە ئەڵێ:

- ئەی خوای بانی سەر، مادەم خۆفی تۆیان لە دڵ نییە، شاییان لێ بکەی بە شین.

ئیتر لەو کاتەوە لەناو دوعای پیرەژنەیا ئێمە هەموو بەیانییەک بە دەست خۆمان نییە تا دەمەو نیوەڕۆ دڵمان شایی و

بەزیم و سەفا ئەوێ. ئەوسا دڵمان تەنگ دەبێت و شەراب و جام فڕێ ئەدەین، خۆمان ئەکوتین و شیوەن ئەگێڕین. بەم شێوەیە کوڕەی چوارەم لەناو جەبری ئەو دوعایەدا هەتا سێ ڕۆژ لەو شارەدا شایی و شین دەکات. کوڕە بیر دەکاتەوە خودایە من بۆ وەهام لە خۆم کرد بۆ کچی مام، هەر کچ زۆر بوو. ئەمە کەی حاڵە وەها جەوانی خۆم بفەوتێنم، جا بە کچی مامیدا ناوی شێخەی بیر دەکەوێتەوە. چاو دادەخات و بە دەم قوڕلەخۆگرتنەوە دەڵێت:

- هۆ شێخەی چارساز بگەیتە فریام.

هێند نازانێ دێوێک لەبەردەمی ڕاست دەبێتەوە، دەڵێ: شێخ ناردوومی بە شوێن تۆدا وەرە بتبەم.

بەوشێوەیە ئەویش دەڕوات. ئەوسا دەچینە لای کوڕەی پێنجەم، کوڕی پێنجەم دەڕوات دەڕوات ماندوو و چاونیشتوو، بەسەر ئەسپەکەیەوە خەوەنوچکەیەتی، دەبینێ لە دوورەوە ئاواییەک دیارە، خۆی دەکات بە ئاواییدا، دەبینێت چۆڵە و کەس دیار نییە، لە ناکاو یەکێک دەست دەخاتە سەرشانی و دەڵێت:

- بەخێربێی بۆ شاری غولامان!

کە ئاوڕ دەداتەوە چی دەبینێ، غولامیکی ڕەشی لچ ئەستووری، ئەڵقە لە گوێی، سنگ پانی ڕووت تەنها پارچە پەڕۆیەکی بە خوار ناوکیا داوە، دەڵێت:

- سالانێکە ئێمە غولامی ئێوەی میر و شازادەی سپیانین، ئێستە بە دوا تۆ غولامی ئێمەیت.

ملی دەگرێت و دەیباتە کۆشکێکی گەورەی شکۆمەندی بە چلچرا و شەمعدانی زیو و زێڕ ڕازاوە. حەفتا غولام دانیشتوون یەکی شازادەیەکیان لەسەر کۆشە، دەچێتە گۆشەیەکەوە کوڕێکی خۆی ئاسا، بەڵام مناڵکار دەبینێت، دەپرسێت:

-ئەمە چییە برام؟

ئەویش دەڵێت:

- حیکایەتی ئێرە دووردرێژە.

کوڕەش دەڵێت:

- ئەوە چۆنە ئەو حیکایەتە بۆم باس بکە.

کوڕەی مێردمنداڵ دەڵێت:

وەکو من بیستوومە. دەڵێن: ئەم شارە تەنها حەفتا غولامی تیا ئەژی، جوانترین شاری دنیایە، لە شاری هیچ پاشایەک ناچێت. ئەم حەفتا غولامە هەریەکەیان شازنی ولاتی خۆیانیان بە مەرجان و سندووقی ئاڵتوونی و قوبە و لەرزانەوە، هەڵگرتووە و لێرە دەژین. ئێستە دەیانەوێت تۆ بکەنە غولامی خۆیان، وەک چۆن منیان کردووە. شەو و ڕۆژ دەبێت دەستەونەزەر بوەستیت. کوڕە سێ ڕۆژ لەم حاڵ و مەسەلەیە ئەوەستێ، دواجار تەحەمولی نامێنێ، بیر دەکاتەوە لەبەر کیژی مامی تووشی ئەو گێچەڵی وا هاتووە، ئەگەر تا هەتایە حاڵی وەهابێت چی؟ پەشیمانانە دەڵێت: من بۆ وام لە خۆم کرد، هەر کچ زۆر بوو، جا ئەویش وەک کوڕەکانی تر دوعای کچە مامی بیر دەکەوێتەوە و چاو دەنوقێنێت و دەڵێت:

- شێخەی چارساز بگەیتە دادم.

چاو ناکاتەوە دیوێکی مل ئەستوور لەبەردەمی حازر دەبێت: وەرە سەر دەستم، شێخ ناردوومی بتبەمە خزمەتی. بەو تەرزە کوڕی پێنجەمیش دەچێتە لای شێخەی چارەساز.

با بچینە لای کوڕی شەشەم. بە وێنەی ئەوان ئەویش دەڕوات هەر دەڕوات، تا دەگاتە دەروازەی شارێک، پاسەوانی دەروازە پێی دەڵێت:

هۆ شواڕەسوار؛ مەچۆرە ئەم شارە، تووشی تەهلوکە ئەبیت.

ئەویش دەڵێت:

- بۆچی؟

پاسەوان جەوابی دەداتەوە:

- کەس لەم شارەدا هیچی بیر نامێنێت. کەس بیری نییە کێ کوڕی کێیە و کێ لە کێ بووە. هەموو ڕۆژێک لە نوێ دەست پێ دەکەنەوە. ئەگەر پیاوێک دوێنێ لەگەڵ ژنەکەی بووبێ، بەیانی سوێند دەخوات قەت ئەو ژنەی نەدیوە و ژنی فلانەکەس هیی ئەمە لێی داگیرکراوە. سوڵتان دەڵێت: من وەزیر بووم و نۆکەر دەڵێت من سوڵتان بووم، چۆن منتان بە تاکتیک دەرکرد. بەو شێوەیە کەس هیچی بیر نییە، لەو شارەدا هەموو شتی ناڕەوا ڕەوایە. کوڕە دەڵێت:

- وات لێکردم ببینم تازە هەر ئەچم.

پاسەوان دەڵێت:

- مادەم هەر دەڕۆیت، ئامۆجیاریت دەکەم، لەسەر پارچە چەرمێک ناو و ناونیشان و حیکایەتی خۆت بنووسەوە، لە باخەڵتی بنێ.

ئەویش دەڵێت:

- بە قسەت دەکەم. وەها دەکات، و بە سواری بەرەو ناو شار دەچێت. لە دەروازە ڕەت دەبێت دەگاتە شار و ناگات، جحێڵێکی جوانیی نازدار دێتە بەردەمی و سوێند دەخوات، کە ئەو پیاوە سکی پڕ کردووە، وا سکی نۆ مانگە دەبێت ئەم هەقی بداتێ. داڕۆغە بانگ دەکەن و ئەویش قۆڵبەستی دەکات، بەرەو زیندانی ئەیبات. کاتێک دەگەنە سەرای شار، پیرەژنێکی پشت چەماوەی قژسووری کوڵوانە لەکوڵ، دەڵێت: داڕۆغە خوا دەست بە باڵتەوە بگرێت ئەوە کوڕەکەمە لە شەڕ هێناوتەتەوە دەک عومرت درێژ بێت؟ لە داڕۆغەی وەردەگرێت و دەیباتەماڵەوە، کوڕە دەڵێت: ئێرە ئەمنە بزانم چی ئەبێت. ئەو شەوە دەخەوێت، بەیانی کە هەڵدەستێ هەست دەکات سەری قورسە و هیچی بیر نییە، پیرەژنە دارێک هەڵدەگرێت و کوڕە تا حەوشە ڕاو دەنێت. دەڵێت: کەس نازانێ ئەم بێشەرەفە بۆ هاتۆتە ماڵی من و لێرە چی دەکات؟ تف لە شەرەفت تەماح لە پیرەژنی وەک من دەکەیت. ئیتر کوڕە دەچێتە ناو مزگەوت و دەڵێت: من مەلاتانم، دەست دەکات بە نوێژکردن و وتاردان هەمووان بارەکەڵای دەکەن، کە بۆچی ماوەیەکە دیار نییە و خوتبەی نەداوە، تا عەسر وەها دەبێت، دەمەو عەسر ئاغایەکی پیر دێت، پەلی دەگرێت دەڵێت: ساختەچی وا، ئەوە مەیتەری حەیوانەکانی منە، وەرە با بڕۆین، ئەویش قەناعەت دەکات و لەگەڵی دەڕوات... ئەو سێ ڕۆژە ئەوە حاڵی دەبێت. بەیانی ڕۆژی سێیەم، کە لە کەلاوەیەکدا کەوتووە منداڵان دەڵێن:

- تۆ کۆنترین شێتی ئەم مەملەکەتەیت.

دەست بۆ گیرفانی دەبات شتێک دەربێنێت تێیان بگرێت، پارچە چەرمەکە دەردێنێ و دەست دەکات بە خوێندنەوەی بیری دەکەوێتەوە، کە ئەم چی بووە و بۆچی ڕێی کەوتۆتە وەها شارێک. بە خۆی دەڵێت: جا باشە کچی مامم ئەوەی ئەهێنا

من هەموو تەمەنم خەریکی ئەم پەند و مەخسەرەیە بم؟! بە وتنی ئەوە، قسەی کچی مامی بیر دەکەویتەوە، چاو دەنوقێنێ و بانگی شێخەی چارساز دەکات تا چۆن کچەی ڕزگار کرد ئەمیش ڕزگار بکات. هێند نابات دێویک لەبەردەمی حازر دەبێت و دەڵێت: هۆ بەشەر شێخ ناردوومی بە شوێنتا تا بتبەمە خزمەتی. دێوە ئەویش ئەبات.
ماوەتەوە سەر کوڕەی حەوتەمی خوازبێنیکەرە. ئەویش بە دەشت و کویا دەڕوات دەڕوات، تا دەگاتە شارێکی ئاودان لە چەقی بیاباندا. کاتێک دەچێتە ناو شار دەبینێ خودا تۆبە هەر لەشی گەورەیە سەری بچووکی پێوەیە، لەشی ژن سەری پیاوی سمڵ ئەستوور و لەشی پیاو سەری ژنی بەناز و ئەدای پێوەیە. بەو دیمەنە دەتۆقێ و زارەترەک دەبێت. لەناو شار لە پیاوێک دەپرسێ:
- هۆ لالۆ ئەوە چییە و حیکایەتی ئەم شارە چۆنە؟
ئەویش دەڵێت:
- دووردودرێژە.
دەڵێت:
- بۆم باسکە.
ئەویش دەڵێت:
- وەختی خۆی زاهیدێک لەم شارە ئەژی، تاقە کوڕێکی هەیە بە ئاداب و ئسوڵ بەخێوی دەکات، فێری دادپەروەری و ڕێز و ئیخلاس و برایەتی دەکات. شەوێک بۆ نوێژی خەوتنان دەچێت بەرەو مزگەوت، لە ڕێگا دوو سەرخۆش دەبینێ خەنجەریان بۆ یەک هەڵکێشاوە و دەیانەوێ یەک بکوژن، ئەویش دەچێتە ناوبژیان، بەڵام دوو مەستە بە هەردووکیان دەکەونە گیانی و ئەو کاتەش داروغەی شار بەوێدا تێدەپەڕێت، بێ ئەوەی بزانێ حاڵ و مەسەلە چۆنە، شمشێر دەردێنێ و سەری کوڕی زاهیدە دەپەڕێنێت. سەرەکە دەکەوێت و لەبەر تیشکی ئاگردانی کۆڵاندا دەبینرێت، دەڕوانن کوڕی زاهیدە، دوو سەرخۆشە دێنەهۆش و داروغە زارەترەک دەبێت. نازانن چی بکەن تا زاهید دوعایان لێ نەکات، بۆیە بەو شەوە داروغە دەچێت لە زیندان پیاوێک دێنێت تورەکەی بەسەردا دەکات و جادووگەری مەملەکەت بانگ دەکات، یەک کیسە لیرەی دەداتێ و دەڵێت: دەبێت سەری کوڕی زاهید بکەیت بە لەشی ئەم زیندانییەوە، ئەویش دەڵێت: سەهلە ئێستە دەیکەم، زیندانییە کەسێکی چوارشانەی بەرزی تێکسمڕاوە، کوڕی زاهیدیش تازە نەورەستەی حەڤدە ساڵان. زیندانەی کەساس سەر دەبڕن و بە پەلە سەری زاهیدە دەکەن بە لەشی زیندووی زیندانییەوە. ئەوسا ڕەوانەی ماڵەوەی دەکەن. لە دەرگا دەدات و خۆی دەخات بەسەر پێڵاوی باوکیا و دەڵێت:
- باوکە خەڵکی شارەکەت وەها زوڵمێکیان لێ کردم.
زاهیدە نەعرەتەیەک دەکێشێ، دەڵێت:
- خوایە تووشی سزایان بکەیت.
دوای ئەوە کوڕەی گیان دەسپێرێ، زاهید سەری کوڕەی بە جیا و لەشی زیندانییەش بە جیا دەنێژێ و ئەو شارە جێ دێڵێ. دەگێڕنەوە بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی دەست دەکرێت بە کوشتوبڕ لەناو شاردا، ئاژاوە و گێچەڵێک دروست دەبێت، بە دەیان سەر لەوێ کەوتوون لەش زیندوو هەر کەس و بۆ سەر دەگەڕێت لە حەژمەت ئازار چی بەردەست بکەوێت

ویردێک کە یەکەمجار جادووباز وتوویەتی دەیڵێتەوە و سەرەکە بە خۆیەوە دەلکێنێ.

کاتێ پیاوە لە گێرانەوەی حیکایەتی شارەکە دەبێتەوە، دەبێتە گوڵمەزێک بە جارێ دەست دەکەن بە سەرپەڕاندن، سەری ئەمیشی بەر دەکەوێت، لە تاو ئازار لوول دەخوات و ئەبوورێتەوە، کاتێ هۆشی دێتەوە دەست دەگێرێت سەرێک بۆ خۆی دەدۆزێتەوە، دەینێ بە خۆیەوە، کە تەماشا دەکات کەللەی پیرەژنەیەکی هەشتا ساڵە، هەتا سێ ڕۆژ بەو چەشنە دەبێت، نە خۆراکی بۆ ئەخورێ نە خەوی لێ دەکەوێ. بە خۆی دەڵێت: باشە جا کچی مامم ئەوەی دێنا من خۆم تووشی ئەو سەغڵەتییە کرد، هەر کچ زۆر بوو. ئێستە من چۆن ڕزگارم بێت؟ لەپڕ بە کچی مامیدا بیری ناوی شێخەی دەکەوێتەوە و دەڵێت:

- یا شێخی چارەساز، بگەیتە فریام.

دێوێک لەبەردەمی حازر دەبێت، سەری لەسەر دەستی داناوە و دەڵێت: ئەو سەرە فڕێ بدە شێخی چارەساز ناردوویەتی بە شوێنتدا با بڕۆین. بەو شێوەیە هەر حەوت کوڕەی خوازبێنی کەری کچە مام، کە لە دەشتودەر وەیڵان بوون و تووشی سەمەرە هاتن، لە تەکیەی شێخی چارەسازدا یەک دەگرنەوە. خاتوون ئەو شەوەی کە هەر حەوتمان دوای ئەو هەموو شتە سەیر و سەمەرە بەریەک کەوتین، یەکمان خۆشویست. چونکە حیکایەتەکە زۆر زۆر درێژ بووەو و ئێمەیش زۆر زۆر ماندووو بووین.

حیکایەتەکە وەها بوو:

کاتێک یەک بە یەک دێوە دەیانبات بۆ تەکیەیەک و دایان دەنێت، تەکیەیەکی کاکی بە کاکی زۆر زۆر گەورە کە سەد هەزار موریدی تێدایە و لە عەقڵی مرۆڤدا نییە، دێوان و جنۆکان و پەریان و بەشەران پێکەوە لەوێن و پیاوان و ژنان یادی خوا دەکەن. لە ژوورێکی ناو تەکیەدا، کە تایبەت بوو بۆ ڕێبواران دوای چل و سێ ڕۆژ گەڕان، هەموویان بە یەک شەو دەگەنە ژووری غەریبان، لەوێ یەکدی لە ئامێز دەگرن، بە دەم گریانەوە حەقایەتی خۆیان بۆ یەک دەگێڕنەوە.

لەو ژوورە تا سێ ڕۆژ کەس ناپرسێ ئێوە کێن و چیتان دەوێ، خزمەتکاران و موریدان خزمەتیان دەکەن، پاش سێ ڕۆژە، دەڵێن فەرموون بچنە خزمەتی شێخەی چارەساز. کاتێک دەبینن، پیاوێکی باڵاناوەندی لاوازی ڕێش سپیی نوورانی، بە عەبایەکی سووروام و مێزەرێکی شینەوە، کە تەنها مشتێ ئێسقانە لە ساحەیەکی کاکی بە کاکی بە جارێ هەزاران دەروێش بە ئەڵقە دانیشتوون و ئەویش وەک چەقی گۆی زەوی لە ناوەڕاستیاندا مۆعیزە دەکات.

کە حەوت کوڕە ئەمە ئەبینن، دڵیان گەرم دەبێت، جەزبە دەیانگرێ و بەرەو ناوەڕاست ئەچن، خۆیان دەدەن بەسەر پێی شێخەی چارساز دا و دەڵێن:

- قوربان بە غوڵامی دەرگای خۆتمان قبوڵ بکە، فێری سیفاتی بەشەریمان بکە.

شێخە دەستیان دەگرێت و بەرزیان دەکاتەوە سەری یەک بە یەکیان ماچ دەکات و دەڵێت ئێوە کوڕانی منن. ئیتر بەو شێوەیە حەوت کوڕەی دڕ، پشت لە دنیا دەکەن و دەبنە مورید، کاتێک جۆیای کچەی ئامۆزیان دەبن، شێخە دەفەرمووێت کێی دەیەوێت بابیدەم بەو، هەر حەوتیان دەڵێن: قوربان لە خوشکمان فەرزترە، چونکە دوعای ئەو ئێمەیشی ڕزگار کرد. لەو حەنەدا کچە سەلام دەکات و بە شێخ دەڵێت: قوربان دەمەوێ لە یەکێک لە خزمەتکارەکانی ئێرەم مارەم بکەی تا بچمەوە لای بابم، لە پاشان مارەی دەکەن لە کوڕی یەکێک لە پاشاکان کە بۆتە مورید و تەرکی دنیای کردووە و

دەگەڕێنەوە بۆ ماڵی بابی.

خاتوون ئەو حیکایەتە درێژەی تۆ بەندە 'نعمت اللەی کوفی' و (یەزدانی مازەندەرانی، دەروێش مینەی مسگەر، چراغ عەلی دەستگیر، بابا جان وێردی، ئاماجی خان، غولام وەلی)یت کرد بە دۆستی یەک. ئێمە لە خوای موتەعال دەپاڕێینەوە یارمەتیی تۆ بدات، شێخەی چارەساز وەک حیکایەتەکەی خۆت بگاتە دادت و هەموو شتێکیت بیر بکەوێتەوە.

# شەوی پازدەهەم

بە ناوی خودای خاوەن دەسەڵات و گەورە و سوڵتانی هەموو جیهان دەست پێدەکەم، کە هەمووان موڵکی ئەو و لە جوغزی وی داین. من سیمورغم... عەقڵی کامڵ و دڵی بینا ئەمبینێ. پێش ئەوەی بێمە ناو مەملەکەتی تۆ و لە کێوی مەملەکەت بگیرسێمەوە، حەوت پشتی ئێمە، لە کێوی قاف بووە. هەندێک حیکایەت، ئەسڵ و فەسڵمان بۆ کێوی ئەلبورز دەگێڕنەوە، هەندێکی تر کێوێک لە هێڵی کەمەرەی زەوی، بەڵام هێندەی من بیتەوە یادم دوو پشتمان لە کێوی قاف بووە.

خاتوون، نامەوێ وەک تاوس بە غرورەوە لە جوانی زاهیری خۆم بدوێم، کە عارفان باسی دەکەن و دەڵێن بەو جوانییەوە نازا، لەگەڵ ئادەم و حەوا ئەویش بەر نەفرین کەوت و لە بەهەشت دەرکرا. ناشرینی قاچیشی حیکایەت لەو شکستە دەکات. نامەوێت وەک تەیرە لەخۆباییەکان قسان بکەم، بەڵام قەدەری ئێمە و نەسلی ئێمە وەهایە لە دێرزەمانەوە وەک عەقڵی تەواو، دڵی کراوە تەماشا کراوین. سیمبولی نووری ئیلاهین و ڕێنماییکەرین. لە حیکایەتی ڕۆژهەڵاتدا کەس وەک ئێمە خاوەن خەسڵەت و بەها نییە. هەڵبەت بە چاوپۆشیکردن لەو حیکایەتەی کە ڕۆژێک لای دوڕ محەممەدی کتێبدار خوێندمەوە و دڵی ڕەنجاندم، من تا ئێستا وەها حیکایەتێکم لە بارەی خۆمانەوە نەبیستبوو.

دوڕ محەمەد جارجارە دێتە لام نیقاش دەکەین، ڕۆژێک باس هاتە سەر ڕەچەڵە و بنەماڵەی ئێمە، من ناوی ئەو کتێبانەم بۆ هێنا کە نمای حەقیقەتین، باسی سەنایی و غەزالی و نیشابووریم دەکرد. بە وردی عەقڵی سووری سوهرەوەردیم بۆ ڕاڤە کرد. ئەویش بە موناقەشەیەکی ورد و پرسیاراوی بە کتێبی (بحر الفوائد) موتەحەیری کردم، یەکێکە لە کتێبە کۆنەکان و وەختی خۆی بۆ یەکێک لە پاشاکانی شام نووسراوە. حیکایەتی سیمورغی تێدایە. کتێبدار بەوپەڕی دڵی گەورەیەوە نوسخەی دەستخەتی دێرینی بەحروفوائدی بۆ هێنام. سەیرم لەو پیاوە دێت، تا ئێستا کتێب نییە لە مەشریق زەمین نووسرابێت و ئەو ئاگای لێ نەبێت. نازانم چۆن بڕوای پێکردم و کتێبەی دایە دەستم، نەترسا لەوەی ئەگەر من حیکایەتی خۆمانم بیست، کتێبە بفەوتێنم تا کەس بەو حیکایەتە نەزانێت. لە بابی پێنجەمی کتێبەکەدا سیمورغ دەڵێت: من قەزاوقەدەر دەبرم. حیکایەتەکە بۆ سەردەمی سولەیمان پێغەمبەر، ڕەزای خوای لێ بێت دەگەڕێتەوە:

ڕۆژێک حەزرەتی سولەیمان ڕەزای خوای لێ بێت، وتی: هەرچی لە جیهاندایە قەزاوقەدەری خودایە. سیمورغ وتی: قەزاوقەدەر چی پێ دەکرێت؟ سولەیمان فەرمووی: شتێکت بۆ باس دەکەم کە لە عەجبایەتییەکانی جیهانە، تا بڕوات بە قەزاوقەدەر هەبێت. فەرمووی: جوبریل هەواڵی پێدام کە سوڵتانی جیهان، کچێکی بە پادشای مەشریق بەخشی و کوڕێکیش بە پادشای مەغریب، هەردووکیان بە یەک دەگەن و بۆ یەک دەبن. سیمورغ گوتی:



- من ئەم قەزاوقەدەرە دەبڕم، ئەو دوانە لێک جیا دەکەمەوە. پێغەمبەر وتی:
- درۆ دەکەی ناتوانی. سیمورغ وتی:
- دەتوانم.
سولەیمان پێغەمبەر مەلانی بە شاهێد گرت، لەنێو مەلاندا کونەپەپوو کە لەناو وێرانەدایە، بووە کەفیلی. سیمورغ کە خودای عیزەوەجەل سەری وەک ئایەم و جەستەی کێوی و دەستوپەنجەی جیاواز دروستکردووە، بەرەو شاری شازادە هەڵفڕی. ئەو عانە کەنیزان لە دەوری کیژەی مەلۆتکەی نێو لانکە، جەم بوون و شیریان پێدەدا، سیمورغ بە چڕنووکی

شازادە و لانكەی هەڵگرت و بەرەو دەریا ڕفاندی. بردی لەسەر دارێكی بڵندی، چیایەكی دورگەیەكی نێوەڕاستی دەریاكە، كە هەرگیز كەس پێی نەدەگەیشت، بێشكەكەی دانا. پاشان هەر لەنێو لقوپۆپە زۆر و چڕەكانی ئەو درەختەدا هێلانەیەكی هوراوی بۆ خۆی و شازادەی چكۆل پێكەوە نا و هیچ بەشەرێك ئاگای لەو كیژە نەما.
سیمورغ بە ڕۆژدا دەچووە خزمەت سولەیمان و شەوانەش دەگەڕایەوە لای خاتوونە شازادەكە. لەولایشەوە شازادەی مەغریب زەمین لە ماڵی پادشای باوكیدا گەورە دەبوو. بە قەزای ئاسمانی و ئیلاهی، ڕۆژێك شازادەی مەغریب زەمین كەشتی دروستكرد و لە دەریای هاویشت، وەزیران و غوڵامانێكی زۆر و چەندان تەیر و مەلی لەگەڵ خۆی هەڵگرت، بەرەو دڵی دەریا كەوتە ڕێ، لە شاری خۆیەوە تا شوێنی ئەو كچە، سەد ساڵ ڕێ بوو. خودای موتەعال بایەكی نارد تا بە یەك مانگ كوڕە گەیشتە دوورگە دوورەكەی شازادە خانم. شازادە گەیشتە ئەوێ و گوێی لە دەنگێكی سەیر بوو، كە دەڕوانێت كچێكی چەشنی پەری خەمبارانە لەنێو هێلانەیەكدا بۆ دوور دەڕوانێ و ئاواز دەچڕێت، كوڕە سڵاو لە شازادە خاتوون دەكات، شازادە خاتوون تا ئەو دەمە ئاوازی هیچ بەنی ئادەمێكی نەبیستبوو، زۆر ورد تەماشای كوڕەی كرد، هێندەی نەبرد عاشقی یەك بوون، بانگی یەكیان كرد:
- تۆ كێی؟ خودای موتەعال كچەی فێری قسەكرد و وتی:
- من كچی سیمورغم، تا ئێستا دایكم نەبێت هیچ كەسم نەدیتووە، ئەتۆ لە شێوەدا لە من دەكەیت. پرسی سیمورغ لە كوێیە؟ وتی:
- لە خزمەتی سولەیمان پێغەمبەر دایە. وتی:
- بەڵێ سولەیمان پێغەمبەر ئەو كەسەی كە باوكی ئەوی كوشتووە، شازادە دەستی كرد بە گریان. كچ وتی:
- بۆ دەگریت؟ وتی:
- بۆ ئەوە دەگریم تۆ بەو چیهرە و جەمال و كەمالەوە، بە تاقی تەنیا و بێكەس لێرەیت، لە گێتیدا جوانانی وەكو تۆ لەسەر تەختی زێڕین و سیمین دانیشتوون، فوستانی حەریر و ئاوریشمینیان لەبەردایە. وتی:
-چارەم چییە؟ من هیچ ڕێیەك شك نابەم. وتی:
- تەكبیر ئەوەیە لای سیمورغ دەست بە گریە و زاری بكەیت (من ناتوانم تەنیا بم) بزانین ئەو چی دەڵێ. كچە دەستی بە گریە كرد، كاتێ وەختی نوێژی شێوان سیمورغ گەڕایەوە، دیتی كە زاری دەكات و دەگری. وتی:
- ئەمڕۆ چیت بەسەرهاتووە؟ وتی:
- ناتوانم بە تەنیا بم. وتی:
- خەمت نەبێت دەچمە لای سولەیمان و ئیزنی لێ وەردەگرم تا ڕۆژێك لای تۆ و ڕۆژێك لای ئەو بم. سیموغە ڕۆیشت. كچە، ئەمەی بۆ شازادەی گێڕایەوە، گوتی:
- خێر لەوەدایە من ئەسپێك بكوژم و كەوڵەكەی بە قیر، میسك و عەنبەر و ئاڵتوون بیرازێنمەوە بچمە ناوی، لای كەشتییەكە دابنێم. ئەوسا كچە بە سیمورغی وت:
- ئەوە چییە دیارە لێمەوە؟ سیمورغ وتی:
- ئەوە كەشتییە و ئەوەش مردارەوەبوویەكە. وتی:

- بۆمی بهێنە تا هاوەڵم بێت. سیمورغە کە نەیزانی کوڕەی لە ناودایە هێنای، کچە خورسەند و خورەم بوو:
- 'وای دایە، چەندە باشە!' سیمورغ پێکەنی و وتی:
- ئەگەر من پێشتر زانیبام تۆ بەوە شاد و گوشاد دەبیت، زووتر بۆم دەهێنایت.
وەختێ سیمورغە ڕۆیشت شازادە لە کەوڵە هاتە دەر، پێکەوە یاری و دەستبازی و خۆشی و کەیفیان کرد. بە قەزای عیزەوەجەل کچە لە شازادە دووگیان بوو. ئەودەم جوبریل پەیامی بۆ سولەیمان هێنا: چۆن خودا داینابوو بە یەک بگەن، وەها پێک گەیشتن، قەزا بە موقەزی گەیشت. سولەیمان بانگی مەیتەری مەلانی کرد و فەرمانی دا مەلانی ئەرز و ئاسمان، وشکانی و دەریایی، ئینس و جن کۆبنەوە. هەموویان کۆبوونەوە، سولەیمان فەرمووی:
'ئەمڕۆ ڕۆژێکی عەجیبە! ڕووی لە سیمورغ کرد:
- تۆ وتبووت دەست دەخەمە قەزای خودا و نایەڵم ڕووبات. وتی:
- بەڵێ.
سولەیمان وتی:
- دۆتەی پاشا بە شازادە گەیشت، هەردووکیان لەنێو پێستەکەدان، بڕۆ بیبینە!
سیمورغ کەوڵەکەی هێنا، سولەیمان فەرمووی:
- ئیمان بە قەزای خودا بێنە، هەردووکیان لەناو کەوڵەکەدان. هەردووکیانیان دەرهێنا. ئەوکات سیمورغ ترسا و شەرمەزار بوو، باڵی گرت بەرەو غەرب، وە سوێندی خوارد لە تاو خەجاڵەتی و شەرم نابێ هیچ مەل و پەڕندەیەک بیبینێ. هەر لەبەر ئەوەشە کە لەم زەمانەدا کەس سیمورغی نەدیوە. هەروەها کونەپەپووش کە زەمانەتی کردبوو، ئەویش هەڵات، قەولی دا شەوانە نەبێت بە ڕۆژ نەیەتە دەر. ئاوها پێغەمبەر خوتبەیەکی بۆ مەلان و ئینس و جن و دێو و پەریان دا، پاشان کچەی بە کوڕەدا. خوا هەموو لایەک سەرکەوتوو بکات. والله موفق.
کاتێک لە حیکایەتەکە بوومەوە کتێبەی بەحرو فەوائیدم، خستە ئەولا و دڵم گڕی گرت، لە شەقەی باڵم دا و ڕۆیشتم، ماندووانە ڕۆیشتم تا لە دەشتێکی دەرەوەی شوورەی دووەمی مەملەکەت نیشتمەوە و بانگم هەڵدا، نازانم هۆشم بە خۆمەوە بوو یان نا، هۆشیار بووم یان بێدار، بەڵام هەموو گیانم لە حەژمت ئازار ئەیزوقاند، ئەوەندە بە دەم گریانەوە خۆڵەپەتانێم کردبوو. دڵم شکا بوو لە تاو ئەو ڕووقایمییەی بە ناوی ماجرای سیمورغ لەناو ڕکێفی پێغەمبەر سولەیماندا، درابووە پاڵ باپیرانمان. هەموو هەیبەت و غروری من وردببوو. لەبەردەم کێ؟ لەبەردەم مەکتەبەدار؟ بێ گومان نەخێر، ئەی لەبەردەم کێ؟ هەستم کرد بووراومەتەوە. ئەوکات تەماشا دەکەم پیاوێکی باڵامناوەندی ئەسمەری قژ قەترانی لەناو دەستێ جلی کەتانی سپیدا، بە کەشکۆڵێکەوە، لامایە و لەبەر خۆوە ویرد و دوعا دەخوێنێت خەریکی ورتەورتە. مێزەرەی حەوت گەزەی کردۆتەوە و باڵم دەپێچێ. من تا ئەو کاتە نەمدەزانی بێ لە مەکتەبدار لەم مەملەکەتە کەسانێکی تریش دەتوانن بمبینن. کە دەروێشەم دی شەرمم بە خۆم هات، وتم: ئێستە ئەویش حیکایەتی من دەزانێ و بیر لە گوستاخییەکەم بەرامبەر بە قەدەری ئیلاهی دەکاتەوە، بۆ چاوقایمیمان، سەرزەنشتم دەکات. دەروێشە بەوپەڕی هێمنی خۆیەوە، چمکی فوستانە کەتانەکەی هێنا و چاومی پێ سڕی، دەمی لە دوعا کەوت، دانەوییەوە سنگی ماچ کردم و وتی:
- ڕەحمەتی خوات لێ بێت، وا تۆم دۆزییەوە و نائومێد نەبووم. ئینجا من ئاهێکم هاتەوە بەر. وتم:

- بەنی ئایەم تۆ من ئەناسی؟ دەروێشە وتی:
- تۆ نمای باتینت، هەر کەس بتبینێت، دڵی خۆشە! تۆ نیشانەی دۆزینەوە و گەیشتن و کامڵبوونی. ئەوسا پێکەوە دەستمانکرد بە قسەوباس و خواست. وتی:
- من دەورێشی سوهرەوەردیم و لە موریدانی تەکیەی گەیلانیم. لەناو خەڵکی ڕەشۆکیدا وا باوە، سیمورغ ناوی هەیە و ڕەنگی نییە، ئەفسانەیە بیری لێ دەکرێتەوە، بەڵام درکی پێ ناکریت. ئەو دەروێشە کە ئێستە برادەری گیانی و هاودەمی یەکین ناوی 'نعمت الله کوفی'یە. لێم پرسی برادەر، دڵخۆشی تۆ بۆ چییە؟ بینیی من چ دەردی تۆ دەوا دەکات؟ ئەو وتی: تۆ هیچ لە بارەی خۆتەوە دەزانی لە حیکایەتی سەفیری سیمورغی شێخ شەهابەدینی سوهرەوەردی دا؟ منیش وتم: بەڵێ کەس وەک ئەو وەسفی ئێمە ناکات. وتی: کەوایە دەبێت بزانی بۆ دڵم بە بینینی تۆ خۆشە! من حەزم کرد زیاتر بڵێت تا خەمم بە باچێ، وتم:
- چما سوودی هەیە؟ ئەوسا دەروێشی کوفی وتی:
- شێخی ئێمە لە باسی سیمورغدا دەفەرموێت:
لە کێوی قافە، هەر کەس نەخۆش و دەردەدار بێت لە سایەی ئەودا دانیشتێت دەردی دەوایە، بەڵەکی چاک دەکاتەوە، پەڵە و ڕەشی و گەڕی دەگۆڕێت، بێ ئەوەی بجووڵێ دەفرێ، دەپەڕێت بێ برینی مەودا، نزیک دەبێتەوە بێ برینی شوێن. هەموو نەخشی ئێمە لەوەوەیە و خۆی ڕەنگی نییە، لە ڕۆژهەڵاتە هێلانەکەی، بەڵام ڕۆژئاوا بێ ئەو نییە. هەمووان بەوەوە مەشغوڵن ئەو بە کەسەوە. گشت پڕن لەو ئەو، ئەو لە گشت خاڵی. لە ئاوازی سیمورغ، سازی سەیری وەک ئەرغەنون و شتی تریان دروست کردووە. خواردنی ئەو ئونسە، هەر کەس پەڕێک لە باڵی ڕاستی دەرکات و بیخاتە ئاگر ئەوە دەپارێزرێت، نەسیمی سەبا لە هەناسەی ئەوەوە دێت. ئیتر دەتەوێت دڵم بە بینینت خۆش نەبێت؟ بەوە منیش ئەهوەن بوومەوە و خۆم قنج کردەوە. نەمدەوێرا لە حیکایەتەکەی فەوائید بدوێم و باسی سیمورغانم لە کتێبی (کشف الاسرار عن حکم الطیور و الأزهار)ی عیزەدینی مەقدسیم بۆ کرد. دەروێشەی کوفی نەیبیستبوو، کە بیستی هێندەی تر گوشاد و دڵخۆش بوو. وتم وەک کتێبەکەی عەتتاری نیشابووری باسی مەلان دەکات، کە بۆ سوڵتانی خۆیان دەگەڕێن و ڕوو دەکەنە کێوی قاف. هەر کەس بگات بەو ئاسودەیە. پێموت: ئەو کتێبە لای مەکتبەدار هەیە و دەتوانی خۆت لەمەڕ ڕاستەقینەی ئێمەوە بخوێنیتەوە. نیعمەتولای کوفی ئاوها ماجەرای خۆی نەقڵ کرد:
بە قەستی تاعەت، لە تاقیکردنەوەیەکی قورسدا خەلیفەی ڕیش چەرموو، هەڵی بژاردووە تا بچێتە خەڵوەتەوە. ئەمیش بە نیەتی خەڵوەتکێشان دەچێتە ئەشکەوتێک چل ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبێت، ئێواران بە یەک خورما و کاسەیەک ئاو ڕۆژوو دەشکێنێ، شەوان تا بەیانی شەونوێژ دەکات، ئەوجا دوای نوێژی بەیان تا چێشتەهەنگاو مژوڵی عیبادەت دەبێت. کاتێک دەبێتە چل ڕۆژ و چل شەو، دەبینێت تروسکایی لە دڵیدا نییە و هیچ فەرقی نەکردووە، لەو چل شەوە فەیزی نەبردووە. بەو چەشنە دەخوازێت بگەڕێتەوە بۆ ناو مەملەکەت، ئەمما پێش ئەوەی وارد بێت خەلیفەی ڕیش چەرموو لەبەردەمی سەوز دەبێت، دەست دەخاتە سەرشانی و بزەیەک دەکات:
- ها دەروێش ئەمە حەمکە توانات بوو؟ تا سیموغ نەبینی نەیەیتەوە شار، وەگەرنا پلەی مەعنەویت لەدەست دەدەیت. دیتنی سیمورغ واتا تۆ پەردەی یەکەمت دڕاندووە، دوای ئەوە شەش پەردەت، تا تەجەلای ئیلاهی دەمێنێت.

بەو شێوەیە دەروێشەی کوفی کیسەیەکی گەورەی خورما لە شێخ وەدەگرێت و بەرەو خەڵوەکەی دەگەڕێتەوە، تا چل شەوی تر وەک جاری پێشوو دەگری و دوعا و نوێژ دەخوێنێت. چلەکێشانی تەواو دەکات، وەلێ دەبینێ هیچی نەگۆڕاوە و خورپە و ترپە لە دڵیدا وەجۆش نایەت. ئەم جارە بڕیار دەدات بۆ شار نەگەڕێتەوە، خۆی ڕەها کات لە کەوندا، واز لەو توندی و کرژییە بێنێ، بە دەشتودەردا بڕوات، بە دەم سۆز و سەماوە بیر لە خۆشەویستیی ئیلاهی بکاتەوە. بەو ڕەنگە شیرینی دۆزینەوە لە دڵیدا گڕ ئەگرێت و ڕۆژ بە ڕۆژ گەرمتر دەبێت، کاتێک دەزانێت لە دوورەوە شەبەنگە ڕەنگێک لەبەر تیشکی خۆردا بریقەی دێت، یەکەمجار فریو ناخوات دەڵێت: ئەمە فێڵی شەیتانە و تەفرەم دەدات، پاشان کە بە دەم حاڵەوە نزیک دەبێتەوە، دەبینێ تەیرێکی باڵ پەشێوی چارۆکەی کەشتی، بە چەشنی تاوس ڕەنگاڵە، دەست بە شێوەی چنگاڵی شێر، دەندووک درێژ، سەر ئەستوور، لەناو خۆڵدا گەوزاوە و باڵی بریندارە، پەیام دێتە دڵی کە ئەو بە خۆشەویستی خوا سیمورغی دی.
دوای گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی خۆی، هۆشم هاتەوەبەر و ڕەوانەی مەملەکەتی خۆیم کرد. ئیتر تا ماوەیەک دیارنەبوو، دواتر بۆی گێڕامەوە، کە داخڵی مەملەکەت بووە لە حەژمەت مەستی و چێژی خودایی ئاگای لە خۆی نەماوە، لەبەر دەروازە بوراوەتەوە و گۆزەکەی شکاوە. دەستبەجێ خەلیفە لەوێدا پەیدابووە، سەری ماچکردووە، ئەمیش هۆشی هاتۆتەوەبەر. دەڵێت: کەسمان لە بارەی هیچەوە نیقاشمان نەکرد، بەڵام لەپێ دەستی گرتم و هێنای بە دەموچاویدا، بزەیەکی کرد و چووە ژێرباڵم، بەناو خەڵک و عەشاماتی بازاڕ و بەسەر پردەگاورەدا پەڕاندمییەوە تا گەیشتینە تەکیە.
خاتوون؛ ئەمێستا دیاری من پەڕێکی خۆمە تا هەرکات دەستت پێدا هێنا، شتێکت بیر بکەوێتەوە. ساڵانێکە یەک جار چوومەتە ناو حیکایەتێکی تۆ. قاسیدەکەی خۆتت نارد بە شوێنم دا. فەقیرە حەوت ڕۆژ بەڕێوە بوو تا گەیشتبووە داوێنی کێوەکەم. دوو کەشتیوان بە خۆی و ئەسپیەوە لە ئاوەکەیان پەڕاندبووەوە. کاتێک گەیشت تەنها دارێکی زۆر زۆر بەرزی دی، هاواری کرد: خاوەن ماڵ، هۆ سیمورغی پەرزێڕین، خاتوون ناردوویەتی بە شوێنتدا، نازانم هەیت یان نا، بەڵام من ئەرکی خۆم بەجێ هێناوە، ئەگەر گوێت لەم قسەیە وەرە با لەگەڵ خۆم بتبەم. کاتێک گوێم لێ بوو چوومە خوارەوە، سەرمەد سام گرتی، هێشتاش نەیدەبینیم، قسەم لەگەڵ کرد نەیدەبیست، ناچار بە چنگم خۆی و ئەسپەیم هەڵگرت و لەبەردەم حیکایەتخانە دامنا و خۆم چوومە ژوور. ئیدی لەوێ و لای حیکایەتخوان دەکرا ببینرێم، لەبەر ئەوەی لەناو حیکایەتخانە بووم. قەولەکەت وەها بوو: دەبوو من و حەکیم و پاڵەوانێک پێکەوەبین. حەکیمباشی و دلاوەربەگ کە خەڵکی مهابادە و بە پاڵەوان ناسراوە، کوڕێکی ناوشان پان و بە بازووە، لەوێ بوون. حیکایەتەکە وەها بوو:
ئێستا نا، جاران، جارانی زوو زوو، لە شارێکی هەر دوور، شۆڕەسوارێکی دلاوەر دەبێت. باڵابەرزی چوارشانەی سینگ پانی ملبەرزی، بە ئەعەزەڵەی ڕەشتاڵە، بەوە ناسراوە هەقبێژ، ڕاستگۆیە، بەجەرگ و نامووس پارێزە. دەڵێن لەو شارەدا چەندان جار خەڵکی لە چنگی چەتەکان ڕزگار کردووە، هەقی پیرەژنانی سەندووە و منداڵانی لە تەهلوکە ڕزگار کردووە. ناو و ناوبانگی بەرەو شارەکانی تر دەڕوات، لە پازدە ساڵیەوە سوارچاکە و لە حەڤدە ساڵاندا شاسوارە، دەڵێن ڕۆژ دەبێتەوە تا دەگاتە ئێوارە سوارە بە شاردا دەگەڕێت و کۆمەکی خەڵک دەکات. شەوانیش پەنامەکی بە پیادە لەناو شاردا دەسوڕێتەوە. تا ڕۆژێک پیاوانی پادشا باسی ئەم پیاوە بۆ شاهـ دەگێڕنەوە: قوربان تاقی بکەوە بزانە ئازا و دلاوەر و بە نامووسە؟ ئەویش دەستێک بۆ ڕیشی دەبات و دەڵێت: بزانم چۆن دەبێت. ئەو دەم تاقە کچەی لەگەڵ دوو وەزیر بە

بەرگی شرەوە، لە کەژاوەدا دەنێرێتە دەشت، لەولاشەوە پیاو ڕائەسپێرێت بە شۆڕەسوار بڵێن: دوو بۆرە پیاو کیژێکیان بە کەژاوەکەیەوە دزیوە، دەیانەوێت بە پادشای بفرۆشن. عەلەل عەجەل شۆڕەسوارە دەگاتە دەشت، دەبینێ دوو پیاوی دەمولووت هەڵپێچراو بە جلی شرەوە کەژاوەیەکی لە ئەتڵەس چێکراویان بە سواری حوشترەوە پێیە، دەمودەست دەڵێت:

- هۆ بۆرەپیاو، دەست لەو کەژاوە هەڵگرن، بۆتان نییە بیبەن، ئەوانیش دەڵێن:
- ئێمە کرێومانە، وەعدمان بە پاشاداوە کەنیزێکی نەشمیل و نەکراوەی پێبفرۆشین. شۆڕەسوار دەڵێت:
- ئەو بە چەند لێتان دەکرێت، منیش ئەوەندە دەدەم و وازی لێ بێنن، دوو وەزیرەی دەمولووت هەڵپێچراو دەڵێن:
- بە سەد کیسەی زێر. شۆڕەسوار ئەوەندە شک نابات، شمشێر هەڵدەکێشێ و دەڵێت: سوێند بە خودا نەڕۆن، ئێستە ئەتان کەم بە دوو کەرتەوە. وەها قاچی یەکێکان بریندار دەکات لە تاوان هەردووکیان شەلە شەل هەڕا دەکەن. دلاوەر کەژاوە دەباتەماڵی خۆیان بێ ئەوەی هەڵی باتەوە و یەک وشەیشی لەتەک بڵێت، بە بۆنی میسک ئاسای مەست دەبێت، بەلام نە پەردەی تەنکی تەرزە و بارانی لا دەدا، نە چاویشی دەکات، دەیداتە دەست پیرەدایکی، دەڵێت: بزانە کچی کێیە با بیبەینەوە. کوڕ ئەو شەوە ناچێتە ماڵ نەک تووشی گوناە و ختورەی خراپ بێت، لە شاردا ئەسووڕێتەوە و دووراودووریش پیاوانی پادشا تاقیبی دەکەن. سبەی زوو پاشا دەنێرێت بە شوێن شۆڕەسواردا، دەڵێت: هۆ سوار لە شاری ئێمەدا کەس وەک تۆ چاوقایمی نەکردووە کەنیزی ئێمە ببات و شەوباخەڵی لەگەڵ بکات! شۆڕەسوار دەڵێت:
- ئەزبەنی ئەوە کەنیزی تۆ نەبووە، ماڵی خەڵکە، منیش نامووس پارێزم، تا ئێستا نازانم کەسی ناو کەژاوەکە کێیە. پاشا دەڵێت:
- چۆن بزانم ڕاست دەکەیت، لاوە دەڵێت: بڕۆن و لە کچە بپرسن.

حەکیم بە گوێی پادشادا دەسپرێنێت: قوربان با شازادە بانوو بێتە مەجلیس و بڵێت ئەوە کەنیزی منە، ئەگەر بە هاتنەژوورەوەی ئەو داچڵەکێت مانای وایە دیویەتی، ئەگەر دانەچڵکا ئەوە نەیدیوە. بە هێواشی کچەی ناو کەژاوە دێت و دەڵێت:

- هۆ سوار ئەو کچە کەنیزی منە و بۆمی بێنەوە. ئەویش نە سەر بەرز دەکاتەوە نە تەماشای دەکات، دەڵێت:
- خاتوون من وەعدم بەو کچە داوە بیدەمەوە دەست خاوەنی، ئەویش دەڵێت:
- خەمت نەبێت وەعدەکەت بەجێ گەیاند. ئاوها پاشا و حەکیم و هەمووان بۆیان دەردەکەوێت، هەم پاڵەوانە هەم بە ڕەوشت. بۆیە هەڵی دەستێنن، دەڵێن تۆ تاقیکردنەوەیەکی قورست تێپەڕاند، ئەوەش ئەمانەتییەکەیە هاتەوە شوێنی خۆی، جا تەماشای کچەی شا دەکات، نەک دڵی بە سەد دڵ حەیرانی دەبێت. کچە و کوڕە تەماشای یەک دەکەن، دڵ لە گرۆی یەک دادەنێن. بەلام کەسیان ناوێرن دەنگ بکەن. بەو شێوەیە پاشا شۆڕەسوار وەک کوڕی خۆی تەماشا دەکات، لە ڕاو و شکار لەگەڵ خۆی دەبات، بەلام کوڕە هەرگیز نۆکەری و چاکری بۆ پاشا ناکات.

ڕۆژ دێت و ڕۆژ دەڕوات. تا ئەوەی لە ولاتانی هاوسێیەوە دەنێرنە خوازبێنی کچە پاشا، ئەویش دەڵێت: شوو ناکات، کاتێک ئەم داواکاریانە زۆر دەبن و ئەو نایکات، شا دەنێرێت بە شوێن شاژندا و دەڵێت: بزانە بانوو بۆ مێرد ناکات، بێ لەو کەسی ترم نییە جێنشینم بۆ بێنێتە دنیا، ئەمە ڕەوا نییە. شاژن قسە لەگەڵ شازادە دەکات، لێی دەپرسێ بۆچی مێرد ناکات؟ ئەویش ڕازی بۆ دایکی نادرکێنێت و لە شەرماندا نەخۆش دەکەوێت. ڕادەسپێرن حەکیم کە پیاوێکی کامڵ

و دنیادیدەیە بێتە عەیادەتی، حەکیم دەگات، نەبزی دەگرێت و تەماشای چاوی دەکات، پێی دەڵێت: کێیە ئەوەی دڵتی بردووە؟ شازادە ترس دەیگرێ و دەڵێت: تۆ چۆن دەزانی حەکیمباشی؟ حەکیمە لە وەڵامدا دەڵێت، کچی خۆم من حەکیمم! شازادە دەڵێت: قوربان ئەوە سێ ساڵە لە تاقیکردنەوەکەی دلاوەری پاڵەوانەوە، ئێمە دڵخوازی یەکین، وا لە تاو فیراقی ئەو دەسووتێم. حەکیم دەڵێت: خوا بەخێری بگێرێت. جا حەکیم بە زیرەکی خۆی داوێک دەنێتەوە: دەڵێت قوربان کچی تۆ، بە یەک شت شیفای دێت، ئەویش هێنانی پەڕی سیمورغە لە قولەی قاف، دەبێت دلاوەری پاڵەوان بنێرین، تا نەیەتەوە و پەڕ نەهێنێت نابێت بدرێت بە مێرد بدرێت. بەو شێوەیە پاشا بانگی دلاوەر دەکات:

- کوڕم من لە دووری تۆ پەریشان دەبم، بەڵام تەنها بە تودا ڕادەپەرمووم، ئەگەر ئەوەم بۆ بکەیت چیت لە دارای دنیا ویست ئەتدەمێ. کوڕە دەڵێت:

- قوربان ڕۆحی من لە خزمەت تۆدایە.

حەکیمباشی لەگەڵ خۆی دلاوەر دەیباتە لای شازادە خانم و بەڵێن لە یەک وەردەگرن. پاڵەوان کەلەمێردانە پێ لە ئاوزەنگ دەکات و وەڕێ دەکەوێت. شارەوشار و گوندەوگوند، دەریا و وشکانی بە دوو ساڵ دەبڕێت، تا دەگاتە کێوی قاف. نزیک دەبێتەوە لە داری توبا و هاوار دەکات:

- هۆ سیمورغی پادشای مورغان، دڵبەرم نەخۆشە هاتووم بۆ دەرمان.

سیمورغ کە گوێی لە وشەی دلبەر دەبێت دادەبەزێت، ڕوو لە پاڵەوان دەڵێت:

- ها شۆڕەسوار، سەد ساڵە بەشەر بە ئێرەدا نەگوزەراوە، ئەتۆ چۆن گەیشتیت؟

ئەویش حیکایەتی دڵی زار و فیراقی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە. سیمورغ لە بری پەڕێک دوو پەڕی دەداتێ، یەکێک بۆ دڵبەری ئەوی دی بۆ خۆی. دلاوەر دوای دوو ساڵ دەگاتەوە مەملەکەت. کاتێک دەگاتە شار تەپڵ لێ دەدرێت و خەڵکی دێنە پێشوازی و بەرەو کۆشک بە ڕێی دەکەن، پادشا و وەزیران و گزیران بە پیرییەوە دێن، ئەویش ئادابی سوڵتانان بەجێ دێنێت و دەچنە لای شازادە. حەکیمباشی دێنن و بانگ دەدەن، شازادە ئامادە بێت دێنە سەردانی. شازادە ئەودەم لە گۆشەیەکی باغی هەزار گوڵ بە مەحزونی دانیشتووە و گوێ لە نەغمەی ئەو تار و قیسارانە دەگرێت کە سێ کچ بۆی دەژەنن. بە چوونە دیداری وەک بووک دەگەشێتەوە، ئاگری حەوت ساڵەیان لە دڵ کڵپە دەکات. پەڕە دەدات بە کچە و ئەوی تریش لە باخەڵ دەنێت. پاشان دەچنەوە خزمەت پادشا، ئەویش دەڵێت: مادەم چوار ساڵ لەبەر فەرمانی من ڕۆیشتیت، لە دارای دنیا پادشای نەبێت چیت بووێت پێت دەبەخشم، کوڕە دەچپێنێت بە گوێی حەکیمدا، دەڵێت تۆ بیڵێ. حەکیم دەڵێت:

- قوربان دەمەوێت من عەزرت بکەم، دلاوەر ڕووی نییە تەڵەبەکەی بکات لە حزووری تودا، پاشا دەڵێت:

- سوێند بە خوا دڵی ناشکێنم. دلاوەر دەڵێت:

- قوربان من یەک شتم دەوێت، ئەویش شازادە بانووە. سوڵتان نەختێک دەوەستێ دیارە داواکەی لاقورسە، بەڵام نایەوێت لە فەرمانی ژیوان بێتەوە:

- دلاوەر ئەگەر کچی من ڕازی بێت، ئەوا پێت دەبەخشم، وەزیران و گزیران دەڵێن:

- قوربان ئەلحەق کچی تۆ شایستەی پاڵەوانی وایە، شا دڵی گوشاد دەبێت و دەنێرێت بە شوێن شازادەدا:

- هۆ شازادەی تاقانەم، ئەگەر پاڵەوانێک، بە خاترت سەفەری کێوی قافی کردووە بێتە داوات، تۆ مێردی پێ دەکەیت؟
کچە وەک گوڵ دەگەشێتەوە، لێ لە شەرماندا بە چرپەوە دەڵێت: پادشای خاوەنشکۆمان دەزانێت.
ئاەها قەرار دەدەن سبەی مارەی ببڕن، حەوت شەو و حەوت ڕۆژ زەماوەند بگێڕن.
خاتوون تا ئێرەی حیکایەت سازە، بەڵام وا دیارە قەدەرەکانی ناو حیکایەتی تۆ وەک قەدەرەکەی، کە سولەیمان باسی دەکرد چارەساز و دڵخۆشکەر نییە، چونکە تۆ بەوە ناسراویت شەیدای مەرگەساتیت.
حکیایەتەکەت وەها لێکرد، سبەی کە ڕۆژی زەماوەندە، دەبێت بووک و زاوا مارە ببڕێن، سپێدانی زوو دوای مەلا بانگان، تەتەر لە مەملەکەتی هاوسێیەوە خۆی بە شارا دەکات و دەڵێت: بە لەز ناردوومیان بە شوێن دلاوەری پاڵەواندا. بەو بەیانییە پیاوانی مزگەوت دەخرۆشێن و دلاوەر سەلام دەداتەوە دەڵێت:
- ئەمر کە!
ئەویش پەیامەکەی وەها دەگەیەنێت:
- شارەکەیان لەژێر زوڵمی دێواندا خەریکە لە ناودەچێت، پادشایان بە بارمتە گیراوە و کوڕی پاشا سەخت بریندارە. زۆرێک لە کیژانی جوان بە غارەت براون، منداڵان بە کۆیلە گیراون. ناردوومیان بە شوێنتدا بێیت شارەکە ڕزگار بکەیت.
خەڵکی مزگەوت و وەزیر کە لەوێیە، سوبحانەڵا دەکەن و دۆش دادەمێنن، دەڵێن با بچین لەگەڵ پادشا قسان بکەین.
ئەنجومەن ڕێک دەخەن، مەسەلە باس دەکەن، حەکیم دەڵێت:
- قوربان پاڵەوان و شازادە حەوت ساڵە دڵداری یەکن، گوناهە بە یەک نەگەن.
وەزیر دەڵێت:
- قوربان ئەو دوو دڵە لە یەک کەین، خوا غەزەبمان لێ دەگرێت.
پادشایش دەڵێت:
-من دەڵێم سوپا بچن، بەڵام دلاوەری جوامێرم نا.
تەتەر دەڵێت:
- قوربان بەڵام ئێوە حاڵی ئێمە نازانن!
دلاوەر دەڵێت:
- شکۆدار ئەگەر پیاوی ڕۆژی تەنگانە و دەربەستی نەمانی مەملەکەتێک نەبم، بە چی دەچێت جوامێرێم؟ سوێند بە خوا دەچم حەقیان دەستێنم.
دلاوەر دەچێتە حەرمسەرا و لەگەڵ شازادە باوەش بە یەکدا دەکەن، ماڵاوایی و گەردن ئازادیی دەخوازن. لەگەڵ چل هەزار سوار دەچێتە شەڕی دێوان، ئەو لە نواوە ئەوان لە دواوە. دەگاتە شار و دەبینێت دێوانی ڕەش و زل شاریان داگیر کردووە، تا چل ڕۆژ دەستەویەخە دەبن، لە سەرای کۆشک نەبێت دێوقڕان دەکەن. دلاوەری مێردخاس ئاخری دەچێت بۆ ڕزگاری پادشا لە جەنگی ناو کۆشکدا، پاش ڕزگارکردنی و کوشتنی دێوان، سەخت بریندار دەبێت خوێنی وەک جۆگەلە لەبەر دەڕوات. شار پاک دەبێتەوە لە دێوەزمەکان. پادشا خۆی دەدات بەسەر دەستیدا. لەو ئانەدا دلاوەر پەڕەی سیمورغ دەردێنێت و دەیسووتێنێت، دەڵێت هۆ سیمورغ حەکیمم فریاخە، هێند نابات سیمورغ بە حەکیمەوە لەسەر کۆشک

دەنیشێتەوە شار موتەحەیر دەبن، شازادە بە دەم ژانەوە ڕوو لە حەکیم دەکات و دەست بەرەو سەرەوە ڕادەگرێت:
- خودایە مەیەڵە بمرم تا یەک جاری تر شازادەم دەبینمەوە.
سیمورغ باڵ بەسەر برینیدا دەهێنێت، حەکیم دەیپێچی و بە ماوەی سێ ڕۆژ چا دەبێتەوە. سەربازان ڕوو دەکەنەوە مەملەکەت و سیمورغ حەکیمە و دلاوەر دەباتەوە ناو کۆشک. دلاوەر دەڵێت: شازادەم بۆ بێنن، شازادە دێت و باوەش بە یەکا دەکەن، دلاوەر لە باوەشی بانوودا گیان ئەسپێرێت و ئەمری خوا بەجێ دێنێت. شازادە بانوو نەعرەتەیەک دەکێشێ عەرشی ئەعلا دەنگ دەداتەوە.
دەزانی خانم لەو حیکایەتەدا چەندە دڵم تەنگ بوو؟ دەزانی چەندە زوڵمت کرد؟ ئەوە بوو ئەو قەزاوقەدەرەی تۆ دەتویست بیهێنێتە دی؟ کەیفت خۆش بوو بە گریە و زاری شازادە؟ بە کاولبوونی ماڵی؟ ها خاتوون؟ کۆتایی ئەم حیکایەتە کێ هەیە پێی ڕەوا بیت؟ کێ...؟

# شەوی شازدەهەم

بە ناوی زاتی ئەو کە هاوەڵی دڵانە، هاوەڵی کەسانی بەدبەخت و داماوان و هەژاران و بریندارانە. بە ناوی ئەو دەست پێدەکەم تا خۆی ببێتە ئەنیسی دڵت، هەو نەبێ کەس ناگاتە دادت و هەموو ئەنیسەکانی تر درۆن. بەندە سڵێوە عیسای ساحێبی مەیخانەی مەملەکەتم. ئەمن هیچم نییە بۆ دیاری بشێت، گوزەیەک شەرابی حەوت ساڵەم بۆ هێناویت، لە شەوێکی کرێوەی حەوت ساڵ پێش ئێستەدا لەژێر شۆڕەبیی باخەکەمدا شاردمەوە، تا بزانین نسیبی کێیە، وا نسیبی تۆی تیا بوو. هیوادارم شتێکت بیر بخاتەوە و لەو بەڵایە ڕزگارت کات.

ئەز مەیخانەم هەیە، لە مەسیحیانم، پێش ئەوەی بێمە ئێرە ڕۆژێک بە قەستی ترێکردن بەرەو ڕەزەکانی باخی کێوەدوور هاتم، وەختانێک دەنوارم لە شارەکەی تۆم. وەختێ لێرە گیرسامەوە، وەک ئەوەی شتێک پێم بڵێ ڕێک بەرەو مەیخانەی شار ڕۆیشتم، دیتم هەموو شت ئامادە و تەیارە، خاوەنی نییە. بۆیە دەستم بەسەرا گرت و بە خاوەنم کرد. زۆرینەی شارەکەی موسوڵمانن، لە کن وان شەراب حەرامە، بەڵام سەری بێ ڕزق لەژێر خاکدایە. خودا خۆی ڕزق دەنێرێت، موسڵمانان جارجارە دێن و لە بێ ئەنیسی شەراب دەکەنە ئەنیسی خۆیان. جەوانانی عاشق و پیرانی دردەدار دێن. حەوت ساقی کچ شەراب دەگێڕن و تار و ساز و کەمانچە لێ دەدرێت، شیعری خەییام و مەولەوی کورد دەوترێتەوە. گورانیبێژانی مەیخانە هەر غەزەلێک بۆنی شەراب و مەی لێ بێت دەیڵێنەوە، تەنانەت ئەو غەزەلانەش دەڵێنەوە کە بۆ مەیی مەعنوی وتراوە و من لێی نازانم. عارفان پێیان وایە بە نووری حەق، بە عەشقی ئەو، بە تەجەلای شیرینی مەست دەبن، بەڵام مەستانی مەیخانەکەم وشەی شەراب و مەی ڕەوایەتی بە کارەکەیان دەدات بۆیە دەیڵێنەوە.

لەم مەیخانەیە، دەنگخۆشێکی مەیزەدە هەیە بە ناوی توراب. جارێک غەزەلێکی مەولەوی تاوەگۆزی وتەوە، ئەو شاعیرە، پیرەعارفە، عاشقەی لە پاڵ خۆشویستنی خودا و شێخیدا، ژنەکەشی خۆشویست، لە یەک کاتدا سێ جار عاشق بوو! جوانترین شیعرەکانی ئەو عارفە دوای مردنی ژنەکەی و بۆ ئەوی نووسی. ژنەکەی کە ناوی خاتوو عەنبەرە، دەڵێن بە بنەماڵە خەڵکی هیندستانە و جوانییەکی کوردییانە و هیندییانە خانمێکی پەری ئاسای لێ خولقاندووە. کاتێک کراسێکی ئاودامانی کوردی پۆشیوە، فەقیانەی شۆڕ کردووە، هەیاسە و پڵپڵە و پاوانەی لە پێیان کردووە، هەموو ڕۆژێک سەدجار دڵی مەولەوی عاشق بۆتەوە. یەکێک لەو شەوانەی مەولەوی بیری عەنبەر خاتوون دەکات، شیعرێک دەنووسێت و هاوار لە دوو عەشقەکی تر دەکات تا فریای بکەون. کاتێ ئەم گیرۆدەی یادی عەشقی عەنبەرە بۆیە چەند جارێک ناوی ساقی دێنێت کە گوایە ساقی پیری تەریقەتە و مەستییەکەی مەستی دەروێشانەیە. شەوێک توراب بۆ یەکەمجار ئەو غەزەلە

دەبینێ، شەیدای دەبێت، ئەزبەری دەکات و دێت بە دەم کڕوزە و نوزەی سازەکەیەوە دەڵێت:

ڕۆ جە شەو فێشتەر زار و زەلیلم
ساقی! سا جامێ، ئەمجار دەخیلم
بدەر پێم نۆشکەم چون هەردە جاران
وە ڕەغم گەردین گرۆی مەیخواران
شیعر ویم تەنخوای سەمتوور سازێ
لێدەر سا نەی چی! هەر تارەی گازێ
چنگ پێکۆ نە جەرگ نەغمەی سازەکەت
بەرارۆ تۆ تۆ میقراز گازەکـەت

شیعرەکە بە کوڵ باسی توێ توێکردنی جەرگی دەکات، داوای فریادڕەس دەکات تا بە مەی دەوای دەردی بکات. ئەو شەوە توراب گڕی گرتبوو، غەزەلی بە سازەوە دەوتەوە، مەستانیش دەوریان لێ دابوو، چوار لە ساقییەکان هۆن هۆن فرمێسک بە چاوانیاندا دەهاتە خوارەوە، تەواو ئەهلی مەیخانە مات ببوون. لە ناکاو یەکێک لە کۆنە موریدانی تەکیە، هەستا و جنێوی بە توراب دا: کافر و خوێڕی و شەرابخۆری سڵ لە دایک و خوشکی خۆنەکەرە، چۆن زات دەکات لەناو مەیخانە، شیعری عارفیکی وەک مەولەوی بڵێتەوە؟!
لە مەیخانە بووە هەرا و دەنگەدەنگ، توراب بە دەم مەستییەوە وتی:
– قەسەم بە خوا مەولەوی شەرابی نەخواردبایە، نەیدەزانی وەها پەسنی بدات، هەڵدەن پێکێ لە چاوی مەعدومی شێخی مەیخواران.
ئەوسا کۆنە دەروێش کاسەی مینای هەڵگرت، پێکێکی هەڵدا و ئەوی تر هڵپرژاند بە دەموچاوی توراب دا:
– قبوڵی ناکەم قسە بەو زاهیدە بڵێی.
توراب بە دەم مەستییەوە وتی:
– ئەگەر دەروێشیت چ دەکەی لە مەیخانە، ئەگەر مەیخۆری چت داوە لە باسی شێخ و مێخ!؟
بۆ وای نەوت و کۆنە دەروێش کاسەی مینا بە دەستەوە بوو وتی:
– من دەروێشی مەیخوارم.
و بە یاهو و یاحەیەوە کاسەی مینای داکرماند. مەیخواران ترسان و مەستیان کردیان بە یاهووو یاهووو یاهووو، تورابیش سازێکی خەمباری لێدەدا. دەروێشە حاڵ گرتی و لە ناوەڕاستی مەیخانەکەدا سەمای دەکرد، هەر حەوت ساقی زوڵف تا کەمەری سینە قوتی لێوخونچە و بۆن میسک، بە دەوریدا دەخولانەوە، یاهووو یاهوویان بوو. ژنان و پیاوانی تریش بە دەم مەستییەوە بە ئاوازی سازەکە سەریان دەلەقاند و فرمێسک بە چاوانیاندا قەتارەی بەستبوو. ئەو شەوە مەیخانە بوو بە کۆڕی موریدان، کۆنە دەروێشێک ئاگری ژێرخۆڵەمێشی گەشابووە و مەستیانیش بیری نووری خودایان

کردبوو. تا سپێدان کۆڕی زیکری مەستان هەبوو، ئەوسا دەروێشە کەوت بە عەرزا و وتی:
- پێکێکم بۆ تێکەن!
حەکایەتی ئەو دەروێشە مەستە زۆر سەیرە. دەڵێن وەختی خۆی یەکێک لە موریدە خاوەن کەشفەکانی تەکیەی گەیلانی بووە. ڕۆژێک عاشقی کچی جووی مەملەکەت دەبێت، ئەویش پێی ڕازی نابێت، دەڵێت خۆی کەسێکی تری خۆشدەوێت. موریدە دەڵێت: ئەگەر ببیتە هیی من، دیمە سەر دینت. کچە پێی ئێژێت: بڕۆ نەفام، عەشقی خودات بە عەشقی من دەگۆڕیتەوە. بەو لەونە دەروێشە ئەسووتێ و ئەسازێ، دەچێتە خزمەت شێخ:
- قوربان ئەمە حاڵمە، من ئەو کچەم خۆشگەرەک، تۆ دەبێت لە غەیبەوە دڵی ڕازی بکەیت، گەر نەیکەیت، من واز لە تەکیە دێنم. شێخیش پێی دەفەرمووێت:
- مادەم هێند چاوقایمیت، توانای باتنی منت بۆ ژیانی زاهیری خۆت دەوێت، بڕۆ تۆ لە بازنەی دەروێشی دەرچوویت. موریدە دەڵێت:
- کەوایە بۆم ناکەیت؟ ئەوە من ڕۆیشتم.
ئیتر لە تەکیە دەتۆرێت و دەست دەداتە مەیخواری.
مەیخانەکەی من، وەک حیکایەتخانەکەی تۆ پڕە لە حیکایەتی سەیر، هەموو ئەوانەی دێن، شوێنێک لە ناوەوە، لە قووڵاییان برینداره و ئازاری دێت، دەیانەوێت ئەو ئازارە کەم بکەنەوە، سوکنایيان بێت، بەڵام مەخابن خاتوون، کەس بە قەدەر من مەیناس نییە، مەی تەنها تاوێ بیرت دەباتەوە، ئەو دەردە قووڵە هەرگیز دەرد ناکرێت.
لە زۆریک لە حیکایەتەکانتدا من هەم، بەڵام حیکایەتێکت ئازاری زۆر زۆری دام، بەوەی دوو پاڵەوانەکەت هێنا و خستنە مەیخانەکەی من! هەرگیز ئەو حیکایەتەم بیر ناچێتەوە، ئەو ژنەی وێنەی زاهیدە ئەفسانەییەکەی میسر بوو، با بۆت بخوێنمەوە:
ئاهورای بەدمەست
من لە سەرەتاوە وتبووم وای لێدێت، کۆتایی ئەم حیکایەتەم دەزانی، بەڵام ئەمویست نەینووسمەوە!
من باش حیکایەت ئەناسم، هەر کە بۆنی یەکەم وشەیم کرد، ئەزانم ئاخرییەکەی چییە، حیکایەتی ئەم عارفە بەدبەختەش وەهابوو، یەکەم ڕۆژی عاشقبوونی، ترس گرتمی بە خۆمم گوت: من کارم بەم حیکایەتەوە نییە، خۆمی لێ نەبان ئەکەم، نە دەینووسم و نە بیریشی لێ دەکەمەوە، ئێ خۆ من دواشەهرەزاد نیم، با یەکێکی تر بینووسێتەوە. لە دڵەوە ئەمزانی ئەم حیکایەتە ئەمکوژێ، دەمزانی و ڕەنگی ئەم حیکایەتەم دیتبوو، وەنەوشەییەکی تێر، تێرییەکەی وردە وردە ئەچووە سەر ڕەنگی خوێنێکی تۆخی وشکەوەبوو!
جا کە حیکایەتەکان ڕەنگیان زۆر تۆخ دەبێت من ئەترسم، کە زۆریش کاڵ ئەبنەوە من نائومێد ئەبم، تۆ دەزانی حیکایەت ڕەنگ و بۆنی هەیە!
یەکەم ڕۆژی عاشقبوونی ترسام، هەر کە لە مەرقەد هاتە دەرەوە و خۆی بە کوچە تەسکەکانی لاخوارووی شاردا کرد، من زانیم کوێوە دەچێ، زانیم خەوێکی دیوە و بۆچ ڕەنگی وا سووربووە. چاوم لێبوو بەرەو دوکانەکەی نەفیسی ئەوراقاچی چوو، خۆی لە دوکانەکەیا شاردەوە و نەفەسی حەپس کرد، نەفیس پیرەمێردێکی بەحیلم بوو، لە سەفەربەلکەکەیا

تەمەنی یەک ساڵ بوو، باوکی تەتەری ناو شەڕی عوسمانلییەکان بوو، بەو پیرییەوە کاغەز و وەرەقەی دروست ئەکرد، عەرزوحاڵی ئەنووسی و خەتخۆشیشی ئەکرد، عەنبەر سوور ببووە و وتی: نەفیس بەگ لە مەرقەد بووم دوعام کرد، دەمی تەتەڵەی دەکرد و نەیدەزانی چی ئەڵێت، نەفیس دونیادیتە بوو، شەربەتێکی گوڵاوی دایە دەست و وتی هیچ مەڵێ، وەرەقەی باشم دروستکردووە وەرە دانەیەک ببە پێویستت پێی ئەبێت، عەنبەر وەرەقەیەک و پارچەیەک پێستی هەڵگرت و ملە میخەکەکەی خۆیدا بە نەفیس بەگ!

من نامەوێ ئەم حیکایەتە بنووسمەوە، بەڵام باسی خەوەکەی عەنبەر دەکەم، چۆن کوڕە مەیخۆرەکەی کوچەی خواروویی پشت ئاشەکە لە خەویدا پێی وتووە عاشقیەتی. خەڵکی کوچە کوڕەکەیان، خۆشناوێت ئەڵێن: مەکتەبلییە و چاو لە فەرەنگان دەکات، بە مەستی خەریکی سەفسەتەیە.

لە خەونیدا بە دوو چاوی نیمچەکراوەوە لە بەرپێی عەبنەرا دەکەوێ و دەڵێ عاشقە. عەنبەر کە هەڵدەستێ نوێژی سپێدان دەکات، لە تاو ترس و خۆشی و گەرمای لەشی یەک تەسبیح ئەستەغفیرەڵا دەکات، بە دایکی ئەڵێت ئەچێت دوعا دەکات، و بەرەو مەرقەدە بچووکە گومەز سەوزەکەی پشت ماڵەوە دەچێت!

کە دێتەدەر بەرلەوەی بگاتە لای نەفیس بەگ، ئاهورای مەیخۆر ئەبینێت و سوور ئەبێتەوە، ئاهوراش تەماشای ناو چاوی دەکات و ئەڵێت: خەون نەبوو، خەون نەبوو. بزەیەک دەکات و دەڕوات!

ئاوها عەنبەر دڵی سمرا بوو، عەنبەر کچە عابیدەکەی کوچە بوو، شتێ لە سیفاتی عارفان و نەختێکیش لە هیی مولحیدانی تێدابوو، سەری نابووە ناو کتێبان بۆ خۆی و خودا و مەعشوقەکەی ئەگەڕا، تا لە مەیخانە دۆزییەوە!

یەکەم نامەی بۆ ئاهورا نووسی و پێی وت:

عەشق عەزابێکی تاریکە، وجود ڕووناک دەکاتەوە. عەشق قەرەباڵغییەکی شێتە و ئینسان تەنها دەکات، نووسی بووی من نوێژ ئەکەم تا ئەبەدی بێت!

من هەقی ئەم حیکایەتەم نییە و نامەوێ بگەمە کۆتایی. بەس باسی ئەوەشتان بۆ ئەکەم کە عەنبەر دەیەوێت نیوە ئیمانەکەی و نیوە مولحیدییەکەی هاوسەنگ بکات. ئاخر جارێک ئاهورا لە قاوەخانەیەکی دووری کوچەی فەرەنگییەکان بە دەم قاوەخواردنەوەوە دەستی هێنابوو بە دەستیدا، کە هاتبووەوە دەستی کردبوو بە عەزابدانی خۆی، پەنجەگەورەی قاچی بە شووشەیەک بڕی بوو، پڕی کردبوو لە خوێ تا بزانی ئازاری واش هەیە!

عەنبەر دڵی ئاهورای پێ نەدەشکا، بەڵام دەیزانی خۆی دڵی شکاوە، هەر ئەو جارەی کە کتێبەکەی غەزەلەکانی سولەیمانی بۆ هێنابوو وتبوی خۆزگە لە شیری مەمی دایکمت خواردایە، ئیتر ئاهورا وتبووی من لە ئاوی دەمی تۆ ئەخۆم، دەستی خستبووە سەر کەمەری و نەرم نەم دەستی هێنابوو بە مەمۆلەکانیدا و ویستبووی ماچی کات، عەنبەر هەڕای کردبوو، کە هاتبووە ماڵ وەک ڕسوایەک خۆی بینبوو، هەر ئەو شەوە چووبووە بەر بەفرەکەی سەر پشتەبانەکەوە بە ڕووتی دانیشتبوو، بە خۆی وتبوو دەبێت وەک سەگ بتۆپم! بۆ بەیانییەکەی دڵی بۆ ئاهورا گری دابوو، نامەیەکی بۆ ناردبوو، سبەی ئێوارە لە مەیخانە بچووکەکەی ماڵی سلێوە عیسا ئەتبینم!

من کارم نییە، بەڵام با یەخەم نەگرنەوە دوای ئەوەش دەڵێم، کە عەنبەر دەزانێ چار نییە، دەزانێ هەموو شتێ لێ ئەسەنرێتەوە، سەری مستیلە شاهانەکەی پڕ لە ژەهر دەکات و کراسەکە یەخە کراوە وەنەوشەییەکەی دەپۆشێت و

دەڕواتە ژوان. ئاهورا پێکی شەرابی سوور هەڵدەدا و تا چاو ئەترووکێنێ عەنبەر دەمی ئەنێ بە سەری ئەنگوستیلە شاهانەکەیەوە و لێوی دەکات بە خوچە تا ئاهورا ئەوەنەی تر گڕدا و عاشق تری بکات، ئەوسا هەردووکیان درێژترین ماچی کەون ئەکەن و پێکەوە ئەکەون! وا تەماشام مەکەن من ئەم حیکایەتە ناگێڕمەوە.

خاتوونی ئەزیز شوێن نەمابوو ناو مەیخانەکەی من نەبێت؟ بۆ لەوێ کوشتنت؟ خاتوون ئەرێ پرسیارێکی بچووک، تۆ بێ لە کوشتنی پاڵەوان هیچی تریشت هەیە؟



# شەوی حەڤدەهەم

بە ناوی خودای بەرزەجێ و بەرزکەرەوەی باشان و چاکان، بە ناوی ئەو ئەچمە ناو حیکایەتی سەیروسەمەرەوە، داوا لەو دەکەم لەم نشێوییە دەرت بێنێ بەرزت کاتەوە. من قاڵیچەم و لە هەندێ شوێن بە سوجادە ناسراوم، لە زۆر حیکایەتی دێرینی شەرق زەمیندا هەم. نەسلی ئێمە هێند کەم بوونەتەوە، هەنووکە شانازی دەکەم تەنێ من لە گێتیدا ماوم. حیکایەتی ئێمە کۆنە، بەڵام ئەوەی من بیستبێتم یەکەم نەسلمان بۆ سەردەمی حەزرەتی سولەیمان دەگەڕێتەوە. بە قاڵیی فڕیو یان قاڵیی سولەیمان ناسراوین. حیکایەتەکەی ئێمە لە تۆمارەکانی ئیسحاقی ئیبن شەریردا هاتووە، دەتوانی لە کتێبدار بپرسی، چونکە لای ئەو دەست دەکەوێت، ئەوەی بیری کردبێتەوە کتێبێک بنووسێ و نەشینووسی بێت، لای دوڕ محەممەدی کتێبداری مەملەکەت دەست دەکەوێت.

حیکایەتی ئێمە وەهایە: گوایە ئەو دەمەی شاژنی سەبا بە ناوی بەلقیس دەچێتە سەر تەختی پادشایی، جادووگەران و کیمیاگەرانی بەردەستی دیارییەکی پێشکەش دەکەن، ئەویش قاڵیچەیەکی ڕەنگ قاوەیی بچووکە، کە دوو مەتر لە زەوی بەرز دەبێتەوە. دەڵێن ساڵانی دواتر شاژن داوا لە کیمیاگەران دەکات، تا قاڵیچەیەکی ڕەنگینی بۆ بچنن. قاڵیچەکە لە تاڵی زیوین و زێرین و نقێم و پیرۆزە دروست دەکرێت... کیماگەران بە یارمەتیی وەستایان قاڵیچەیەکی سەوزی ئاوریشمینی تانوپۆ زێڕ و زیو بە بەردی گرانبەها و نقێمی سەیر دروست دەکەن، کە نیشانەی عەشق بوو. قاڵییەکە هێند گەورە بوو جێی سولەیمان و دەست و پیوەند و گزیران و وەزیرانی دەبووەوە. کاتێک دیارییەکە بۆ سولەیمان پێغەمبەر برا، بە دروستکردنی مەعبەدێکی بەیتولموقدەسەوە سەقاڵ بوو، بۆیە دیارییەکەی دا بە خەڵکی دەربار و نەیپەرژا تەماشایشی بکات. کاتێک بەلقیس ئەمەی بیست دڵی شکا و ڕەنجا، وەستایان و شارەزایانی دەرکرد. هەر چەندە هاتووە کە دوایی سولەیمان بەلقیسی ئاشت کردەوە، بەڵام قاڵیچەی فڕیو فەرامۆشکرا و وەستایان سەرگەردان بوو، تا ڕۆیشتن لە بەینە نەهرەین گیرسانەوە و دەستیان کردەوە بە کار و پیشەی خۆیان. بەو شێوەیە کیمیاگەران قاڵیان دروست دەکرد و زۆر کەس قاڵیچەی فڕیوی هەبوو، بەتایبەت خەڵکانی بەغدا شەیدای ئەم سەنعەتە بوون، تا ساڵانێک ئەم دیاردەیە هەبوو، بەڵام لە سەردەمی هاتنی ئیسلامدا، زانایان و دانایان، بوونی ئەم قاڵیچەیان بە تێکدانی کاری خودایی زانی و کیمیاگەرانیان بەوە تاوانبار کرد، دەست دەخەنە کارە سروشتییەکانەوە. خەڵکیان هاندا ئەم قاڵیچەیە بەکار نەهێنن. بەو شێوەیە قاڵیچە بەرەو کۆتایی چوو، دروستکەرانیان سەرکوت دەکران و تەنها چەند ژمارەیەکی کەم هەبوون، ئەویش بە چاوێکی باش تەماشا نەدەکران. لە سەردەمی عەباسییەکاندا قاڵیچە هێند کەم بوویەوە تەنها چەند دانەیەک مابوو، تا



هاتنی مەغۆلەکان بۆ هەرات و بەڵخ و بوخارا و هەڵسانی لافاوی خوێن، کە دەستیان بە تاڵان و بڕۆ کرد، لەو نێوەندەشدا چەند قاڵیچییەکیان پەیدا کرد، چوون بە سەرۆکیان وت: ئەم قاڵیچانە لە ئەسپەکانی ئێوە توندڕەوترن، سەرۆک تووڕە بوو، سەری ئەو پیاوەی بڕی و فەرمانی دا قاڵیچەکان بسووتێنرین.
بەو چەشنەیە حیکایەتمان، کوشتار و قەتڵوعاممان نەسلمانی لەناوبردووە. بەڵام ڕاستی حیکایەتەکەمان دەماودەم گێڕدراوەتەوە وەهایە:
سولەیمان داوای لە خودا کرد شتێکی پێ ببەخشێت، بە هۆیەوە بتوانێ بە ئاسماندا بڕوات لە باڵندە و پەڕەداری ژێر دەستی خێراتر بێت، خوداش قاڵیچەی پێبەخشی، ئەو قاڵیچەیە هوراو بوو، ئەگەر لە لایەکەوە لێی دڕابایە، لایەکی جیا دەبووە و نوێ دەبووەوە، بەڵام بچووکتر بوو، تا حەوت پشتمان دەڵێن کیلۆمەترێک درێژ بووە، بەڵام دوا نەسل کە بەندەم، هێند بچووکم، تەنها جێی دوو کەسم لەسەر دەبێتەوە.

ئەز پێش ئەوەی بێمە ئێرە لە خەزێنی شێخێکی زەنگینی کورددا بووم، کە تاسەی کۆکردنەوە شتە سەمەرەکانی دنیای هەبوو، ئەو منی لە جوولەکەیەکی بەغدایی کڕی، ئەویش بە دوعا و توک و جادوو لە بەیتولموقدەسی دزیبووم.

حیکایەتی من وەها بوو، لە خەزێنەی تایبەتیی شێخدا بووم، شێخ میوانێکی زۆری زەنگینی لە وڵاتی فەرەنگەوە هاتبوو، بڕوایان نەدەکرد لە وڵاتی کوردان، شتی سەمەرە هەبێت، شێخیش خەزنەداری نارد تا بچێت، شمشێرەکەی ئیمانی عەلیان نیشان بدات، مووی ڕیشی پێغەمبەر، عەساکەی حەزەتی موسا. کاتێ خەزنەدار لەگەڵ دوو پیاو دەرگای بۆ بردنی ئەو عەنتیکانە کردەوە، منیش بە فڕکان و بە تەکانێک لە درزی دەرگاوە خۆم بە ساڵۆندا کرد، لەویوە بۆ باخ، دواتریش بۆ ئاسمان. فڕین چەندە شیرین بوو، بەو شەوە تا هێزم تیا بوو، بەرەو کێوان و شاخان ڕۆیشتم، کاتێکم زانی لەناو ئاوایییەکدام هەر لە شاری نێو حیکایەتەکانی باپیرانم دەچێ کە هەزار و یەک شەوە ئەیگێڕێتەوە، بۆیە ئیدی لێرە گیرسامەوە.

ماڵی من ئاسمانە، لێرە نەحەپسم، نە لە زیندانیش پەستێوراوم، بەڵام بۆ ماندوویی خۆم دەچمە خەزێنە زۆر گەورەکەی مەملەکەت، کە هەموو شتی تێدایە بە کەڵکی حیکایەت بێت و دەرگایەگی دەچێتەوە سەر حیکایەتخانە. سەنگی سەخر، نگینی سولەیمان، کڵاوی سەخری جن، قۆری جادوویی، گسکی جادوویی، حەمایل، گوللەبەند، کاسەی ژەهر، کوپەی شەراب، عەسای مارشێوە، کولەکەی ڕۆح، کەشکۆڵ و تەوری دەروێش، ئاوێنە و شەمعدانی، مووی دێو، سمی ئەسپ، پۆپنەی کەڵەشێر، کوزی کەمتیار. هەموو شتی قاڵب دراو لە زێڕ و زیو، سندووقی ئەڵقەداری لە زیو دروستکراوی پڕ لە مەرجان، سندووقی لە عاج دروستکراوی پڕ لە بەردی سولەیمان، تۆپە ئاوریشم و خەرواره خواردن و بارە حەڵوا و شیرینی و هەزار شت، لێرەیە. گەورەیی ئێرە لە عەقل بەدەر و تەنها دەبێت بە خەیاڵ بزانرێت، چونکە چیت بوێ لێرەیە.

هەر کەس چی بوێ بەشی دەدەن، بەڵام دەبێ چاوچنۆکی نەکات، چون هەمووان لێرە چیان ویستبێت پێیان دراوە.

جارێک خۆم چاوم لێ بوو، پیاوێکی چاوچنۆک هەیە، جاروبار لە بازاڕی دەلالان دەیبینم، پاسەوانی لێ نەبوو فرسەتی هێنا و هاتە ژوور، بە پڕتاو بەرەو ژێرزەمین خزا، لەوێ یەک سندووقی ئەڵقەڕیزی لە مس دروستکراوی لێیە دەستەکانی زیون، گوڵ و نیگاری ڕووی سندووقەکە زێڕین و وێنەی شازادەیەکی تێدایە کە هەردوو چاوی ئەڵماسە و کەس ناوێرێت تەماشای بکات، ئەو سندووقە جوانترین دوڕ و گەوهەر و عەقیق و ئەڵماسی تێدایە، دوو ماری ڕەشی قەف ئەستوور پاسەوانی دەکەن. کابرا دەموچاوی خۆی هەڵبەستوو، دەستبەجێ ئاگری هەڵگرت و بەرەو لای سندووقەکە چوو، چونکە تەواو ڕووناک نەبووەوە چاوی دوو ماری نەدی، پەلاماری سەری سندووقەی دا و کردییەوە، دەستی بۆ ملوانکەیەکی مەرجان برد، دەرفەتی نەبوو ملوانکەکە بگرێ بە دەستەوە، قرخەیەکی کرد و ناڵاندی. بە لەز من چوومە خوار، دیتم مارەکان پێوەیان داوە، لێیان تووڕە بووم وتم: قەتڵێکتان کردە ملمان. وتیان ئێمە پیاوخراپ نین، بەڵام دزی قبوڵ ناکەین.

پیاوە ڕەق ببوو، بە پەلە چووم حەکیمم هێنا: قوربان فریای کەوە. حەکیم، شوێن ژەهرەکەی هەڵکۆڵی و تیماری کرد. پیاوە هۆشی هاتەوە، کاتێ ئێمەی دی، کە ڕووبەندمان لە ڕوو لاداوە ناسیمانەوە خەریک بوو لە خەجاڵەتدا بمرێ. حەکیم دەستی گرت و بە درووشکەیەک ناردییەوە ماڵەوە. دوایی بیستمان ئەو پیاوە بە دزی ژنەکەیەوە، ژنی دووەمی هێناوە، دەیەوێت ملوانکەیەکی بۆ بدزێ، ئەو فەقیرە ئاوای لێهات. ئەو خەزێنەیە حیکایەتی وەهای زۆرە. بیرم نەچێت، من دیارییەک شک نابەم شایسەی تۆ بێت و خۆت نەتبێت، بۆیە سێ گوڵێنکەی خۆمت پێشکەش دەکەم.

حەزەکەم ئەمشەو شتێکت لەمەڕ بەرماڵی فڕیوەوە بۆ بگێڕمەوە، ئەویش لە زۆر حەقایەتدا هەیە، وەلێ ئەوان وەک ئیمەنین، تایبەتن بە ئەولیاکان، ئەو بۆ خواسوڵحاوانەی هێند لە خودا نزیک بوونەتەوە، شتی دنیایی لایان بێ قیمەتە. زۆر جار دەڵێن فلانە شێخ بەرماڵی بەسەر ئاوا ئەفڕێ. ئەفسانە نییە، من لە باوکی خۆمم بیستووە، کاتی خۆی بەرماڵێکی ناسیوە لەو کێوانی شارباژێڕەوە و بەرەو بەیتولحرام فڕیوە، ئێستا لە حەرەمە. باوکم دەڵێت ئەو بەرماڵە قەت درۆی نەکردووە، جارێک بە باوکم گوت: باوکە ئەو حیکایەتە چۆن بوو، ئەویش وەها بۆی گێرامەوە، کە ئەویش بەرماڵەکە بۆی گێڕابووەوە:

وەختی خۆی شێخێک لە کوردستان بە ناوی شێخ تەهای بابا ڕەسول یەکە خواپەرست و زاهید و خواناس دەبێت، ڕۆژ و شەو لە سەربانی ئاوایی دوعا و ویرد دەخوێنێ، ژنان و کیژانی دێ، قسەی لۆمەی دەکەن، ئەیژن ئەم پیاوە لە سەربان خەریکی چییە؟ ئێمە حەز ناکەین سەیرمان کات، دەروێشێکیش کە زۆر موخلیسی جەنابیەتی، دەڵێت قوربان بۆ ویردی خۆت لە کونجی چوور ناخوێنیت، ئەو مەردومە ببینیت خەیاڵت دەڕوات و ویردت ناگات، شێخیش ئەفەرمووێ:

– سوێند بە خودا لە غەیبەوە پەردەیەک لە بەینی من و مەردومەکەدا ئەکێشرێت، یەک کەس نابینم!

ڕۆژ دێت و ڕۆژ دەڕوات، دەروێشە دەچێت بۆ حەج، لەوێ تەواف دەکات، دەبینێ لە گۆشەیەکەوە ئیمامێک نوێژ دەخوێنێ هەزار کەسی لە دەورە، ئەپرسی ئەوە کێیە؟ ئەوانیش دەڵێن ناوی شێخ تەهای باباڕەسولە، خەڵکی کوردستانە، ڕۆژی سێ کەڕەت، نیوەڕوان و عەسران و شێوان بەرنوێژیمان دەکات. دەروێشە حاڵ دەیگرێ و دەڵێت: ئەوە شێخی ئێمە چۆن دەگاتە ئێرە. ئەوانیش دەڵێن سوار بەرماڵەکەی دەبێ و بۆ ئێرەی دەهێنێت. دەروێشە ئەوەستێ تا نوێژ تەواو دەبێت و نوێژخوێنان بڵاوە دەکەن، خۆی دەدات بەسەر پێڵاوەکانی شێخدا، دەڵێت قوربان: ئەمە چییە؟ ئەویش دەڵێت: ها دێوانە ڕووتە چۆن بەمەتزانی. ئەم ڕازە لە کن عەبدان مەدرکێنە، وەگەرنا دەمریت. ئەوجا لەگەڵ شێخ لەسەر بەرماڵەکە دادەنیشن و شێخ دەفەرمووێ چاو بنوقێنە. کاتێک دەزانێت گەیشتۆتە شار، لە ترسا بێدەنگ دەبێ و هیچ ناڵێت. باسی بەرماڵی فڕیو و شێخی پێشەوا لە کەعبە دڵی توند دەکات، لەو لاشەوە قسەی خەڵکی ئاوایی کە دەڵێن ئەم شێخ لە بان موراقەبەمان دەکات. تا وای لێ دێ دەروێشە دڵی بەرگە ناگرێت، خێزانی و کوڕەکانی بانگ دەکات:

قسەیەکم پێیە، ئاوم بۆ گەرم کەن و کفنم بۆ بدوورن، کە کردم گیان ئەسپێرم. ئەوانیش دەڵێن:

شتی وا نەبووە و نابێت، ئێمە ئەو قسەیەمان نەگەرەک. ئەویش دەڵێت: لە فەرمانم دەرمەچن. وەڵا جوان کفن و تابووت دێنن و ئاو گەرم دەکەن و خەڵکی ئاوایی کۆ دەکەنەوە، دەڵێت:

لە بارەی شێخەوە ڕازێکتان بۆ دەدرکێنم، ئەو شێخەی ئێوە لۆمەی دەکەن، گەورە و گرانە، سوێند بە قوفڵی کابە، کە دەستم پێوە گرتووە، ڕۆژی سێ جاران بەرماڵی دەفڕێ و لە ماڵە ڕەشەکە بەرنوێژی دەکات. ئێوە تەماشا کەن بزانن بۆ کاتی نوێژەکان لێرە نییە. خەڵکەکە بە قوڵپ دەگرین و دەروێشە گیان ئەسپێرێ.

بەرماڵەکە بۆ باوکمی گێڕاوەتەوە، کە ڕۆژی سێ جار ڕۆحی چۆتە بەر و توانای فڕینی بووە، وتووشیەتی فەقەت پیاوانی ئیماندار ئەتوانن ئەوەمان پێ بکەن، وەگەرنا من بە تەنها هیچم پێ ناکرێت، گلۆڵەبەندێک زیاتر هیچی تر نیم.

# شەوی هەژدەهەم

بە ناوی خودای بەرزکەرەوەی هەموو ئینسانی، بەبێ جیاوازی، بە ناوی ئەو خوایەی ئینسان لە ڕەزاڵەتەوە بۆ فەزیلەت دەبات. خوا لە قورعاندا باسی دەکات خۆی پلەی زۆر بڵندە و ڕەفیعودرجلدەرەجاتە: ئەو پەروەردگارە پلەوپایەی زۆر بڵندە، خاوەنی تەختی فەرمانڕەوایی تایبەتی خۆیەتی، ئەو زاتە وەحی و نیگا بە فەرمانی خۆی دەنێرێت بۆ هەرکام لە بەندەکانی کە بیەوێت، بۆ ئەوەی خەڵکی بترسێنێت لە ڕۆژی میعاد.

بەندە شوانی مەملەکەتم و براخاسی شوانم پێ دەڵێن. لەو حەلەوەی ئەفامم شوانی دەکەم، وەلێ بیرم نییە لە کەیەوە لێرەم. ئیشەکەی خۆمم خۆشدەوێت و ناڕازی نیم. نابێت تەماشای زاهیرم بکەیت خاتوون، وەک چۆن زۆر کەس تەماشای ڕووم دەکەن و بە شوانە شرە ناوم دێنن. ئەو خوای گەورەیە بەشێکی شوانەکانی بە پێغەمبەر هەڵبژاردووە، دەزانی بۆچی؟ چونکە نزیکن لە خوا، لەگەڵ ئەو بێزمانە داماوانەی نە دەزانن درۆ چییە، نە فیتنەیی و نە زوڵمیش دەکەن ڕۆژان دەبەنە سەر. شەو و ڕۆژ لەگەڵ ئەوانەدا، گوێ لە ئاسمان دەگرن، سەیری عەرد دەکەن و بلوێر دەژەنن. خوا ئا ئەوانە هەڵدەبژێرێت، لە شوانییەوە دەیانکاتە سەروەری عالەم، خۆی پلە دەرە و خۆی پلە سەنەوە. هەمووشت بە دەست خۆیەتی.

من شوانکارەم فەرووەیەکم بۆ هێناویت، خەڵکی لای ئێمە دەڵێن دیاری شوان یان شنگە یان هەڵەکۆک، بەڵام دیاری من فەرووەیەکی گەرمە و ئاواتەخوازم شتێکت بیر بخاتەوە.

خاتوون ماڵی مە لە بناری کێوەکەدایە و فەسڵی جارێک دێمە ناو ئاوەدانی، ئیشم بە خەڵک نییە، ئەگەریش یەکێک بیەوێت سەرەکانی بباتەوە دەبێت خۆی بێت. سادە ئەژم و شەرم لە عەوامیم ناکەم. ڕوو لە خوام و شوکور بۆ خوا سەرم بچێ نوێژم ناچێ، زەمانە بە دڵی منە. کەچی خەڵکی وا هەیە لەم مەملەکەتی تۆ لە شا زیاترە و هێشتاش ناڕازییە. لەبەر ئەوەی عەوامم وادەزانن دڵ خۆشیم هیی نەفامیمە. منیش بەشی خۆم شت دەزانم، بەڵان بە زمانی خۆم قسە دەکەم، چاو لە خەڵکان ناکەم. دەگێڕنەوە ڕۆژێک پیرەژنێک نوێژ دەکات، لە دواوە بابەکی لێ دەبێتەوە، کوڕوکاڵ دەڵێن داپیرە... نوێژەکەت ببرە دروست نییە، ئەویش نایبڕێت و بەردەوام دەبێت، سەلام دەداتەوە، دەڵێت: ڕۆڵە تۆ لەگەڵ خوای خۆتدا ڕاست بە، جا با ئەو سەگە هەر لە دواوە بوەڕێ. ئێمەیش لەگەڵ خوای خۆمان ڕاستین و هەقی کەسمان نییە. ئەوەتەی هەبووە هەر وابووین، لە نەسلی شوانان کەسانی مێرخاسی تێدابووە، وەک من بیستوومە بێ لە پێغەمبەری خۆمان، عیسا و موسا و نوحیش هەر شوان بوون، تەنانە دەڵێن یەکێک لە حەوت کەسە خەوتووەکەی ناو ئەشکەوتەکە، شوان بووە بە

خۆی و سەگەکەیەوە ئەویش دەچێتە بەهەشت. دادە من نالێم ئێمە موهیم و باشین، بەڵام خوا خۆی ئێمەی خۆشدەوێت و ئاگایی لە دڵەی پاکمانە، بۆیە هەمیشە بەرزمان دەکاتەوە، ئێ خۆ خزمەتکردنی بەستەزمانان کەم نییە، بە کەمی مەگرە. خوشکە نازانم مەتەڵۆکی ئەو شوانەت بیستووە یان نا، ئەوەی زورناژەنەکە؟ دەی با لەبۆت بگێرمەوە. لەناو شواناندا باوە دەڵێن: فلانەشوان زورنای شەیتانی پێیە. ئەمە لەو حیکایەتەوە دێت کە ئێستە بۆت نەقڵ دەکەم:
وەختی خۆی شوانێکی من ئاسا، بە دەور پەز و مەڕ و ماڵاتدا دێ و دەچێ و فرە ماندوو و نەحاسەوە دەبێت. ڕۆژ تا ئێوارێ دەیانهێنێ و دەیان بات، سەرەکانی زۆرن قوەی بەسەریاندا ناشکێ و دەترسێ گورگ حەپەلوشیان بکات. ڕۆژێک شەیتان پیاسە دەکات و بێتاقەتە، لە دوور شوانە دەبینێت و بەزەیی بەحاڵیدا دێتەوە، لە شوانە دێتە پێش، دەستێک دەخاتە سەرشانی و دەڵێت: هۆ لاو سەلاموعەلەیک، لاوێ جەوان عەلەیکی دەداتەوە و چاویشی هەر لەسەر پەز و سابرین و کاوڕەکانە. شەیتان دەڵێت: لاو ئەتۆ تەنها و ئەمن تەنها، بۆ نابیتە هاوەڵ و ڕەفیقی ڕێم؟ شوان دەڵێت: کابرا هاوەڵی چی، من بە دەست ئەم ماڵاتەوە حاڵم ناحاڵە، تا بڵاوە نەکەن و ڕووسیای لای میللەت نەبن. شەیتانە دەڵێت: تۆ ببە بە ڕەفیقم با لە تەنهایی دەرێم، ئەمن چاری دەردت دەکەم، جوزەلەیەکت دەدەمێ بە یەک چرکە حەمکەیان کۆوەکات. وەڵا شوانە دەبێتە هاوەڵی شەیتان و بەیانی تا ئێوارێ دادەنیشن و باسی زمانە دەکەن، ئێوارەی لێ دێ شوانە جوزەلە لێدەدات، هەموو مەڕوماڵات کۆ دەبنەوە بەرەو ئاوایی پێشی دەکەون. ئاوها ڕۆژ دێت و ڕۆژ دەڕوات، لەناو ماڵاتدا مانگای پیرەژنێکی تێدایە، لە دارای دنیا تەنها ئەوەی هەس. پیرەژەن خستویەتیە بەر شوانە. ڕۆژێک شوانە جوزەلە زۆر لێدەدات و ماڵات دەکەونە سەما و بە دەم سەماوە بۆ ناو ئاوایی ڕێ دەکەون، هێند سەما دەکەن، تا مانگای ورچ شێوە قاچێکی دەشکێت، شوانە مانگا بە هەنگەشەلە بەرەو گەوڕی پیرەژن دەباتەوە، پیرەژن کە مانگای شەل و شکست دەبینێ، دەیکاتە هەرا و نەعرەتە دەکێشێت، بە شوانە دەڵێت: لێت قبوڵ ناکەم و قازیت لێ دەگرم، شوانە دەڵێت: باوکت چا دایکت چا، پیرەژنە ئێژێت چشتی وانەبووە و نابێت. وەڵا پیرەژنە دەچێتە لای قازی، شەکوەی خۆی دەگەیەنێت، قازی لە مەسەلە دەگەیەنن، ئەویش دەڵێت: شوانکارە بۆچ وات لە تاقانە مانگا بەڵەکی داپیر کردووە؟ شوانە دەڵێت: قوربان وەڵا ئەمن تەنها جوزەلەم بۆ لێداون تا دڵیان خۆشبێت، ئیتر من چ بڵێم. قازی دەڵێت چ جوزەلەیەک؟ شوانە جوزەلەی شەیتان دەردەهێنێت و جوزەلە دەنێت بە دەمیەوە، بۆ دەنگ دەرنایەت، لە تاو بەزم و ڕەزم، قازی و پیرەژنە و خەڵکی هەمووان دەکەونە هەڵپەڕکێ و هەڵبەز و دابەز، بە دەم هەڵپەڕکێوە داپیرە دەڵێت: دەشم کەوێ ناشم تەوێ، بە شێخەکەی قازی بەنێ، بشم کەوێ ناشم تەوێ... ئیتر ئاوها قازی لێی خۆش دەبێت و ڕۆژگار بەسەر دەبات. ئەوەش شوانی ژیر و شەیتان دۆست! بگوزەرێین لەوە، دادە خودا خۆی ئاگای لە دڵی ئێمە و دڵی تۆیشە. من لە زۆر حیکایەتی تۆدا هەم، بەڵام ئەو مەتەڵۆکە قەت فەرامۆش ناکەم، کە من بە ئاواتی دڵم نەگەیشتم. دادە حیکایەتەکەت بێ ئینسافانە بوو، بەس نەبوو تۆ خودا نەبووی؟ نیوەڕۆیەک کوڕەی پەیکت ناردە شوێنما، وتت عەلەل عەجەل بگەم. منیشی وتم: ئاخر دادە چونکە شوانی نەکردووە، وا دەزانێ بە دڵی ئەو دەبێت هەڕاکەم و ئەو بێ زمانانە بدەمە دەست گورگ، بە تەتەرم وت برۆ با حەیوان ببەمەوە تەوێڵە، تا شەو خۆم دەگەیەنم. وابزانم لە داخی ئەو سەرپێچییە تۆڵەت کردەوە. مەتەڵۆکەکە وەهایە کە:
هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو، ساڵانێکی زوو، شوانێک دەبێت، ماڵاتی حەوت ئاوایی لە کنە، شوانە بە پارێزەر و لەخۆبردوو دەناسرێت، هەمووان سیقەی پێ دەکەن و حەیوانی خۆیانی لا دائەنێن، ئەویش دەیان لەوەڕێنێ، چەند

ساڵێک وەها دەبێت، تا ڕۆژێک بە قەستی دۆزینەوی لەوەڕگەی باش بۆ سەرەکانی، لە ئاوەدانی زۆر دوور دەکەوێتەوە و بەرەو دەشت دەچێت. کاتێ دەگاتە شوێنی مەبەست، بەو مێرخوزار و ئاوەدانییە حەیوانان دەکەونە هەلەکەسەما و دەخۆن، ئەوەندە دەخۆن تا مڕ دەبن، ئەوسا دنیا بەرەو تاریکی دەچێت. شوانە دەیەوێ حەیوانان کۆوەکات، وەک ئەوەی خەوتبن تاقیان لە جێی خۆیان ناجووڵێن، هەناسە دەدەن و چاویان نوقاوە و نابزوێن، هێند نابات گەردەلوولێ هەڵدەکات، دووکەڵێکی ڕەش بەرز دەبێتەوە، لەناو دووکەڵەکەدا شتێکی ناشرینی دەمداچراوی گوێ زلی ناساز دێتەدەر و گۆپاڵێ ڕادەوەشتێنی، بە جارێ هەزاران گورگ لەناو تاریکییەوە دێنە دەر، یەکی سەر و مەڕ ئەگرن و ملی ئەشکێنن، شوانە بە پرتاو خۆی ئەخاتە پشت دارێکەوە و دەڵێت: خودایە فریام کەوە، لە غەیبەوە عەبایەکی ڕەشی بەسەرا دەدەرێت و نابینرێت. ئەو شەوە تا مەلابانگان لە ترساندا ناوی خودا دەبات و هەڵدەلەرزێت، تاریک و ڕوون عەبا دەدا بە شانیدا، دەڕوانێت دەشت پڕ پڕە لە خوێن، بێ لە سەحرایەکی وشک هیچی تر نییە! ئەوسا سوجدەیەکی شوکور بۆ خوا دەبات، دەزانێ کەس بڕوای پێ ناکات، بۆیە ناتوانێت ڕوو بکاتەوە مەملەکەت. دەڵێت خوا یاربێت، ڕۆژێک هەموو ئەو حەیوانانەیان بۆ دەکڕمەوە، جارێ لێرە دەڕۆم، بزانم لە شار کاسپییەک نادۆزمەوە، خودا خۆی ڕۆزی دەرە.
ڕوو لە شار دەکات، لەوێ دەبینێ، پاشای وڵات مردووە، باز بەسەر هەر کەس بنیشێتەوە، دەبێتە پادشا. شوانە دەچێ دەوەستێ دەڵێت: خوایە ئەو بازە بەسەر من بنیشێتەوە تا ببمە پاشا و حەیوانانی ئاوایی بەمەوە، خودایە ئەگەر ئەو کارەم نەکرد لە دنیا و قیامەت مەمبەخشە. وەڵا بازە هەڵدەدەن سێ جاران، بەسەر سەری ئەمەوە دەنیشێتەوە. وەزیران دەیبەن بیکەن بە پاشا و غوڵامان دەیبەنە گەرماوی گەورەی شار، لەوێ پاکی بکەنەوە و جلی شاهانی لەبەر بکەن، لە گەرماو لەبەر سابوونێک هەڵدەکەوێ و سەری دەیدات بە بەردی لە مەڕمەڕ چێکراوی حەوزی ئاوەکەدا، لە هۆش خۆی دەچێت. عەتتار دێنن و بە بۆن و بەرامەی گوڵان هۆشی دێننەوە، پاشان شوانە هەست دەکات سەری قورسە. دەیشۆن و بە سوڵتانی دەیگۆڕن، دەیخەنە سەر تەخت، بەڵام شوانە لەو کەوتنەوە هیچی بیر نەماوە، نازانێ کێی و چی بووە. سوڵتان بۆ مەملەکەت دەبێتە پێغەمبەر، عەدالەت بەرپا دەکات، دزی و درۆ و خراپە ناهێڵێ، سزای دزی و درۆ لە خراپترین سزاکانن، قازی دەکات بە مەسولی ئەوە، دەڵێت لە کەسی قبوڵ مەکە حەتتا منیش. شوانە هێند باشە، ناوی بە هەموو دنیادا بڵاو دەبێتەوە.
ڕۆژێک ئاواییەکان باسی ئەو پاشایە دەبیستن، دەڵێن با بچینە لای و دادی خۆمانی لە کن باس بکەین، بەشکو هەقمان بسەنێت. عەرزوحاڵ بە لاوێکی خوێندەواریان دەنووسن، بە نوێنەری حەوت پیاوماقوڵیان دێنە خزمەت قازی، کە گوایە نزیکەی سێ ساڵێکە شوانێکیان بە هەزار سەر مەڕەوە ڕۆیشتووە و کەس نەیدیوە، شوانەمان بۆ پەیدا بکە، یا مەڕەکانمان بۆ بێنێتەوە. قازی بە بیستنی ڕازی وا دەچێتە خزمەت پاشا و ئاداب بەجێ دێنێت، عەرزی دەکات: قوربان قەزییەیەکی وەها هەیە تۆ دەڵێت چی، پاشا دەڵێت:
- شوانە بدۆزنەوە و حیسابی لەگەڵ بکەن!
بە پیاوانی نوێنەری حەوت ئاوایی دەڵێت: شوانە بدۆزنەوە و با دادگایی بکەین، ئەوانیش وەسفەکانی دەڵێن، قازی سەر دێنێ و دەیبات لە یەکێک دەچێت دیبێتی. مەملەکەت دەگەڕێن نایدۆزنەوە. پاشا دەڵێت بیانهێنن بۆ لام. کە حەوت پیاوە دێن، بۆین مەعلوم دەبێت پاشا شوانەیە، ڕوو لە قازی دەکەن، دەڵێن: قوربان ئەوە شوانەکەیە! قازی ڕەنگی دەگۆڕێ و

دەڵێت: کفری وامەکەن. ئەوانیش دەڵێن قوربان ئەم پیاوە لە کەیەوە شوانی ئێوەیە؟ قازی دەڵێن: سێ ساڵێکە. دەپرسن: چۆن بوو بە پاشا، قازی دەڵێت: لە فلانە ڕۆژدا بازی بەسەر نیشتەوە، ئەوانیش دەڵێن: قوربان سێ ڕۆژ پێش ئەوە مەڕەکانمان نەما. کاتێک پاشا دەبینێت، وەها چپەچپیانە دەڵێت: ها چییە؟ قازی ڕەنگی زەرد دەبێت، پاشا دەڵێت: هەق برۆ و لە هیچ مەترسە عەدالەتت بیر نەچێ، ئەوسا قازی دەڵێت:

- خاوەن پایە شوانەکەیان ئەو خەسڵەتانەی تیابووە، کە لە جەنابتاندا هەیە.

پاشا دەڵێت:

- یەعنی من شوانی ئێوە بووم؟ حاشا لە تەمەنمدا شوانیم نەکردووە.

چل پیاوەی گوندەکی دەهێنن، هەر چلیان دەست بە قورعاندا دەدەن، ئەو شوانیان بووە. قازی دەڵێت:

- قوربان بە پێی یاساکانی تۆ، جەنابتان درۆتان کردووە و سزاتان زیندانی کردنە.

خەڵکی ئاواییەکان دەڵێن: هەزار سەر حەیوانەکەمان کوا؟ پاشا دەڵێت:

- حاشا لەوەی من ماڵی خەڵک بخۆم.

ئەوان دەست بە قورعاندا دەدەن، هەزار سەریان هەبووە. قازی دەڵێت:

- قوربان تۆ بە دزی مەحکومی.

پاشا دەبەن و لە داری دەدەن، چونکە بە دزی و درۆ مەحکوم بووە.

دادە ئەمە ئەو حیکایەتە بوو کە تۆ نووسیت، دڵت پێی خۆشبوو؟ بۆچی واتکرد شوانە شتی بیر بچێتەوە؟ ها؟ خراپەی ئەو چی بوو؟ دەتویست بڵێیت کەس لە دەستی من دەرناچێت؟ ئەوە بە ڕیشی کێ ڕەوایە؟ کێ دەزانێ ئەو شوانە بێ خەتایە؟ کێ دەزانێ ئەوە قوربانی دەستی هۆنینەوەی تۆیە؟ چون ئەو خەڵکە کۆ دەکەیتەوە و پێیان دەڵێت، ئەو پیاوە شتی بیرچووبووبوویەوە، وەگەرنا پیاوی باش و دڵسۆز بوو؟ دادە شتێکت پێ دەڵێم دڵت گەرد نەگرێ؛ بەس نەبوو تۆ خودا نەبوویت!

# شەوی نۆزدە

بە ناوی خودا کە خۆی بەدیهێنەرە لە دەسەڵاتی ئەودایە هەموو بەدیهێنانێک. ئەو زانستەی ئەو پێمان نەبەخشی کوا ئێمە دەیزانین؟ ئەو ئیبداعەی وی نەبێ کوا سەرسام و موتەحەیرمان دەکات.

ئەز بۆنسازی مەملەکەتی قەلەندەرانم، خونچەبۆیم ناوە. بە ڕەسەن ئەهلی عەشق ئابادم. وەختی خۆی باوکم بۆ دۆزینەوەی باشترین بۆنەکان، لە عەشق ئابادەوە دێت بۆ خۆراسان و لەوێوە بۆ بەغداد و کوفە. چەندین جار چۆتە چین و ماچین، ڕۆژهەڵاتی تەی کردووە، لە ڕێ بۆ چوونە شوێنێک کە مامزانی لێیە و بە ئاگرە ناسراوە ڕێی دەکەوێتە ئێرە و هەر لێرەش، دڵنەوازی دەنگخۆش و ئەفسانەشێوە دەخوازێت و منیان دەبێت، بەڵام دایکم بەسەر منەوە گیان دەسپێرێ. باوکم وەختە شێت بێت، وەک چۆلەکەی سەربڕاو دێت و دەچێت. باجی ئەجاو شایەتە خۆی بە عەرز و ئاسماندا ئەدات و دەپاڕێتەوە، خودایە سەبەبێک بنێرە ئەو ژنەم نەمرێ. لە تاواندا ڕادەکاتە بۆنخانە و باشترین بۆنەکان دێنێت، ئەیدات لە لووتی، وەلێ چا نابێتەوە، چاری نامێنێ من بە ڕووتی دەنێت بە لووتی دایکمەوە، دایکم هەناسەیەک دەدات و چاو دەکاتەوە. ئیتر دەبێت بە سڵاواتدان، لە بەخششدا حەوت بۆنی سەمەرە بە باجی ئەجاو دەدات. دوایی لە دایکم دەپرسێت:

- بۆنی چیت کرد؟

ئەویش دەڵێت:

- خونچە!

بۆیە ناوم دەنێن خونچەبۆی. خودا بیانبەخشێ ئێستە هەردووکیان چوونەتە جێی حەق، وەک عاشقە و ماشقە بە یەک شەو مردن. وەک دایکم بۆی گێڕاومەتەوە دەڵێت: ئەو شەوە کە زانیم باوکت ئەوەندە شەیدامە، گوتم خودایا بە خاتری عەزەمەتی خۆت بە یەکەوە گیانمان بکێشە. نزاکەی دایکم گیرابوو. بە یەک شەو عەمری خوایان بەجێ هێنا.

دوکانەکەی من لە گۆشەی کۆتایی پردەگاورە، هەموو شار لای من بۆن دەبەن، میسک، عەنبەر، عودی هیندی، زەعفەران، سەندەڵ، مێخەک، سونبول، هەموو گوڵەکانی وەک: سەوسەن و شەقایەق و وەنەوشە و مینا و نەرگز. بۆنی سەیروسەمەرە لە عەتارخانەکەم هەن، لە بابمەوە بۆم ماوەنەتەوە. ئێواران تەماشای غروب لەژێر پردەکەوە، سەیر دڵتەنگکەرەیە. ڕووباب دێت و پێکەوە چایی ڕێحانە و دارچین دەخۆینەوە و باسی حیکایەت دەکەین، لە دڵتەنگی و قەدەری خۆمان ئەدوێین. ئەو کچەم خۆشدەوێت لە کەسی تر ناچێت، لە پڕ دێت، مات و چڵکن، خەیاڵی لە شوێنێکی دوورە، چاییەک لێدەنێت و دوو کوپ بۆ هەردووکمان تێدەکات. جاری واهەیە نایخواتەوە دەڕوات، جاری واشە کوپەکە

دەباتە بەر عەتارخانە و تەماشای ئاوەکە دەکات، خەیاڵی بۆ دوور دروو دەڕوات و چاییەکەی دەخواتەوە. شتێک هەیە لە ڕووبابدا، بەشی منە، ئەو بەشی خۆمم خۆشدەوێت. بێ ڕووباب هەر بەڕاستی نەک وەک قسەی ناو هەقایەتەکان، ئەم مەملەکەتە زۆر شتی کەم بوو!

بۆنێکم بۆ هێناوی، لە گوڵی فیردەوس و گوڵە موشتاق دروستم کردووە، دوور نییە دەوای فەرامۆشیت نەبێت!

خاتوونی من؛ ڕۆژێک سەرمەدت نارد بە شوێنمدا، خۆم بۆ حیکایەتێک حازر بکەم، ڕووباب دڵتەنگانە لە عەتارخانەم دانیشتبوو، سیمای ڕەش داگەڕابوو، وتم:

- من دەڕۆم تو دوای خۆت دایخە. وتی:

- مەڕۆ دڵم تەنگە، شەو پێکەوە دەچین.

هێندەی نەبرد دیتمان، توراب سازەکەی دابوو بە شانیدا و بەرەو مەیخانەکەی سڵێوە عیسا دەڕۆیشت. ڕووباب دەستێکی بۆ بەرز کردەوە:

-توراب بە خاتری برینت، وەرە تۆزێکمان بۆ بژەنە.

توراب کە گوێی لە دەنگی ڕووباب بوو، بزەیەکی تاڵی کرد، هاتە بەردەم عەتتارخانە و پشتی دا بە دەرگا لە گوێز دروستکراوەکەی کە باوکم بە خەتی کوفی لێی نووسیوە عەتارخانەی قەلەندەران، ڕوو لە ڕووبار دەیژەند و غەزەلخوانی دەکرد. خەڵکی ئەو ناوە کۆبوونەوە، ڕووبابیش هەستا و لە ژوور لەسەر کورسییە ئەرخەوانییە ئاوریشمینەکەی خۆی، دانیشت. کاتێک توراب ئەو غەزەلەی حەزرەتی مەحوی وتەوە:

بە نوری بادە کەشفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم چ بکەم ؟

بە شەمعێکی وەها چارەی شەوێکی وا نەکەم چ بکەم؟

تا ئەوەی گەیشتە دەڵێت:

ئەوا لەیلا بە ڕۆژی حەشرەدا وادەی لیقا "مەحوی"

هەتا قامی قیامەت ئاهوو واوەیلا نەکەم چ بکەم؟

بێ ئەوەی کەس چاوی لێ بێت، ڕووباب هۆن هۆن فرمێسک بە چاوانیدا قەتارەی بەستبوو، ڕەشی دەموچاوی دەتکا و ڕەنگی سپی هەڵدەگەڕا. خەڵکی زۆر ببوون، لەو نێوەندەشدا ڕوحنەوازی داودی ئاوێنەسازی لێ بوو، کە لەم دواییە زوو زوو سەرم لێدەدات. دەیزانی ڕووباب لێرەیە، لە حەژمەت ئەو، لە تاو دەنگی توراب فرمێسکی ئەستوور ئەستوور لەو برژۆڵە درێژانەیەوە دەوەری، جەرگی بەشەری بە کەباب دەکرد. سەیر برینی لێ دەتکا، هەمووان داوایان کرد توراب غەزەلێکی تر بخوێنێ، ڕووباب لە ژوورەوە گوتی:

-توراب؛ ئاوایە ڕێگەی عاشقانمان بۆ بڵێ.

توراب غەزەلەکەی وەفایی دەوتەوە، کە یەکەم بەیتی چڕی:

ئەی دڵ وەرە هۆشیار ببە، هذا طریق العاشقین

مەحوی جەماڵی یار ببە هذا طریق العاشقین

لەوێوە حەیدەر مەقامی تەمبوورژەن هات، تەمبوورەکەی دەرهێنا و بە دەم ژەندنەوە، شیعرەکەی وەفایی دەوتەوە.

ئای لەو ئێوارەیە، من دەترسام لەوەی دواکەوتووم، بەڵام دوایی ڕووباب بۆی گێڕامەوە، کە تۆیش تەماشات کردووین و دەستت بە گریان کردووە، چونکە دوای ئەوەی شیعرەکە تەواو بوو، باران داباری، خەڵکەکە خەریک بوو بڵاوەیان لێدەکرد. ڕووباب شاڵەکەی پێچا لە خۆیەوە، دەستێکی خستە سەر شانی توراب و وتی:

-ئەلحەق، کە خودا دەتکات بە موتریبی بەهەشت!

جا ڕۆیشت، هەر لەوێدا ڕوحنەواز بوو بە هەزار پارچەوە. من بە پەلە دوکانم داخست و ویستم بڕۆم، تەماشا دەکەم سەرمەدیش نەڕۆیشتووە، چاوی نمی هەیە، ئەویش بە بەزمەکە برینی کولاوەتەوە! پێکەوە هاتینە حیکایەتخانە. وتیان درەنگە زۆر درەنگ، بەڵام من بێدەنگ بووم، هیچم نەوت. وتیان خانم ئێستە تووڕە بووە، ساڵی یەک جار کاری پێتانە، ئێوەیش نایەن. دیسانەوەش من هیچم نەوت!

لە حیکایەتخانە لاسی لێ بوو، کوڕە هەرە ئەفسانەییەکەی مەملەکەت، من هێشتا خەیاڵم لای ڕووباب بوو، حیکایەتخوان وتی: ئامادەبن، ئێمە ئامادەبووین. وەلێ حیکایەتی ئەو شەوەت زەبری توندی لە من دا. حیکایەتەکە وەها بوو کە:

ڕۆژێ ڕۆژگارێ، لە گوندێ لە شارێ، کیژێکی عەتتار هەیە، بە بۆنەکانی دەردەدار دەوا دەکات، دڵتەنگ دڵگوشاد و تازییەبار سەبووری پێدەدات، کورد وتەنی بەشەری مردوو زیندوو دەکاتەوە. ناو و ناوبانگی کیژەی عەتتار حەوت مەملەکەت دەڕوات. ژنان و پیاوان و منداڵان و زارۆکان وەک فریشتەی خودایی تەماشای دەکەن، دەستی بە پیرۆز دادەنێن، دوای ئەوەی بۆنیان دەداتێ دەستی ماچ دەکەن. حیکایەتەکە وەها دەبێت: ڕۆژێک سوارێک بە ڕێبواری ڕێی دەکەوێتە ئەو شارە و دەچێتە کاروانسەرا بحەوێتەوە. چەند ڕێبوار و کاروانێکی تریشی لێ دەبێت، هەر کەسە و حیکایەتی خۆی دەگێڕێتەوە، بۆچی هاتۆتە ئەم شارە، یەکێکیان دەڵێت بۆ عەترێک هاتووم کە ژنەکەم بخاتە سکوزا، کڕیومە و سبەی بۆی دەبەم. ئەوکات مەجلیس دەبێت بە باسی ئەو عەتتارە، لە کوڕە دەپرسن تۆ بۆچی هاتوویت؟ ئەویش دەڵێت: من تووشی فەرامۆشی بووم و خەریکم وەک سواڵکەران شارەوشار دەگەڕێم، ئەز نازانم چیم و کێم. خەڵکی نێو سەرا، پێشنیاری بۆ دەکەن بچێت بۆ لای خانمی عەتتار، داوای بۆنی لێ بکات، بە ماوەیەکی کەم بۆی دروست دەکات و دەردی چارە دەبێت. کوڕەش بەو ئومێدەوە دەنوێت. بۆ بەیانی بە پرسیار عەتتارخانە دەدۆزێتەوە و دەچێتە بەردەمی. کچە چی دەبینێت، سوارێکی ڕەنگ زەردی کاکۆڵ زێڕینی قەدوباڵا بڵندی چاو عەسەلی، کە کاکۆڵی لوولی بە دەوری سیمایدا پەخش و پەرێشانە، دەست و پەنجەی شمشاڵ ئاسایە و گەردنی بەرزە. عەتتار لە دڵی خۆیدا ئێژێت: ئەمە بۆنی خوداییە!

کوڕە چی دەبینێ: کچێکی باڵا عەرعەری مەمک جووتی، کەمەر باریکی، لێو خونچەی هەنییە مانگ. لەناو کراسێکی کوردی سرکەیی یەقە کراوە، سەری بە مێزەرێکی ئاوریشمینی وەنەوشەیی بەستووە، دوو گورز پەلکەی ئەستووری بەسەر شانیدا شۆڕ بوونەتەوە. ئەودەم کوڕە، لەبەر خۆیەوە دەڵێت: یا بەدیع! کچە دێتەوە هۆش خۆی و فەرموو لە سوارە دەکات، گیراوەی گوڵەباخ تێکەڵ بە هەنگوین و دارچینی دەداتێ و دەڵێت: چیتان بۆ دروست بکەم؟ کوڕە دەڵێت شتێک، دەرمانێک، بۆنێک، مەرهەمێک، بیرم بخاتەوە من کێم و چیم؟! کچە کە تا ئێستا داوای وەهای لێ نەکراوە، نەختێک ڕادەمێنێ، ئەوسا دەڵێت: چەند ڕۆژتان کات هەیە؟ کوڕە دەڵێت هەرچەندێک ئێوە تەواوی بکەن. عەتتارە دەڵێت: باشە سبەی سەر بدەنەوە، بە بوون و نەبوون پێتان دەڵێم! کوڕە هەڵدەستێ و بۆ چرکەیەک چاوی دەچێتە سەر چاوی



مەخموری عەتتار و دڵی بەر تیری دەکەوێ. سوارە هەست دەکات حەوت جار غەریبە، هەست دەکات حەوت جار هاوەڵی دۆزیوەتەوە. حەوت ڕۆحی دەرکێشراوە، حەوت ڕۆحی پێ بەخشراوە. پڕ دەبێت لە خورپە و تەپە، دەچێتەوە بۆ کاروانسەرا. ئەو شەوەی بە سەد شەو لێ دەڕوات، بەیانی زوو هەڵدەستێ و دەچێتەوە بەر دوکانی عەتتار، دەبینێ هێشتا نەکراوەتەوە، هێندە زوو چووە، پاش سەعاتێک عەتتار دوکان دەکاتەوە و فەرمووی لێ دەکات و عوزورمایی بۆ دێنێتەوە کە ئەو ڕێبوارە و نازانی ئەم هێند زوو دوکان ناکاتەوە. ئەوسا عەتتارە بەردەرکی دوکان ئاوڕشێن دەکات،

ئینجانەکانی ئاو دەدات، شووشەی دەرگا شینە دڵڕەقەکەی دەسڕێت، گۆزە و شووشە و کوپەڵی بۆنەکان پاک دەکاتەوە، سوارەش دانیشتووە تەماشای دەکات و دڵی ئەنجن ئەنجن دەبێت. کچە کترییەکەی دەخاتە سەر ئاگردانی ناو عەتتارخانە و گیراوەیەکی لە ڕۆحی زەعفەران و شیر و هەنگوین و گوڵە ئەفسوون بۆ دروست دەکات، دەیداتە دەستی، هەردووکیان چاویان بەریەک دەکەوێت، هەست بە ئاشنایییەکی قووڵ دەکەن، زۆر قووڵ وەک ئەوەی هەزاران ساڵ بێت هیی یەک بن، وەک ئەوەی دوو لەتی یەک گۆزە بن و پێکەوە نرابنەوە.

ئەوجا عەتتارە لێوی وەک خونچە توند دەکات و دەڵێت:

- هۆ ڕێبوار، بۆنی تۆم دۆزیوەتەوە، بەڵام دەبێت سەبری چل شەوت هەبێت.

کوڕەش لە خۆشیاندا شاییمەرگ دەبێت، دەڵێت:

- قەیدی چییە چل چلە بێت. ئەمن بمرم چاوی لەیلا خۆش!

کچە دەڵێت:

- چۆن ئەو غەزەلەت بیرە؟

ئەویش دەڵێت:

- نازانم هیی کێیە، بەڵام بە مەجنون دەڵێن: خەلیفە مرد، ئەویش دەڵێت: ئەتۆش بمرە بە من چی چاوی لەیلا خۆش.

کچە دەڵێت:

شیعری مەحوییە. بەو شێوەیە سەری قسە دەکەنەوە و پێکەوە دەدوێن.

غەریبە هەموو ڕۆژێک دەچێتە لای عەتتار و عەتتاریش ئەگەر ڕۆژێک درەنگ بیبینێ دڵی تەنگ دەبێت، جوانترین حیکایەتەکان پێکەوە دەگێڕنەوە، باسی چیرۆکە عاشقانەکان دەکەن، حیکایەتی لاس و خەزاڵ، مەنیژە و بیژەن، مەم و زین، تەنانەت لەسەر حیکایەتی نازر و مەنزور دەوەستن و پێیان سەیر دەبێت، دوو کەس نێر و مێ نەبن و وەهاش یەکیان خۆشبوێ. ڕۆژێک کوڕە موغازەلەی دەکات، ئەویش دەڵێت چییە؟ بووین بە نازر و مەنزوور، کوڕە دەڵێت: ئەوە چۆن بوو؟ ئەویش دەڵێت وەختی خۆی پاشا و وەزیریک دەبن، منداڵیان نابێت داوا لە خودا دەکەن دوو کوڕیان پێ بدات، خودا یەکی کوڕێکیان خەڵات دەکات، ناویان دەنێن نازر و مەنزور، ئەم دوو کوڕە پێکەوە گەورە دەبن و هۆگری یەک دەبن، وەک عاشق و مەعشوق بۆ یەک دەسووتێن، چەندین جار بە گومانی خراپ لە یەکیان دوور دەخەنەوە، سەرەنجام پێک دێنەوە و دەبن بە پادشا و وەزیر. کوڕەی لاو دەخەنێتەوە و دەڵێت: تا کیژان وەستابن گوناحە پیاوت خۆشبوێت، کیژی وەک تۆ دڵڕووبا...! عەتتار نازێکی بۆ دەکات و خەریکی سازکردنی بۆن دەبێت. بەو شێوەیە نزیک دەبێتەوە لە چل شەو. شەوێک لە خەونیدا پیاوێکی نوورانی ڕایدەسپێرێت: کچم عەتتار، ئەو بۆنە مەدە بە غەریبە. سێ جار ئەو قسەیە دەڵێتەوە. کچە لە خەو ڕادەبێ و نازانێ چی بکات بیداتێ یان نا، هەرچۆنێک بێت کچە دەڵێت: بۆ ئەوەی بە درۆزن دەرنەچم بۆنەی دەدەمێ، ئەگەر قەرار بێت عاشقی من بێت، ئەوە هەمیشە عاشقمە، ئەگەریش دوای بۆنەکە عەشقەکەی نەما، بزانە خەریکی لەهولەعب بووە، بابڕوات، ئەمن شایستەی وی نیم!

سپێدەی ڕۆژی چلەم، کچە و کوڕە لە عەتتارخانە دەبن، هەردووکیان تەماشای یەک دەکەن، ترس هەردووکیان دەگرێت، عەتتار کوپەڵەیەکی بچووک دێنێت و دەیخاتە سەر نێو دەستی ڕێبوارە، دەڵێت:

- بچۆ لە ماڵەوە بۆنی بکە!
کوڕەش بە ترسەوە وەریدەگرێت، بۆ تاوێک دەستی لە دەستی کچەدا دەهێڵێتەوە، ئەوسا بە دەم ترسەوە دەچێتەوە کاروانسەرا، لەوێ کوپەڵۆچکەکە هەڵدەچڕێت و بە لووتییەوەی دەنێت. یەکەم جار بە هێمنی، دوای توزێ بە توندی جاری سێیەم بە نەفەسێکی قایم هەڵی دەمژێ و لە هۆش خۆی دەچێت. ئەوانەی لە کاروانسەران دەیخەنە سەر جێ و دایدەپۆشن، کوڕ تا سێ ڕۆژ بێ هۆش دەبێت، ڕۆژی سێیەم کە هۆشی دێتەوە، زارەترەکانە دەڵێت ئێرە کوێیە؟ من بۆ لێرەم؟ چی منی گەیاندۆتە ئێرە؟ ڕێبوارێک، کە دە شەوە لەوێیە و ئەم دەناسێ دەڵێت:
- تۆ سێ ڕۆژ لەمەوپێش بە بۆنی عەتتار خاتوون ساغەوە بوویت، سێ ڕۆژە بێ هۆشیت، بۆ دەرمانی فەرامۆشی هاتوویتەتە ئێرە.
ڕێبوارە تووشی ڕامان دەبێت، هەمووان دەوری لێ دەدەن و لێی دەپرسن، چی بیرت کەوتۆتەوە؟ ئەویش دەڵێت:
-من کوڕی شازادەی ئەندلوسم، حەوت ساڵ شەیدای کچی شای یەمەن بووم، کە دوژمنی ئێمە بوون، دوای حەوت ساڵ بابمان ئاشت بوونەوە، ڕازی بوون بە هاوسەرگیری ئێمە. شەوی زەماوەند، سێ کەسی دەموچاو هەڵبەستراو هاتن و کوتەکێکیان کێشا بەسەرمدا، کاتێک دەزانم لە دەشتێکی دوورم و ئەسپێک لاما بەستراوەتەوە.
من بیری دولبەرم دەکەم، وای خوایە. ئەوسا پیاوان دەڵێن: ڕەسمی ئێرە وایە بچیت دەستی خاتوونی عەتتار ماچ بکەیت و سوپاسگوزاری بێت. کاتێک دەچێتە دوکانی عەتتار، کچە چی دەبینێ غەریبێک کە نەتاسەی هەیە نە مەیل، وەک نەناسێک دەستی ماچ دەکات و دەڵێت:
- سوپاس بۆ هەموو شت. بۆ چل ڕۆژ. بۆ دەرمانەکەت من دەبێت بگەڕێمەوە بۆ لای دەزگیرانەکەم.
عەتتار دڵی دەگوشرێ، سەری گەرم دەبێت، بەڵام هیچ ناڵێت، تەنها کوپەڵەیەک بۆنی تایبەتی دەداتێ و دەڵێت:
- ئەگەر ڕۆژێک دڵت تەنگ بوو بۆنی ئەمە بکە، ئەگەر بیری ئێرەت کرد، بێرەوە!
کوڕە بەوپەڕی بێ تاسەییەوە لێی وەردەگرێت و دەڕوات. عەتتاریش بەرچاوی تاریک دەبێت و دەکەوێت، لە زرمەی، دوکانانی دەرودراوسێی دێنە هانای، لە دڵەوە تف و نەفرەت لەو هەتیوە غەریبە دەکەن، کە قەدری گەوهەر نازانێت. دوعای لێ دەکەن خێراندار نەبێت. عەتتار چل شەو لەناو پێخەف دەگری و نوزەی دەرنایەت. ڕۆژی چلەم هەڵدەستێت دەچێتەوە دوکانەکەی و بۆنێک دروست دەکات، کاتێک دای لە خۆی کەس نەیبینێ.
جا با بچینەوە لای کوڕە، دەڕوات دەڕوات بە حەوت شەو دەگاتەوە کۆشکی بابی، دەبینێت کۆشک ماتوملول و خەمبار، هەمووان لووتیان داژەندووە. پرسیار لە تازە پاسەوانێ دەکات، چ خەبەرە؟ ئەویش دەڵێت: گەورەم هەر مەپرسە، وەختی خۆی سێ ساڵ پێش ئێستا شازادەیەکمان هەبووە، لە شەوی زەماوەندا مەحف بووە. ئەوە سێ ساڵە کۆشک وەهایە.
کوڕە دەڵێت: من دەزانم شازادە لە کوێیە بمبەنە خزمەت پاشا، دەیبەن و شا کە کوڕەی دەبینێت خەریکە شاییمەرگ بێت، کۆشک دەبووژێتەوە. حەوت شەو حەوت ڕۆژ نوقڵڕژان و گوڵاوپرژانە. دوای حەوت ڕۆژە، کوڕە سۆراغی دەستگیرانی دەکات، باوکیشی دەڵێت:
- ڕۆڵە وتیان تۆ مردوویت، بۆیە دوای چل شەو دایان بە کوڕی پادشای ئێران. ئێستا کوڕێک و کچێکی هەیە و پێمان لێ نابڕێت.

کوڕە بەو قسەیە دڵی توند توند دەبێت. دەچێتە ژوورەکەی خۆی و دەگری، دەگری هێند دڵی توندە نازانێ چی بکات. بیری کوپەڵۆچکەکەی دەکەوێتەوە و دەریدێنێ دەینێت بە لووتییەوە. سەیر بیری عەتتار دەکات، تووڕە دەبێت لە وەحشییەتی، لە هەرزەیی، لە بێ ڕەحمی و نامەردانەیی خۆی. بیری چل ڕۆژ عەشقی خۆی دەکەوێتەوە، بیری عەتتار و چاوە خومارەکانی. بە بابی دەڵێت:

- دەچم دڵڕووبای خۆم دێنم و دیمەوە.

وەڕێ دەکەوێت بۆ لای عەتتار، لە حەژمەتا بە سێ ڕۆژان دەگات. کچە کە ئیدی فرمێسکی نەماوە و تەواو دڵی ڕەنجاوە لەوەی نەیتوانیوە عاشقەکەی بهێڵێتەوە، بریندار دەبێت و بۆنێک لە خۆی دەدات کەس نەیبینێ. ئەو دەمەی کوڕە دەگات و سۆراغی دەکات، پیاوانی شار بە تەورەوە بۆی دەچن و دەڵێن چل شەو لە جێ کەوت و نەتویست، ئێستە بۆ هاتوویتەوەوە؟ دەزگیرانەکەت شووی کردبوو؟ دەپاڕێتەوە و خۆی دەدات بەسەر قاچیاندا، ئەوان دەڵێن:

- لێرە نەماوە دوکانەکەی لەوێیە، کراوەیە بچۆ بۆنی هەڵمژە و وەر دەر، ئێمە هەموومان ڕۆژی جارێک وادەکەین.

کوڕە دەچێتە ئەوێ، دادەنیشێت و دەگری. غەزەلان دەڵێت و شین دەگێڕێت. بەڵام کچە خۆی نیشان نادات، تەنها دانیشتووە تەماشا دەکات، چل ڕۆژ ئەمە حاڵی کوڕە دەبێت، دوای چل ڕۆژە سوار ئەسپ دەبێت و لە چاوان ون دەبێت. دوای ڕۆیشتنی ئەو، کچە دێتەوە ناو خەڵک و دەست دەکاتەوە بە بۆنسازی.

خاتوون ئەمە ئەو حیکایەتە بوو، کە لاس و خونچەبۆیت تیدا بە یەک گەیاند. بەڵام خاتوون؛ تیری خەمی جەرگی داغان کردم، دوای ئەو حیکاتە هەردووکمان تەماشای یەکمان کرد، ئەو وتی: بۆنەکانت خۆشن. من وتم: کەلامت شیرینە. بەڵام کەسمان نەمان وێراوە باسی عەشق بکەین، کەسمان! ئێمە لە کۆتایی ئەم حیکایەتە دەترسین!

# شەوی بیستەم

ئەو زانایە، قەدیمە، ئەزەلییە ئەبەدییە، خۆی دانایە بە هەمووشت، خاوەن کەلامە، بە ناوی ئەو.
بەندە ناوم دوڕ محەممەدی کتێبدارە، کتێبەکانی مەملەکەتی قەڵەندەران سەرپەرشتی دەکەم. ڕەنگە گەورەترین کتێبخانەی شەرق زەمین بێت، ئەو کتێبخانەیەیە کە دەستنووسی سەیر و عەجبابییەتی تێدایە. زۆر شوێنان گەڕاوم، زۆر کتێبخانەی شاهان و وەزیران و زانایانم دیتوون، بەڵام هەرگیز وەک ئەمەم نەدیتووە.
لە گێڕانەوەی خۆم عاجز و دەستەوەسانم، نەسلی من سەیرە و نازانم چۆن باسی بکەم. من خەڵکی هیچ شوێنێک نیم و هیی زۆر شوێنم. دایکم لە ژن و پیاوێکی ئێرانی و تورک بووە، بابم لە ژن و پیاوێکی عەرەب و کورد بووە، ئەز سەر بە هەموویانم و هیچیان. خەریکی وەرگرتنم و تالبی ڕێگەی مەعریفەم. نازانم چۆن گەیشتوومەتە ئێرە، ساڵان زۆرم بیر لێ دەکردەوە، هەندێ جار وا دەهاتە پێشچاوم کە کتێبێکم خوێندبێتەوە و کەوتبێتمە ناوی. بەڵام ئیتر لەم دواییەدا کە دەنگۆی ئەوە بڵاوببووە ئێمە خەیاڵی تۆین، من لە دڵەوە ئافەرینم کردی، کە شتی وەهات کردووە، نزانم بۆ کردی خودا لە زانستی غەیبت پێ ببەخشێ.
لە خانەی کتێب، تالیبانی عیلم و عاشقانی ئەدەب و کوشتەکانی ئەفسانە، کۆ دەبنەوە و گفتوگۆ لە بارەی زۆر شتانەوە دەکەن، جاری وایە لەوێ کافر و موئمینێک بە یەک دەگەن، دەیکەنە مەیدانی جەریدبازی. جاری واشە، موسوڵمانێک و جوویەک و مەسیحییەک. زۆر جاران نیقاش و قاڵ و قیل هێند توند بووە خەریک بووە، دەست بدەنە گەریبانی یەکتر. من تەنها گوێ دەگرم و هیچ ناڵێم، تا هەر لایەکەیان بۆ پشتی خۆیان دەمخەنە ناو باسەوە و دەڵێن: جەنابی مەکتەبدار تۆ لە کتێبی فڵاندا نەتبیستووە وەها دەڵێت؟ وەها منیش دەخەنە نێوان گفتوگۆکانیانەوە. لێرە کوڕێکی بێ جورمی لێیە هەر لە شاعیر دەچێت، باڵابەرزێکی زەردهەڵگەڕاوی، کەمدوو. بە ناوی دروودی حاجی عەباسی خەتجوان، زۆرترین کتێبی ئەم کتێبخانەیەی خوێندۆتەوە، خۆرەی کتێب خۆیەتی، ئەو جەوانە لە خەتناسیدا، هیچی لە باوکی کەمتر نییە.
کاتێک کتێبدۆستان کۆ دەبنەوە و نیقاشیانە، ئەو لە سووچێکدا شەمعێکی کەمنوور دادەنێت و دەست بە نووسینەوەی ئەو نیقاشانە دەکات. غەزەلی کوردی نییە لەبەری نەبێت، حافز و سەعدی و ئەشعەری و نازمی ئەزبەرە. بیرم نییە تا ئێستا بەشداری هیچ قسە و گوفتارێکی دەستەجەمعی کردبێت. دەفعەیەک نەبێت کە یەکەمجار و دوایەمین جار بوو.
ئەو ڕۆژە هەمووان لە دەوری کورەی ناوەڕاستی ژوورەکە کۆ ببووینەوە، لە دەرەوەش ڕەشەباییەکی زۆر بەزەبر بوو. باس هاتە سەر باسی شەریعەت و تەریقەت، مەلا نجومی دەربەند فەقەرە و دوو مەلا زرنگەکەی کە ناویان مەلا

ئەیاز و مەلا عەباسە لەوێ بوون، میرزا ئادەمی حیکایەتخوان و ئیبن حاتەمی حەکیمباشی و موشتاقولیقا و ڕۆحنەوازی ئاوێنەسازیش، کە بەم دواییانە دێتە ئێرە و تەنها گوێ دەگرێت و هیچ نالێت، هەشت نۆ پیاوی تریش بوون، لە سووچێکی دووریشەوە ڕووبابە دانیشتبوو. ئەویش تەنها گوێی دەگرت، تەماشای دەکرد، سیگاری بە سیگار پێ دەکرد. نازانم چۆن قسە دامەزرا، بەڵام گفتوگۆ وای لێ هات، بوو بە هیی نێوان مەلا ئەیاز و غولام وەلی کە لە دەستەی زکرکەرانی کۆڕی شەوانی هەینیی تەکیەی گەیلانییە، خۆی لە بنەڕەتدا موریدی ڕێبازی ڕۆمییە. هەردووکیان دوو پیاوی فامیدەن. جەدەلەکە وەها بوو:

پیاوی خودا دەبێت بۆ موجاهەدە و ڕێنمایی لەناو خەڵکاندا بێت، تەرکی دنیا نەکات. مەلا ئەیاز سەری قسەی گرتبوو، کە پێغەمبەری ئیسلام و خاتەمی ئەنبیا خۆی فەرموویەتی "لا رهبانية في الإسلام"، ئەمەش مانای ئەوەیە، دەبێت پیاوی موسوڵمان نوێژ و ڕۆژوو بگرێت، لەناو ماڵ و منداڵ و هاوەڵ و خزم و قەومانیدا بێت، نەک وەک ڕاهیبەکان تەرکی دنیا بکات، کە خۆیان نەزر دەکرد و ئیمانیان دانەدەمەزراند. خوا بۆیە غەریزەی داوە بە ئینسان تا بە باشی بەکاری بێنێت و یەکێک لەو غەرزانە بە یەکەوەبوونە، پێغەمبەری خودا، بۆچی لەگەڵ منداڵ و گەورە و پیر و ژن و کچدا قسەی دەکرد و گوێی لێ دەگرتن، چونکە دەیویست ڕێنماییکەر بێت بۆیان. غولام وەلی وتی: بەڵام ئەو پێغەمبەر بوو نەک ئێمە، ئەو نێردراوی خودا بوو، نەک ئێمە. شێخی ئێمە لە زاری شێخی خۆیەوە دەفەرموویێت:

- تا دەتوانن خۆتان لەو مەجلیس و قەرەباڵغییە بپارێزن کە باسی ئیمان و خودای تێدا نییە.

مەلا ئەیاز وتی: بەرەکەت لە پێکەوەبوون و نزیکی نێوان برا موسوڵمانانە، ئێمە کە پێدەگەین بە خواردنی خەڵکان پێدەگەین، تا خۆشەویستیی ئەوان لە دڵماندا بێت. وەختێ سوختە بووین ماڵەوماڵ دەگەڕاین و قاپێکمان دەگرتەوە و یەکی کەوچکێکان بۆ تێدەکردین، بەمەش وەک منداڵی سەر یەک سفرە بووین، کە گەورەش بووین خەڵکی مەملەکەت هەر کەس و کاسەیەک خواردنی دێنا بۆمان. ئێمە لە هیی هەمووانمان دەخوارد. تا پێی پەروەردە بین و نرخی ڕەنجی ئەوان بزانین، بەڵام ئێوە موریدانی تەکیەی گەیلانی شۆربای تەکیە نەبێت نایخۆن، ئەم چییە؟

غولام عەلی وتی: شێخمان ئامۆجیاریمان دەکات، دەروێش نابێت نانی هەموو کەس بخوات، ئەو واریعە و خۆپارێز. شێخمان لە مەقالاتی دا دەگێڕێتەوە: دەروێشێک، شاگردێکی هەبوو، دەرۆزەی دەکرد و ڕۆژێک لە حاسڵی درۆزەکەی خواردنێکی دا بە دەروێش و دەروێش خواردی، بۆ شەوکەی شەیتانی بوو. بەیانی کە شاگردەی دی وتی:

- ئەو خواردنەت لای کێ هێنا؟ وتی:

- کچێکی چاکەکەر پێی دام. وتی:

- وەڵا من بیست ساڵە شەیتانی نەبووم، ئەمە پارووی ئەو بوو.

نابێت دەروێش پارووی هەموو کەسێک بگلێنێت، دەبێت پارێز بکات، دەروێش ناسکە، شتەکان کاری لێ دەکەن و لێی دەردەکەوێت، وەک چۆن جبەی پاکی سپی بچووکترین پەڵەی ڕەش پێوەی دیارە، کەچی ئەگەر جبەی ڕەشت هەبێ و چەندان ساڵ لە چڵکدا پۆرتکاو بێت، پەڵەی پیسی لێ دیاری نادات. کەوایە نابێت دەوریش پارووی زاڵمان و حەرامخۆران و جەستەدۆستان بخوات، ئەو پاروەوە دەچێتە ناوی و لێی دیاری دەدات، وەک چۆن دەروێشە بە پارووی کچە شەیتانی بوو. غولام عەلی بە حاڵ لە قسە بووبووە و مەلا ئەیاز ویستی قسە بکات، مەلا نجوم کەوتە قسان، وتی:

وەختی خۆی لەگەڵ مەلا نەعیم حافزی باوکمدا چووینە ماڵی شێخێکی واریع لە دەربەند فەقەرە، نیوەڕۆ گەیشتین، ئاوایی چۆڵ بوو. ماڵی شێخیش کەسی وای لێ نەبوو، هەموویان لە دێیەکی نزیکی خۆیان بۆ مەولوود دەعوەت کرابوون. نیوەڕۆ برسیمان بوو، نانیان هێنا، من و باوکم دەستمان کرد بە نانخواردن، بەڵام شێخ هیچی نەخوارد، ئێمەیش شەرم گرتینی و باوکم بە هەست وتی:

- قوربان بۆ نافەرمووی؟

شێخ فەرمووی:

- نابێت بیخۆم، بۆ من ڕەوا نییە!

وتمان:

- باشە ئەگەر پڵاو و گۆشت ناخۆی با شتێکی ترت بۆ بێنن.

وتی:

- نابێت، ئێوە تەواو بن ئەوسا من دەیخۆم.

ئێمە پڵاو و گۆشتی خۆشمان خوارد و و لێبووینەوە ئەوسا، شێخ فەرمووی کوڕم نجوم بچۆ بە دەستی خۆت لە کەنووەکە سێ سەلک دۆینە و چاییەکەم بۆ بێنە. منیش چووم تەماشا دەکەم ئافرەتێکی گەنجی لێیە. وتم باشە مەسەلە چییە خوشکە، شێخ نان ناخوات، ئافرەتە سەرێکی داخست و وتی: شێخ واریعە و ئەمڕۆ کەس لە ماڵ نییە نانی بداتێ، منیش وتم:

- ئەی تۆ ؟

وتی:

-من عوزری شەرعیم هەیە.

جا دۆینە و چاییەکەم بۆ شێخ برد. نان خورا و لە دەر قسەی ئافرەتەکەم بۆ باوکم گێڕایەوە. ئەویش وتی ڕاست دەکا، شێخانی خاوەن کەشف و کەرامات نابێت نانی دەستی ئافرەتێک بخۆن لە بێنوێژیدا بێ، دەبێت ئەو کەسەی نانیان بۆ دروست دەکات مێردار و بە دەستنوێژ بێت. مەلا ئەیاز ئەوسا وتی: قوربان دین داوای ئەوە ناکات، دین پاکی ڕۆحی دەوێت، نەک خۆ سەرقاڵکردن بە شتی وەهاوە. غوڵام عەلی وتی:

- ئەوە شتی بچووک نییە، بەشە لە گشت، بەو بەشانە ئێمە پێدەگەیەنن و دەبینە موریدی ڕێگەی حەق. دەروێشی دۆزینەوەی ڕێگەی خودایە و لەگەڵ خۆبوونە: هەر وشەکە، لە شەرق زەمین بە مەعنای لە خۆدابوون دێت، تا خۆت نەناسی چۆن ئەوی تر دەناسی، تا نەفسی خۆت نەگری چۆن نەفسی ئەوی تر دەگریت؟ من ساڵانێک دەمەوێ نەفسی خۆم جڵەو بکەم تا هەموو تەمەنم پێیناگەم، کە پێشی گەیشتم شیرینی بچووک کردنەوە نەفس و جێگەدان بە حەق ئەوەندە زۆرە، کە وەک مەلایان پێم ناکرێت ڕێنماییتوێن بم. بۆیە ئەمانە بە شتی بچووک مەزانە، لە ڕێبازی ئێمەدا وەهایە "قسەکردن لەگەڵ بێ خەبەران زەرەمەندە، حەرامە. قسەکردن لەگەڵ نەزان حەرامە، خواردنیان حەرامە، خواردنی حەرام کە لە نەزانی ئەوانەوەیە لە قورگی ئێمە ناچێتە خوار. کە خواردنی ئەو بخۆم، وک ئەوەیە بەردی مەنجەنیق بێنن بۆ ماڵی ئاوێنەساز، کە تا سەقف پڕ بێت". کاتێک ئەو قسەیەی کرد. ڕوحنەوازی کوڕی داودی ئاوێنەساز سەرێکی لەقاند. دیار

بوو تەواو تێگەیشتووە دەیزانی چەند سەختە بەرد لە ماڵی ئەو. ئەو قسەی غولام عەلیم لە پەراوێزی نوسخەیەکی کتێبی ویلایەتنامەی وەلەد سوڵتان دا دیوە و قسەی شەمسی تەورێزییە. بۆ پشتگیری قسەکانی غولام عەلی؛ موشتاقولیقای گۆزەگەر وتی: کەوایە تۆ دەتەوێت بڵێت ئینسان دەبێت وەک کونەپەپوو، لە سووچێکدا بە تەنها عیبادەت بۆ خۆی بکات و ڕوو لە خەڵک نەکات؟ لەو لاوە نیعمەتوڵای کوفی وتی: جەنابی کتێبدار باشتر دەزانی من لە نوسخەیەکی کتێبی (کشف الاسرار زهار و التیور)دا بینیومە، کونەپەپوو وەها حیکایەتی خۆی باس دەکات، بۆیە ڕووی لە وێران و خەراپە کردووە، تا دوور بێت لە خەڵکی و دەڵێت سەلامەت لە تەنهایی و دوورەپەرێزی دایە، چۆن دەبێت کەسێک کە مەرگی لە پێش بێت، دڵ بە جیهان خۆش بکات، کە بزانێ دنیا وێرانە دڵی پێ ببەستێ و بە بریقەی فریو بخوات.

کاتێک نیعمەتوڵای کوفی ئەو قسەیەی کرد، یەکسەر بیری ئەوەم کەوتەوە ئەگەر سیمورغ بزانێت ئەم کتێبەکەی دیوە دڵی تەنگ دەبێت، خاتوون حیکایەتی ئەو کتێبە سەیرە و حیکایەتخوان وتوویەتی خۆی ڕۆژێک دێت بۆت باس دەکات.

کاتێک قسە هاتە سەر کونەپەپوو، مەلا ئەیاز وتی: حاشا حاشا کە دین ئەوەی ناوێت! مەلا خدری شارەزوری ڕەحمەتی خوای لێ بێت شیعرێکی هەیە باسی ئەوە دەکات. زۆر کۆشا بیری بکەوێتەوە، بیری نەکەوتەوە، لە ڕیزی دواوە کوڕێکی منداڵکار هەیە تازە خەریکە گوڵستان و بوستان لەبەر دەکات، گەنجێکی خوێنگەرمە و دەمارگیرە، لەوانەی کە دوو وشە دەخوێننەوە و هەڵدەچن، قسەیەکی دەرپەڕاند وتی: بۆ کوردیش شاعیری هەیە؟ وەڵا لەو قسە دەرپەڕیوە هەمووان ڕەنگیان زەرد بوو، منیش وتم بەڵێ بێگومان، بۆ ئەوەی جەوەکە هێواش بێتەوە بە دەنگێکی بەرز وتم: بەڵێ بەڵێ... دەستبەجێ ڕەمزەکەم گەیشت لەژێر ڕووناکییەکی کزا و لە تاریکییەوە درودی حاجی عەباسی خەتجوان، دەستی کرد بە وتنی شیعرەکەی نالی:

ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا، هەتا کەی حیرسی وێرانە!
لەگەڵ ئەم عەشقبازانە، بڕۆ بازانە، ئازانە!
موسوڵمان! لێرە مانی خان و مانت هەر نەمان دێنێ
پەشیمان بە کە دەرمانی نەمانت مایەی ئیمانە
بلا بۆ کوندە بوو بێ، مفتی مشک و ماری کەندو بێ
خەتیرەی گەنجی وێرانە، زەخیرەی کونجی کاشانە!

هەموو شیعرەکەی بە دەنگی نەرم و پڕەوە وت، کە قەسیدەیەکی نالییە لە باسی چواندنی نەفس بە کونەپەپوو، تێکەڵاوی خەڵکان بە باز دەچوێنێ تا قافڵە بەستن و بچنە ماڵی خودا. هەمووان بارەکەڵایان کرد و باس بوو بە باسی شیعر و غەزەلی کوردی و غەزەلی عەرەبی و فارسی. هەر کەس شیعرێکی لێ عاسی دەبوو ئەو بۆی تەواو دەکرد. دیار بوو مەلا ئەیاز و غولام عەلی پێیان ناخۆش بوو نەگەیشتوونەتە هیچ، بۆیە بە دەم باسی غەزەلەوە چوونەوە ناو بابەتەکەی خۆیان و غولام عەلی ئاوڕێکی دایەوە بۆ تاریکی و وتی: کاک درووود شیعری مەخلوقی مەحوی بەڵخییت لە بیرە، درووود غەزەلی مەخلوقی لەبەر وت:

ئەوی ئەمڕۆ بە دەوری تەختیایە هەلهەلەی مەخلوق
لە دەوری نەعشیا سبحەی دەبینی وەلوەلەی مەخلوق

به پەل پەلکردنی سبحەی ئەگەر ببوایە باوەڕیان
دەبوو قەت بەم حەدە نەبووایە بۆ دنیا پەلەی مەخلوق
بارەکەڵا و ئەحسەنت و سەرلەقاندن و دەستبەڕیشداهێنانێک بوو، غوڵام عەلی وتی: مەحوی یەکێک لە سۆفییە گەورەکان بوو، شیعری مەخلوقی بۆ بەئاگایی هێنانەوە وت، لە شەریعەتەوە چوو بووە ناو تەریقەت، لەویشەوە بۆ مەعریفەت. مەعریفەی مەحوی مەعریفەی پیاوێکە وەک جەنابتان هەم مەلایە، هەم پیر و شێخە. بۆیە دەتوانێت دنیابینیی خۆی بکات بە شیعر، درووود لە تاریکییەکەوە دوو نیوە بەیتی وتەوە:
چاوە جێی ئەو شۆخە بێ، وتم و وتی:
ئەم مەلا شێخە قسەی بێ جا دەکا!
بەو شیعرە، مەلا نجوم دەستێکی هێنا بە تەنکەڕیشەکەیدا و سەرێکی لەقاند و وتی ئەلحەق، مەلا شێخ بووە. مەلا ئەیاز تا ئەوکات بە زۆر خۆی گرتبوو، لەسەر چۆک لە خزمەتی مەلا نجومدا بوو، جبەکەی توند کردە و و وتی: بەڵام هەر ئەو مەحوی بەڵخییە، بە زمانی خۆ دەڵێت، شەریعەت و تەریقەت بە یەکەوە نایان کرێت. ئەوە نییە لە شیعری نووری بادەدا چی دەهێنێتەوە!
ئیتر وای لێهاتبوو نەیان دەوێرا بەیت و نیوەبەیتەکان بڵێن، دەیانزانی درووود هەمووی لەبەرە، دەوەستان و کۆکەیەکیان دەکرد، یان دەوەستان و دەستێکیان بە ئاسۆیی ڕادەگرت، وەک ئەوەی بڵێن، وەک چۆن شاعیر دەڵێت: وە شاعیر دەست بکات بە وتن. لەوێدا درووود دوو بەیتەکەی وت:
لەگەڵ دەستی مەلا ڕێ ناکەوێ زوننارى زوڵفی یار
وەکو شێخ ئیختیاری مەزهەبی تەرسا نەکەم چ بکەم؟
مەلا ئەیاز سەری دەلەقاند و تەماشای بازنەی پیاوانی دەکرد، تا بڵێ قسەکەم ڕاستە، ئەوکات موشتاقولیقای گۆزەگەر کە باش ئەو شیعرە دەردی ئەمی نیشان دابوو، وتی: ئاخر جەنابی مەلا ئەیاز، چ حیکایەتێکدا مەلایەکت دیوە عاشق بووبێت؟ ئەوە شێخن عاشق دەبن و سڵ ناکەن لەوەی چییان لێ دێت، ئێوە پەیڕەوکەرانی یاسان، بەڵام شێخان یاساکان دەکەنە حەڵوا و دەیخۆن! ئەم قسەیەی ئاخری بە جووڵەیەکی دەستەوە کرد، مەجلیس دایانە هاڕەی پێکەنین و کۆڕوکۆبوونەوە تەواو بوو.
ئەوڕۆژە درووود زۆرترین شیعری وتەوە، وابزانم حاڵی باش نەبوو، ئیتر ڕۆژانی تر خەریکی خەتخۆشی و نوسخەگرتنەوە بوو.
لەو جۆرە مەجلیسانەمان زۆرن. لە کتێبخانە باس باسی نوور و زوڵمەت، کوفر و ئیمان، ئەزەل و ئەبەد، شەیتان و ڕەحمانە، ئەوانەی کە بە جەبری حیکایەت نەبێت هەرگیز تێکەڵ نابن. لە حیکایەتدا نەبێت، کوا پیاوێک دەتوانێت پیاوێکی تر ببینێت کە حەوت قەرن پێش ئەوە ژیاوە؟ کوا شیرین دەتوانێ لەیلی بناسێت؟ لە ئەفغانستانەوە بێتە کوردستان؟ کەی شتی وا هەس ئەگەر حیکایەت نەبێت؟ بەڵام لە حیکایەتەکاندا چ عیرفانی و چ ئەویندارى زۆر کەس بە یەک دەگەن. هەندێک لەو حیکایەتانە نانووسرێنەوە، چونکە زەمەن دەیەوێت ئەوە فەرامۆش کات. بە تایبەت حیکایەتی کوردی. دەزانی زۆر شت هەیە من تەنها بیستوومە و قەت نەبووە بە کتێب؟ بۆیە دڵم بەوە کرایەوە کە تۆ دەست دەکەیت بە نووسینی

حکیایەتێکی کوردی و هیچ نەبێت دوای نوسخەیەک دەدەت بە خانەی کتێبەکەمان و ئێمەیش دادەنیشین و نیقاشی لەسەر دەکەین. ئەگەر ئێمە خەیاڵی تۆین، تۆ بماننووسەرەوە و ئەو حیکایەتانەش هەن، بەڵام لە کتێبدا نابینرێن باس بکە.

زۆر کتێبم لایە لەسەر حەقایەتی سەمەرەی دنیا، لە چینەوە تا هیند و عەرەب و فارس و تورک و ئاشوور و کلدان و سۆمەری، تەنانەت ڕۆمیان و فەرەنگیش، بەڵام زۆر کەمن ئەو کتێبانەی حیکایەتی کوردی بن. ئەوەش هیی ئەوەیە، کتێبە مێژووییەکان و دەستنووسی گەڕیدەکان باسی ئەوە دەکەن وڵاتی کوردان بۆتە چوار بەش و هەر بەشەی لەژێر چەپۆکی شوێنێکدایە. بۆیە ئەگەر ئەوە بۆ سوڵتە بێت، بۆ حەقایەتیش ڕاستە. جوانترین حەقایەتم دیتبێت لەسەر وڵاتی کوردان دەستخەتێکی ئەولیا چەلەبییە. یان حیکایەتی جوامێری خانی لەپ زێڕین لە قەڵای دمدم، بەڵام هێشتا کەمن ئەو حیکایەتانە. ئێمە ئەگەر خەیاڵی تۆین مەیەڵە مەعف بینەوە، جگەرەمان بەلاوە بکێشە و بماننووسەوە، ئێمە خۆمان دەگێڕینەوە، تۆیش بماننووسەوە.

خاتوون، ئەگەر نووسیتەوە، حیکایەتێک هەیە بیرت نەچێت باسی بکەیت، حیکایەتی مەم و زین، جوانترین حیکایەتی کوردی کەس ناوێرێت بڵێ هیی منە، کورد نەبێت. من دەمارگیر نیم، بەڵام قەستی تۆ دەزانم و دەمەوێت حیکایەتەکەت کوردییانە بێت. بە پێی حاڵ بتوانم شەوێکی تریش دێمەوە و زۆر شتت بۆ باس دەکەم لەو حیکایەتە کوردیانەی بیستوومە و بەڵام فەرامۆش کراون یان ئیتر باس ناکرێن. پێش تۆ، ماە شەرەفخانی ئەبولحەسەن بەگ ناسراو بە مەستوورەی کوردستانی، حیکایەتی خۆی گێڕایەوە، نەجیبە بانووی کچی مەلا محەمەدی حاجی مەلا عەبدوڵای ناسراو بە مەلا گەورەی کۆیە، ئەو ژنەی بۆ یەکەمجار لەناو حوجرەی پیاواندا بە تاقی تەنێ دەخوێنێ، دەست دەکات بە نووسینەوەی حیکایەتەکانی کۆی سنجاق، ئەو ژنەی لە ڕووبابەی شیرینی تۆ دەچێت. تۆیش دانیشە و حیکایەتی خۆت بنووسەوە، خودا و کتێبت لە پشتە، بنووسە و تا بەری بەیان پێنووست دامەنێ، شەهرەزاد بانوو!

ئەگەر ویستت ئەو حیکایەتە بگێڕیتەوە، من نەخشەی شارت بۆ دەکێشم تا لە بەردەستت بێت، یان بە پێی حاڵ بۆت باس دەکەم.

ڕۆژێک لەگەڵ دەروێش مینەی مسگەر، لەبان پردەگاور پیاسەمان دەکرد و  قسان لە باسی کتێبەوە بوو بە حیکایەت، ئەو وتی نازانم کتێبان چی دەڵێن، بەڵام من حیکایەتی زۆرم لایە، ئەگەر بە قسەی تۆ بێت سنگی من سیپارەی نووسراوە. منیش پێکەنیم و وتم دەروێش مینە بۆ ئەتەوێ بڵێی وا نییە، دە بیەڵە حیکایەتێکت بخوێنمەوە. دەروێش مینەی مسگەریش وتی: هەی هوو چی هەیە و ئێمە نایزانین؟ وتی تۆ حەکایەتی شێخی ولیانیت بیستووە؟ منیش وتم دەزانم شێخ ئیسماعیلی ولیانی هەیە، بەڵام حەقایەتەکەیم نەبیستووە، وتی پیاوی خودا بووە، دەڵێن وەلی زەمانەی خۆی بووە. ئەو لە ڕابەرانی سیلسیلەی ڕێبازی تەریقەتەکەمانە. دەگێڕنەوە وەختی خۆی، دەروێشێکی جل شڕۆڵی و کەوش دڕاوی کەشکۆڵ لە شان و عەسا لەدەست، کە ڕیش و قژی تێکەڵ بووە و خۆڵ ڕەنگی بزر کرووە، دەگاتە جوانڕۆ، لەوێ لە کانییەک لا دەدا دەبینێت، دەستەی کچان دانیشتوون بە تریقوورِ قسە دەکەن و شت دەشۆن و ناز دەکەن. دەروێشە ماندوو و کەلەلا، دەڵێت خێرتان دەگات کاسەیەک ئاوم بەنێ، کچان دەیکەنە گاڵە و مەزاق، بە جوانترین کچی دەستەکەیان دەڵێن، خاتوونێ بە کاسەکەی تۆ ئاوی بدەینێ؟ کچەش کە کچی میرە و جوانی جوانانە بە تروتوێپێکەوە دەڵێت: بە جامی من ئەو شڕۆڵەیە ئاو بخواتەوە! حاشا نەوەڵا. دەروێش کە ئەوە دەشنەوێت، دەڵێت، مادەم ئەوەندە لە خۆت ڕازیت، خوا یاربێت دەبێتە

خێزانی من!  کچان دەدەنە هارەی پێکەنین، دەڵێن دەرویش ئەوە کچی میرە و مارەکراوە سبەی بە بووکی دەبرێت. دەرویش دەڵێت: من قسەی خۆمم کرد. دەرویش بە زاری وشکەوە بەرەو ئاوایی دەڕوا، بە بەردەم ماڵی میردا تێدەپەڕێ و میر دەڵێت ئەمە غەریبە کێیە، وەها لەبەر دڵانمەوە. تا یەکێک بانگ دەکات بچن خولقی بکەن دەرویشە ون دەبێت.
شەو دادێت و مەجلیسی پیاوان گەرم و باسی کچان خۆش، لە مەجلیس پیاوان باسی نسیب دەکرێت، زاوای میر کە برازای خۆیەتی، دەڵێت ئەو ئێوە باسی چی دەکەن نسیبی چی، هەموو شت بە دەست ئینسان خۆیەتی، من ئێستە ئەم پارووە نانە دەخەمە دەمم کێ هەیە نەیەڵێت. وەها ئێژێت و دەست دەبات بۆ پارووە نانێک هەڵیدەگرێت و لە مەجلیس دەیگرێت دەڵێت سێ بە سێ تەلاقم کەوتبێت ئەم پارووە نانە دەخۆم، وا دەڵێت و پارووەی لە دەست گل دەبێتەوە و تل دەخوات تا دەکەوێتە بەردەم پشیلەیەک و دەیماشێتەوە. مەجلیس هەموو بێدەنگ دەبن. نۆکەران و غوڵامان خەبەر بۆ میر دەبەن و شتەکەی بۆ باس دەکەن، ئەویش دەڵێت پەنا بە خوا لە کەری ئەم زاوایەی من، مادەم هێندە گێلە، ئەوە تەلاقی کەوت و کچەکەم ئەیەم بەو دەرویشە شرەی ئەم شەو لەو دەبەنگە باشترە. میر دەنێرێت بە شوێن مەلادا و دەرویشە دەدۆزنەوە و میرزادەی لێ مارە دەکەن. بۆ ڕۆژی دواتر، دەرویش دەچێتە لای میر و خەنجەرێکی مشتوو ویسر لە کێلان دەردێنێت و لەبەردەم میر دایدەنێت، دەڵێت من ناوم دەرویش ئیسماعیلە، با ئەم خەنجەرەتان لابێت، کەی کچەکەتان حەزی کرد بەو خەنجەرە بگەڕێن دەمدۆزنەوە، ئەوسا هەڵدەستێت و جوانڕۆ جێ دێڵێت. پاش ماوەیەک کچە دەڵێت بابە دڵم بۆ مێردی خۆم لی دەدات ئەوە نسیبی منە با بچین بیدۆزینەوە. باوکەش دەڵێت: بەو خەنجەرەیا ئەوە پیاوچاکە یان میرە خۆی لێ گۆڕیون، هەستن لەگەڵ کات و چەند دەست و پێوەندێکت بکەونە ڕێ و بە جیهازییەوە بڕۆن تا دەیدۆزنەوە. بارگەوبنە دەپێچنەوە و بە پرسیار دەڵێن ئەو دەرویشەی باسی دەکەن لە خانەقین و ئەو ناوەیە، دەکەونە ڕێ، لە ڕێ کورەی گەورە خەنجەرێکی ناوازەی دەبێت لێی دەکەوێت، زۆر خەمبار دەبێت بۆی، دەڕۆن تا پرسیار دەکەن ماڵی دەرویش ئیسماعیل لە کوێیە، خەنجەرەکە نیشانی سەرقافڵەیەک دەدەن. ئەویش دەڵێت: دەرویشی چی ئەوە شێخ ئیسماعیلی ولیانییە و ئەولیای زەمانە، زوو زوو خۆی دەکات بە دەرویش و دەچێت شارەوشار دەگەڕێت. وەرن بتانبەم. کاتێ دەچن دەبینن سەرای گەورە و تەکیە ماڵی هوراوە. دەچنە خزمەتی کوڕە ماتە، دەڵێت بۆ ماتی ئەویش دەڵێت قوربان: خەستەی ڕێم، شێخە دەست بەژێر بەرماڵەکەیدا دەکات، خەنجەرەکەی بۆ دەردێنێ، ئیتر دەبنە موریدی و کچە دەبێتە خێزانی.
ئەم حەقایەتە تۆ بینووسەوە خاتوون، ئەگەر توانیم شەوێکی تریش دێمەوە!

# شەوی بیست و یەک

بە ناوی دروستکەر و بەس. جەنابی شەهرەزاد، خۆمت بە یاد دێنمەوە، میرزا ئادەمی حیکایەتخوانم. حیکایەتخوانی ڕاستەقینەی مەملەکەتی قەلەندەران. ئەمشەو چی بە زەینمدا ختورەی کرد، چی بە دەردی سووچێکی حیکایەتە گەورەکەت بێت بۆت باسەکەم. خەمی من نووسینەوەی حیکایەتە مەزنەکەتە، نەک چاپبوونەوەت، دێر یان زوو ڕۆژێک دێت، هەموو شتت بیر دەکەوێتەوە. زەمەنێک دێت فەرامۆشی فەرامۆش دەبێت، بەڵام ئەگەر پەلە نەکەین لەوەیە حیکایەتەکە نەیەت، ئەگەر ڕەنگی بۆ نەڕێژین ناتوانی حەوت قاتی دێو و درنج و بنیام و پەری لەسەر یەک هەڵچنی. مەراقی من، مەراقی گێڕانەوەی خەلقکردنەکەتە و تۆ وەیادت نایەتەوە، ئەرکی منە بیرت بخەمەوە. سەبەبەی خەلقی قەلەندەرخانەکەتت بۆ باس بکەن، تا ئەگەر من شتێکم لە دەستهات و حیکایەتەکەتم نەقڵ کرد، نەڵێن قسەی پڕوپووچە، چونکە شەهرەزاد هیچی وەبیر نایەت. تکایە با بیرت بێتەوە، دەبێت حیکایەتەکە بگێڕیتەوە، ناشێت هەروا دەستبەردار بیت، ناکرێت بێ باک لە بان دۆشەک دانیشیت و زار نەکەیتەوە، لەناو پێخەفەوە چاو بڕیتە خوار و متەق نەکەیت.

بیرت دێنمەوە، حەوت ساڵ لەمەوبەر، لە شەوێکی وشک و ساردی پاییز، لەبەر ئاگردانێک هەڵکورمابووی. ڕەنجاو، ماندوو، ترساو، بێهودە، گریاو، خەمبار، تەنها، بریندار، دەتویست مەتەڵۆک بگێڕیتەوە، بەڵام گوێگر و حیکایەتدۆستێک وجودی نەبوو. دەتزانی حیکایەت کاتێک حیکایەتە، گوێگری هەبێت. دەتویست بیگێڕیتەوە بۆ ترساوی، بۆ ماندوویت، بۆ حەوت شەوی ڕەبەقە خەو نەچۆتە چاوت، بۆ سێ ڕۆژی تەواوە ئەستوورکی ڕەق و چایی نەبێت زا نەچۆتە دەمت. بەڵام تۆ تەنها بوویت، ڕۆحت لێ ڕۆیشتبوو، سەرمات بوو، لە حەژمەت ئازار و زام دانەچۆقەت بوو، گینگڵت دەدا. ئەو شەوە سەردە، چاوت لە ئاگرەکە بڕی بوو، فرمێسک لە چاوانتدا قەتیس مابوو. هەر ئەو کاتە گوێت لە نێڵەی ئاگرەکە بوو، وەک مۆسیقا ڕۆحت پێی هاتە جۆش، فرمێسکت زۆرتر و فرەتربوو، خۆڵانی دەوری ئاگر بووە قوڕ، هەر لەو قوڕە من خەڵق بووم. لەبەردەمت بە چوار مشقی بە مێزەر و جل و جۆڵەوە قووت بوومەوە، تۆ یەکەم قسە وتت، حیکایەتم بۆ بگێڕەوە.

من وتم قوربان: ئەز هیچ پێنازانم، تۆ نائومێد بوویت، وتت: من فێرت دەکەم.

ئەو شەوە تا سپێدە لەلای ئاگرەکە بەرامبەرت لەسەر چۆک دانیشتبووم، تۆ ناوی خۆت، ناوی خۆم و ناوی زۆر شتت فێر کردم، ئەو شەوە فێرت کردم تەنها کاتێک حیکایەت بگێڕمەوە، کە گوێگرێک هەبێت، ئەگەر نەبوو، غەڵەتی وانەکەم بگێڕمەوە، چونکە بەوە خەنجەر لە موقەدەسی حیکایەت دەدەم. ئەو شەوە وتت خەیاڵ بکە و بگێڕەوە، یەک شت هەیە دەیەڵێت زیندوو بیت، یەک شت، ئەویش گێڕانەوەیە، کەی نەتتوانی بگێڕیتەوە ئەوە مردوویت، ئەوە تۆ ونیت. ئەو عانە

بە دەم تاریکی و بێتاقەتی خۆتەوە تەجروبەی حیکایەتت فێر کردم، ئەو شەوە من چاییەکم بە دەستی تۆ خواردەوە، دەمویست ئەو شەوە کۆتایی نەیەت، بەڵام سبەینان، وتت بچۆ بۆ شاری قەلەندەران، ئاوەدانی بکەوە، شارێکی کۆن و چۆڵکراوە، چونکە کەس نەبووە بیگێڕێتەوە، ئەو مەملەکەتە تاکە حیکایەتخوانێکیشیان نەبووە، بۆیە وەک جادوو وەک تەلیسم کەس لەو شارە نییە، ئەو شارە هەموو شتی تێدایە، بە مردوو و گۆڕستانیشەوە، بەڵام خاڵییە لە ئادەم و ئادەمیزاد. برۆ یەکەم حیکایەت، تۆ بیگێڕەوە. ئەودەم بەو سەبای سالّحانە بەو سەرمایە، قەڵەمێک و کاغەزێکت دایە دەستم، مشتێ وشە و خەیاڵت پێدام وتت: برۆ میرزا ئادەمی حیکایەتخوان، برۆ، بەڵام ڕۆژێک کە منت دی حیکایەتێکم بۆ وەگێڕە، تا بزانم بە دروستکردنت کارێکی خراپم ئەنجام نەداوە. منیش وتم: بڵندپایە هەموو هەوڵێکم ئەخەمە کار.

ئەو بەیانییە گەیشتمە مەملەکەتی قەلەندەران، نا، لە ڕاستیدا چاوم کردەوە لە ناوەڕاستی مەملەکەت بووم. سامێکی هەبوو، مەملەکەتێکی مات و خامۆش، کزەبایەک خۆڵی ڕێی و بانی دێنا و دەیدا بە دەموچاومدا، بۆنی تۆز لە شارەکە دەهات، یەکسەر تۆم بیر دەهاتەوە، تۆز، حیکایەتی خۆی هەیە بۆت دەگێڕمەوە. دەترسام و شەرمم ئەکرد کە تۆ ئێستە دەمبینی من دەترسم، گەڕام بەناو مەملەکەتدا، یەکەم شوێن کەوتە پێشچاوم، خانەی حیکایەت بوو، دەرگایەکی زۆر گەورەی دارینی ئەڵقەڕیز بە داری گوێز، لەسەر دەرگاکەی وێنەی هەڵکەندراوی پیاوێکی میانەساڵی ڕیش درێژ، مێزەرێکی هێندی بە سەرەوەیە، کراسێکی شۆڕ و کەوایەک بەسەریدا، مێزێکی نزم لەبەر دەستێتی، ڕیزێک کتێبی لەسەر هەڵچنراوە، لەولاش مرەکەبدانێک و کاغەزێک، کابرا بۆ دوور دەڕوانێ. لە خوار ئەویشەوە بە دەیان بەشەر و جن و پەری و مەل و پەڕەندە و ئاژەڵان بڵاو بوونەتەوە، هەتا بەرەو خواری دەرگە بڕوانی کاڵ و کاڵتر دەبنەوە، تا ئەوەی لە داوێنی دەرگاکە دەبینێت نەخشتی دەرگاکە وەک چینێک خۆڵ تەنها کونج کونجە. بەوەش دەوتراوە لە سەرەتاوە ئێوە خۆڵ بوون و بوون بە بەشەر. لە سەروو دەرگا نووسراوە خانەی حیکایەت، بە ڕەسمی مەردان سێ جار لە دەرکەم دا و ئەڵقەم ڕاکێشا، چی دەبینم؛ ماڵ و سەرایەکی هوراو و فراوان، باخێکی جەنەت ئاسا، لە چەقی باخە سەرایەکی گەورە نە بە کۆشک دەچێت نە بە ماڵ نە بە کاروانسەرا، هەر بە حیکایەتخانە دەچێت. حەوت گومەزی هەیە، دانەیەکی گەورەی فیرۆزەیی و شەشی خاکی بە دەوری. ئەویش دەرگایەکی دارینی شینی هەیە، لە ناوەوە دەستەچەپ تاق و سەرای خۆی هەیە، دەستەڕاست جێیەکە پێی دەوترێ هەزار تاق. بەو جۆرە دەستم کرد بە گەڕان بە خانەی حیکایەتدا. ئاگری کورەم داگیرساند، بەو جۆرە بەناو مەملەکەتدا گەڕام. دەبینم بە ناوەڕاستی مەملەکەتدا ئاوێک دەڕوات، پردێکی خشتینی لەسەرە، سێ تاقی هەیە و لەمسەر و سەری خانێک و عەتتارییەک هەن. لەناو شار، مزگەوتێکی گەورە هەیە و لێی نووسراوە مزگەوتی ئیمام. چەندان مزگەوتی دیکەی بچووک دەبینرێن. کۆڵان و کوچەی زۆرن و هەریەکەیان ناوێکی لەسەرە، لە کاتی خۆیدا دێمە سەریان. گەرماوێکی گەورە و دووانی بچووکی لێیە. هەر لە مەملەکەت سێ تەکیە و خانەقای تێدایە، یەکێکیان لەوانی تر گەورەترە و بە خەتی کوفی لەسەری نووسراوە تەکیەی گەیلانی. لە بەشی سەرووی مەملەکەت کۆشک و تەلارێکی سەرسوڕهێن هەیە، کە بە شوورەیەکی بچووک دەورە دراوە، نووسراوە ماڵی پاشا، لە شوورەکە دەترازێت چی دەبینیت، نە باغی ئیرەمی بۆتان و ئیرەمی شیراز نە مەغۆلباغی کشیمر نە باغی بابر شاهـ لە کابل وەها نین، لە ناوەوە سێ دەستە کۆشکە و هەریەکەیان حەوزی فیرۆزیی و فوارەی تایبەتیان هەیە، حەوزی یەکەم لاکێشەیی درێژە و حەفتا فوارەی بچووکی ئاوهەڵدەری هەن، حەزی دووەم یەک فوارەی گەورە و چلی بچووک، حەوزی سێیەم سێ فوارەی گەورە

و له دەوری هەر یەک لەو سیانە حەوتی بچووک هەن. لەو باغە هەزار بولبوولی شەیدا دەخوێنن و قورمی دەگرینەن. مەملەکەتی قەلەندەران گەورەیە، بە کوچەکانیدا دەڕۆم بۆنی خۆڵ دەکەم، وەختێکم زانی وا دنیا خەریکە تاریک دەبێت، بۆیە بە پەلەپەل خۆم گەیاندەوە خانەی حیکایەت. بۆ ڕۆژی دووەم دیسانەوە دەستم بە گەڕان کرد، ڕێم کەوتە شارێیەک، دەبینم دەرگایەکی دارینی سووروامی گەورەی ئەڵقەڕێز دیارە، چاوم دەچێتە سەری نووسراوە شیفاخانە. وەک ڕەسمی مەردان دەدەم لە دەرگا و چاوەڕێی جواب ناکەم سەر دەکەم بە ژوورا، بەڵام دەنگێک لە ناوەوە دێت دەڵێت:

تەشریف بێنن، منیش سڵەمیمەوە، دەبینم پیاوێکی کامڵی ڕیش سپی باڵا ناوەندی نوورین، لە دەستێ جبەی زەردوام و عەبایەکی پیرۆزەیی گوڵقولاپی زەرییدا، بە مێزەریکی حەوت پێچی سووورباو، بە کەوشێکی چەرمینی قاوەییەوە، هاتە بەردەمم. سەلام و دەستومۆچمان کرد، وتی: بەندە ئیبن حاتەمی مەغریبیم، تەبیب باشی شاری قەلەندەرانم. ئەودەم زانیم خەریکە مەملەکەتەکەت ئاوەدان دەکەیتەوە، منیش خۆمم ناساند وتم: ئادەمم، ئەویش وتی میرزا ئادەمی حیکایەتخوان باش بوو بە خزمەتت موشەرەف بووم. ئەو تەبیب و حەکیمی مەملەکەتە، پیاوێکی کامڵ و دانا و بە ویقار، تەبیبی حاڵزان، لوقمانی دەردان هەر خۆیەتی و بەس. ئیدی کەوتینە قسە لە بارەی شیفاخانەوە و ئەو وتی، وەختی خۆی عاقڵ بووە ئەوەی شیفاخانەی ناو ناوە، دەیوت من لە جێی تر بووم بە شیفاخانەیان وتووە خەستەخانە، ئەمەش ڕۆحی بێماران خراپ ئەکات، چونکە هەست دەکەم خەستەن، بەڵام شیفاخانە پێیان دەڵێت هەر هاتیتە ئێرە شیفا دەدرێت. بە دەم قسەوە تاقێکی ڕۆژمان برد، جا من وتم دەبێت بە شارا بگەڕێم، ئەویش بووە هاوەڵم. دەگەڕاین و دیتمان لە شار زۆر ماڵ ئاگری تێدایە و دووکەڵ لە دووڵەکێشانەوە دێت و بۆن و بەرامە خەریکە بە شێنەیی بۆنی خۆڵی مەملەکەت کەم دەکەنەوە. هەر ئەو ڕۆژە چووینە خانەی کتێب و لەوێ دوڕ محەممەدی کتێبدارمان دیت. ئەو خاوەنی کتێبەگەلێکە کە لە هیچ مەملەکەتێکی دنیادا شتی وا نییە. لەگەڵ ئەو کەوتینە قسە و باس و پیاوێکی عاقڵ و دانایە بەشەر لە هاوکوفی ئەو تێر نابێت. ئیدی بە مەملەکەتدا گەڕاین تا دنیا تاریک داهات، لە زۆر کوچە و کۆڵانی مەملەکەت چرا پێکرا بوو، ڕووناکی هەڵکرابوو.

بەو شێوەیە خەریکی گەڕان بووم و خەڵکەکەیم ناسی، مزگەوت و تەکیە و کاروانسەرا و خان و کۆشک و تەلار و سەرا و بازاڕم دەدی. لە مەملەکەت بازاڕێکی فرە گەورەی هەیە، بەرەو باشووری ناوەندی شار کەوتووە. بازاڕە سەرا و گوزەر و قەیسەرییەکەیە، میسالی هونەری ئیسلامی و عوسمانییە. گوزەر لەنێو گوزەر، قوبە لەنێو قوبە و گومەزی خشتینی هەزار توێیە. لە ناوەوە بازاڕی فەرش و ئۆرتە و ڕاخەر و پەڕە و سەجادەی وەهای لێیە مەگەر هەر لە حیکایەتی دێرینەدا بووبێت. فەرشی ئاوریشمینی گوڵێنگەدار، مافووری چینی، فەرشی دەستچنی سنەیی و قالیچەی کرماشانی. گوزەری مسگران و گوزەری سەڕاجەکان جودان. گوزەری خشڵ و کەرەسەی ژنانیش جودا، خشڵی وەهای هەیە، قابیل بە جەنابی خۆت خاتوو شەهرەزاد، لەبەر ئەوەی زۆرینە کوردن، پڕە لە کەمەرە و هەیاسە و قوبە و گەردنلەغی زیوین و دوگمە و دۆڵاب و خڕخاڵ و پاوانە و خەزێم و گوشوارە و چەچەوانە و ئەڵقە و ئەموستیلە. باشترین چەشکوشکارییەکان، هیی جووەکانە و ناوازەترین خشڵەکان زیوکاری قوبەداری دەستی وانە. دوکانی قوماشی ژنان لە هەرە نایابترین پارچەکانی عالەمی لێیە بۆ کراس و ئاوەڵکراس و کەوێ و سەڵتە و ئێلەک و دەسماڵ، کۆڵوانە، سەروبەست. لە قوماشی هیندیەوە بیگرە تا دەستکردی کشمیر، چین و ماچین و یەمەن و ئەفغان و ئێران و بەغداوە. کوردەکانی ئێرە حەز بە گروونی،

قەنەوز، ئاگرباران، کەتان، قەیفەی شەوهەڵوەر، جورجێت قیفە، مەخمەڵی هیندی، کرێبی ئاوێنەچنی ئەفغانی دەکەن. ژنانی ئێرانی و عەرەب و فارسی و تورک و ئازەریش، بۆ دامەنە چیندار و فوستانە شۆڕ و کەمەرباریک و دەرپێکانیان ئاوریشم و مەخمەڵ بەکار دێنن. بازاڕ پڕە لە قوماشی پیاوان لە دوکانی کڵاش و پەستەک و کوڵەباڵ و فەرەنجی و پوزەوانە، قوماشی کەواو و سەڵتە و کەوای شاهانە و جلی ستارخانی و قاتی بە چەکمەی ئازەری. چت بوێ بۆ ژن و پیاوانی هەر شارێکی ئەم شەرق زەمینە بێت دەست دەکەفێت. شتێک نییە لە شار دست بەشەر نەکەوێت و لێی نائومید بێت خۆ ئەگەر ویستی ئەوکات دێنە لام و من تکایان بە تۆ دەگەیەنم، تا لە عەتیقەخانە بەشیان بدەیت.
بەو ڕەنگە ڕۆژانە لە ویلایەتدا دەگەڕام. تا ئەوەی ڕۆژی حەوتەم چوومە کێوە سوور، لەوێوە تەماشای مەملەکەتم کرد چ سەیر بوو، هەڵبەت بێ لە من کەس لەوێوەوە شاری نەدیوە، لەوێ قسەم لەگەڵ سیمورغ کرد و ناسیم، مەلێکی کامڵە و دڵنیام بەو ڕەنگ و پەڕەوە حیکایەتی زۆرت بۆ بەرهەم دێنێ. کاتێک گەڕامەوە بۆ شار دەوری غروب بوو، لەسەر شوورەی یەکەمەوە ڕوانیم، شار گەورەیە ڕەنگە هەزار ماڵی تێدا بێت، کاروانسەرا و گەرماو و مزگەوت و حوجرە و شیفاخانە و تەکیە و خانەی کتێب و مەیخانە و خانەی حیکایەت و ماڵی پاشا و پرد و باغ و چەمەن و لالەزاری هەیە، مەملەکەت جمەی دێت لە بەشەر، هەمووان دەجووڵێن، شار لە ڕەنگی خاکییەوە دەبێتە ڕەنگی زەرد و سوور و شین و مۆر و سەوز، خەڵکەکە هەر یەکە و بە بەرگ و پۆشاکی ئەفسانەیی مەملەکەتی خۆیانەوە لێرەن. کەس شەرم ناکات لەوەی کە هەیە، کەس شانازی ناکات بەوەی لەوی تر گەورەترە یان دێرینترە. خەڵک یەک دەناسن و هەر کەسە و شوێنی خۆی دۆزیوەتەوە، کەس جەنگ لەسەر هیچ شتێک ناکات. ئاوها لەو سەرەوە شارم دی. ئەوجا شۆڕ بوومەوە بۆ ناو ئەم هەموو بەشەرە، پڕە لە مەخلوقی ورد و درشت، لاو و جەوان و پیر و ئیختیار. لە خەڵکی هیند و چین و بەغدا و شام و ئێرانزەمینەوە تێیدایە تا پاکستان و ئەفغانستان و تورکمەنستان و ئازەربایجان. هەر کەسە و بە بەرگی خۆیەوە دێت و دەچێت، مەملەکەتەکە زیاتر لە مینیاتۆری نەقاشێکی تەڕدەست دەچێ، ئەو ئێوارەیە پڕ خولیا بووم بۆ گێڕانەوە، وا بزانم لە دوای ئەو حەوت ڕۆژە دەست کرا بە حیکایەت، ڕۆژی هەشتەم لە ناوەندی شار دارۆغە لەگەڵ دوو پاسەوان دایان لە تەپڵ و خەڵکیان کۆکردەوە، کە ئێرە مەملەکەتی قەلەندەران، شاری چاوەڕوانییە بۆ چوونە ناو حیکایەتەوە، لێرە هەموو خواردن و خورادنەوەیەک هەیە، مەملەکەت خۆی بەخێوتان دەکات، کێیش حەز دەکات بۆ بێتاقەتی خۆی ئیش و کارێک وەئەستۆ گرێ، شار شامی شەریفە، کەس بۆی نییە ئاژاوەگێڕ بێت، کەس بۆی نییە لە شار بچێتە دەر، مەگەر بە ئیزنی خاتوون.
لەو ڕۆژەوە خەڵکی تێگەیشتن چ باسە. هەر لەو ڕۆژەشەوە من بوومە وەڵامگۆی خەڵکانی مەملەکەت، چونکە من یەکەم خولقێنراو بووم، بێ گومان یەکەم حیکایەتیش هەر من دەیزانم! من دەزانم چی ڕوویدا، پێش ئەوەی بێنە ئێرە، هەمووان لێیان دەپرسیم، خاتوون چۆنە؟ ڕەنگی کافوری چینە؟ زوڵفی پێچ و خەمدارە یان خاوە وەک خەیاڵی جحێڵان؟ دەیانوت بۆمان باس کە، لێو مەرجان و چاو مەخمورە؟ یان چاوباز و کراوەیە؟ دەیانوت پێمان بێژە نەشمیلە یا قەد عەرعەر؟ دەیانوت لە کێ بووە؟ کێی لێ بووە؟ هاوەڵی ئەو کێیە و لەگەڵ کێ دەردە دڵی خۆی دەکات؟ دەیانوت وەک شازادەی کۆشکان چاوەنواڕی شاسواری سوڵتانییە؟ یان شازادەیەکی مێردڕۆیشتووە و لە دەستێک پۆشاکی ڕەشدا شین دەگێڕێ؟ خاتوون هەزار پرسیاریان دەکرد، من هەرگیز هیچم لە بارەی تۆوە بۆ باس نەکردن، تەنها وتم: مەزنە،

میهرەبانە، تەنهایە!
کاتێک پرسیاری دروستبوونیان لێ کردم، منیش وەک ئەوەی هەیە بۆم باسکردن، بەڵام ئەوان باوەڕیان نەکرد و بیریان چوویەوە، ئیدی ساڵانێکە کەس نایەوێت حیکایەتی ئەفراندن باس بکرێت. جارێک لەگەڵ مەلایان باسی ئەوەمان کرد، ئەو جارە مەلای نجومی دەربەند فەقەرە لەگەڵ مەلا فەیزی شوشتەری و مەلا کەریمی کەندوڵەیی و مەلا عەبدوڵای جامەڕێزی لە حەوشی مزگەوت باسی حیکایەتی خەلقمان ئەکرد، مەلایان دەیانگوت، یەکەم حیکایەت خودا خۆی بۆ ئادەمی باس کردووە، دەیانگوت، خودا یەکەم حکایەتخوانە. وەلێ من دەموت نا، ئەوەتا من لێرە یەکەم حیکایەت دەزانم، بەڵام کەس بڕوام پێ ناکات، وەختی خۆی کاتێک خودا ئادەمی دروستکرد، یەکەم حیکایەت گێڕایەوە، بۆ حەوابوو، باسی تەنهایی و بێ ئوقرەیی خۆی و پێشتریش باسی ئەوەی یەکەمجار چۆن هەستا، خودا و فریشتانی دی، ئیبلیسی دی کە سوجدەی بۆ نەبرد. کاتێکیش منداڵیان بوو، ئیتر حەوا بە چێژ و تامەوە حیکایەتی دروستبوون و لە بەهەشت دەرکردنیانی بۆ منداڵەکان نقڵ دەکرد، بەو جۆرەش حیکایەتخوانی کەوتە دەست ژنان، بەڵام ئیدی وردە وردە خەڵکان باوەڕیان بەو حیکایەتانە نەدەما. ڕۆژگار هات و ڕۆی تا ئەوەی خودا هات و خۆی دەبووە حیکایەتخوان و حیکایەتی نەوەکانی ئادەمی ڕاست دەکردەوە. مەلایان دەیانگوت چیرۆکەکە وەها نییە، خودا خۆی لە چەندان کتێبدا حیکایەتی گێڕاوەتەوە، پێش ئەو کتێبانەش هەر خۆی حیکایەتی دروستبوونی بۆ ئادەم باس کردووە. بەڵام خاتوون هەرچۆن بێت، یەک شت گرنگە، یەکەم حیکایەت من گێڕامەوە نەک تۆ، من بۆم باسکردن چۆن دروست بووم و چۆن یەکەم بەشەری ویلایەت بووم، ئەز چ بێژم کە دەبێت تۆ ئەم حیکایەتە بگێڕتەوە و ڕەوایی بدەی بە حیکایەتی من، وەگەرنا مایەپووچ دەبم!

# شەوی بیست و دوو

ئەی بەخشەری گوناه و هەڵە بە ناوی تۆ!
حەوت دەستەخوشکین، حەوت شەو حیکایەتی سەیروسەمەری کچان و ئەڤین و خۆشەویستیت بۆ باس دەکەین. بە دەم پێکەنین و قریوەی کچانەوە شەوانی خۆمان دەگوزەرێنین. بە زەحمەت ڕێکەوتن ئێمەیش بێینە ئێرە، بەڵام دوایی ڕەزامەندیان دا و هێشتیان. خۆم دەناسێنم، ها کچان ئێوەیش بمناسن، ئەمن ناوم ماهپەیکەرە. حەزم لێ نییە خۆم خەمبار بکەم و حیکایەتی خۆم وەک مەلا شێخ و وشکەسۆفیان بەکزی و خەمبارییەوە باس بکەم، وەک لەسەری ڕێک کەوتبوون ڕەچەڵەکی خۆمت بۆ هەڵدەم. بە شادییەوە بە خۆشییەوە حیکایەت دەگێڕینەوە، تا هەین دەژین، جەماعەت کە مردیشین چاوی خانم خۆش.
ئەو شتەی لە بارەی تووە باس دەکرێت، بۆ ئێمە موهیم نییە، موهیم ئەوەیە ئێمە هەین، دەژین و زەڕەیەک لە شیرینی کەلام و جوانی گوفتارمان کەم ناکات، وە ئەمما بەعدا بۆت باس بکەین، خۆمان بە حەوتەوانەی ئاسمانی مەملەکەتی قەلەندەران دەزانین، حەوت چرای شەوانی تاری ئێرە، هاهاهاها... ئینسان ئەوەنە لە خۆیشی ڕازی نەبێت، مەراقە. کچان دەزانن، حیکایەتی من چۆنە و بۆشم گێڕاونەتەوە، وەڵام قەیدی چییە جارێکی دیکەش باسی دەکەم با تۆیش بزانی بۆ ڕۆژی تەنگەحیکایەت.
حیکایەتی من وەهایە، ڕۆژێک لە ڕۆژان، کوڕە سوڵتانی شاری نەبووان، کە باڵا بە قەو حەوت داری بییە و خەڵکەکەی هەموویان باڵایان بە قەو شەش داری بی دەبێت، چاو و برۆ ڕەشێکی جوانی نازدار دەبێت. لە هەمبەریدا کوڕە وەزیرێکش دەبێت، جادووگەرانی کۆشک دەڵێن دیارییەکت پێشکەش دەکەین هەرگیز شتی وا نەبوو بێت و نەبینرابێت. کوڕە وەزیر ئەوە دەبیستێت بە نۆکەری دەڵێت: بچۆ بزانە چۆنی دروست دەکەن بۆ منیشی دروست کە. وەڵا جادووگەران، لە شاری نەبووانەوە کە لە ئاسمانە، تەماشای چەندین شار دەکەن، شاری ئاژەڵان، شاری جنۆکان، شاری بنیامان، لە شاری ئادەمان و پەرییان، چەندان مرۆی پەری ڕەنگ و نازەنین دێنن، لەسەر ئەڵقەبەندێکی زۆر گەورەی زێڕین، هەمووی ڕووپۆشکراو بە دۆشەکەڵە و سەرینی ئاوریشمین دادەنێن، لە ناویشیاندا کورسییەکی گەورەی لە مەخمەڵ دروستکراو بە تایبەت بۆ گەوهەرە نایابەکە دانراوە، کە کچێکی بێوێنەی شاری ئادەمانە. تاجە دروست دەکەن و لە ژوورێکی تایبەت دایدەنێن، لەو لاشەوە، نۆکەری وەزیر وەک ئەوان دەست دەبات بۆ خوارەوە دەستی دەچێت بە شارێکدا سەدان شت هەڵدەگرێت، دەیخاتە ناو ئەڵقەیەکی مسینیەوە، قوماشی ئەتڵەسی تیا دادەخات و شتەکانی لەسەر دادەنێت، کە وەک

کێوێک بەرز دەبنەوە. بەڵام لە دوورەوە تەماشا دەکات وەک ئەوەی ئەوان باقوبریقەی نایەت، بۆیە بە دزییەوە پڕ یەک تەن لەو شتە ڕەشەی خۆی دەبات و لە بری ئەو بنیامە تایبەتەی سەر قەنەفەکە، دادەنێت و بەشەرە دەڕفێنێ لەناو ئەو شتە ڕەشانە دایدەنێت کە پشقلن، بەو شێوەیە هەم تاجی سوڵتان شتێکی کەم دەبێت، هەم تاجی وەزیر شتێکی زیادەی دەبێت. ئینجا بۆت مەعلوم بێت خانم، ئەو بەنی ئادەمە جوانە دزراوە منم، کە ئێستا لەناو ئەم پشقلانەدام، هاها هاها... جا دەردم بزانە، خوا فرسەتم بدات کەوتوومەتە ناو چ ناخۆشییەکەوە، هێشتاش دڵم گەورەیە، خۆم وا پیشان ئەیەم لەناو خۆیاندام و ئەهلی خۆیانم.

حیکایەتی حەوت کچی پاشات بیستووە؟

دەبڵێن ئەوە چۆن بوو: ئێ ئەوە وەها بوو کە وەختی خۆی لە سەرزەمینێکی دوور دوور، پاشایەک دەبێت خاوەن حەوت کچی ئێمەئاسا کە تەلیسم و سیحر و سەودای ناز و جوانی هەر لە خۆیان دەوەشایەوە، نە دڵت دەهات تەماشایان کەیت نە بەرگەت دەگرت گوێیان لێ بگریت. کچان گەورە دەبن و پاشا نە دەیاندا بە شوو، نە بیری هەیە لە مەجلیس باسیان بکات، تا وەزیران و گوزیران بارەکەڵا بکەن و بیانخوازن. ئەم حەو کچە، ناویان لیمۆ، نارنج، هەنار، سێوە، هەرمێ، بەهێ و شاتوو دەبێت. ئینجا کچان، ئێمەئاسا حەز بە مێرد وماڵەشووی خۆیان دەکەن، نازانن تەکبیریان چی بێت و چلۆن بکەن. لە شایستەی ئەوانیش نییە حەز لە غولامان و خواجەکانی دەربار بکەن. ئەی چار چییە؟ وەڵا شاتوو کە منداڵترین و عەیار و فرەزان دەبێت، دەڵێت:

- وەرن با شتێک بکەین!

ئەوانیش دەڵێن:

- چ بکەین عەیارێ؟

شاتوو دەڵێت:

- من ئەم مەسەلەیە لەگەڵ حەکیم باس دەکەم و حەل دەبێت.

ئەوان دەڵێن:

- چۆن؟ ئاخۆ چۆن چۆنی؟

شاتوو دەڵێت:

- چ هەقتان نەبێت، ئێوە نەتان گەرەک شوو بە کوڕە وەزیران بکەن؟

گشتیان بە یەک دەنگ وەک ئێستەی ئێوە دەڵێن:

- بەرێ وەڵا.

- ئێ، دە متەق مەکەن و هەقتان نەبێت.

شاتووی عیلمباز، خۆی نەساغ دەردەخات، دەنێرن بە شوێن حەکیمدا، کچە دەڵێت:

- حەکیمباشی، ئێمە حەوت کچی دەمەبەختین و باوکم بیری نییە بە شوومان بدات. جەنابی پاشای باوکمان حەوت وەزیرانی هەن، یەکی کوڕێکیان هەیە و بێ ژنن، دەبێت کارێک بکەین باوکم خۆی لەو حەوت ڕۆستەممان مارە ببڕێت. بۆ ئەوەش تەڵەکەیەکم دۆزیوەتەوە.

حەکیم دەڵێت:
- تەکبیر و تەڵەت چییە؟
ئەویش دەڵێت:
- ئاخری هەفتە شاهـ و وەزیران و کوڕانیان دەچنە ڕاو و شکار. شا بە جودا، وەزیران پێکەوە، کوڕانی وەزیرانیش جودا لەوان، پێکەوە قاوەڵتی دەکەن. ئەو دەمەی هەر حەوتیان دانیشت نان بخۆن، سووکە دەرمانێکیان لە خواردن بۆ بکە، تووشی یاو و لەزر ببن، جا کتوپڕ بە قەستی چارەسەر لە ڕاو دێنەوە، بۆ ئەوەش تۆ بانگ دەکەن، تۆیش بۆ هەر یەکێکان دەرمانێک بنوێنە.
بەو شێوەیە تەکبیری کراو، سەردەگرێت. هەر حەوتەیان نەخۆش دەکەون، بە هەڵەداوان دەیانهێننەوە دەربار.
پاشا دەڵێت:
- ئەوانە شۆڕەسوارانی منن، ڕاگرانی مەملەکەت و نۆکەرانی خۆشەویستمن، عەلەل عەجەل ئەگەر لە کێوی قافیش بێت دەواودەرمانیان بۆ پەیابکەن، ڕۆحی یەکیان دەرچێت، ڕۆحی حەوتتان دەردەکێشم! بەو شێوەیە حەکیم باشی دێننە لای حەوت کوڕە وەزیری لەجێکەوتوو. نەبزی کوڕی وەزیری یەکەم دەگرێت، سەرێک ڕادەوەشێنێت، ئەوانەی دەورووبەر کە پێشتر حەکیم لەگەڵیان ڕێککەوتووە، هەرچی وت، بڵێن نییە. دەڵێن:
- قوربان چی دەوێت؟
ئەویش دەڵێت:
- ئەم نەخۆشە، دەبێت لیمۆی بۆ بگوشرێتە ناو سێ کەوچک زەنجەفیلەوە، گیراوەیەکی لێ دروست بکرێت و بیدرێتێ تا چاک بێتەوە.
شاگرد بۆ لیمۆی شیرازی دەنێرێت، پاش نەختێک دێتەوە دەڵێت:
- قوربان لیمۆی شیرازی توند و زەرد، دەستناکەوێت، چی بکەین؟
هەواڵ دەچرپێنن بە گوێی وەزیردا، کە لە ئەنجومەن لەتەک شەش وەزیران و پاشادا، دانیشتوون و چاوەنواڕی هەواڵی چابوونەوەی نەخۆشانن. وەزیر دڵی توند لێ دەدات، دەڵێت وا بڕوات کوڕم دەمرێت، حەلی چییە؟ ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێت و بێتاقەت دەنوێنێ. پاشا کە ڕەنگی وەزیر دەبینێت دەڵێت:
- وەزیر دەرمانی چییە؟ بۆ پەیایان نەکرد؟ بۆ نایدەنێ؟ ئەو نۆکەری منە و نابێت بمرێت.
- قوربان لیمۆی توند و زەردیان دەوێت و دەستناکەوێت، تەنها یەک لیمۆ لە مەملەکەتدا هەیە، ئەویش کچەکەی جەنابتانە. قوربان ڕاتان چییە ئەوی بدەینێ بەشکو چا بێتەوە؟ پاشا دەستێک دێنێت بە ڕیشیدا دەڵێت:
- ئەگەر چا دەبێتەوە بیدەنێ.
وەڵا لیمۆی توند و تورتی شازادە بۆ ژووری کوڕە وەزیری تاگرتوو دەهێنن، کوڕە لە حەژمەت شازادەی خەرامان ڕەنگ، ڕەپ و ڕاست لە جێ دەوەستێ، هاهاهاها... ئەلەمی تێدا نامێنێ.
جا نۆرەی کوڕەی دووەم دێت، حەکیم دەڵێت:
- ئەم وەزیرزادەیە، بەو لەرزەی گرتوویەتی پێستی وشک هەڵاتووە، بە گرتنی نارج باش دەبێت. شاگرد ڕادەسپێرێت،

بچێ نارنج بهێنێت، شاگردە بە خەمباری دێتەوە دەڵێت:
- حەکیمباشی نارنج لە مەملەکەت براوە، جێ نەما سەری پێدا نەکەم!
کاتێک وەزیر ئەمە دەبیستێت، مات و مەهبوت، ڕەنگی خەمی لێدەنیشێت، پاشا دەڵێت:
- ها وەزیر؟ بۆ مات بوویت؟ ئەوە غوڵام چی چپاند بە گوێتدا؟ حاڵی نۆکەرمان نەکا خراپ بێت؟
وەزیریش دەڵێت:
- قوربان، حەکیمباشی دەڵێت: کوڕم عەیب نەبێ بە گرتنی نارنج چا دەبێتەوە، لەم مەملەکەتەش نارنج قڕانە، یەک دانە نەبێت، ئەویش کچی جەنابتانە.
پاشا دیسانەوە دەستێکی پڕ لە ئەموستیلە بە ڕیشیدا دێنێت و دەڵێت:
- باشە بیدەنێ بیگرێت، با باش بێت.
وەڵا نارنج لە دەستێ جلی نارنجیدا دێننە کن کوڕەی نەخۆشی نارنجگر، کوڕە کە دەیبینێت ئەویش لە جێ ڕەپ دەبێت، هاها هاها...
نۆرەی کوڕی سێیەم دەگات، حەکیم دەڵێت:
- وای لەمە، وای لەمە!
دەست و پێوەند دەڵێن:
- قوڕ بەماڵمان ئەمە چییەتی؟
حەکیمباشی دەڵێت:
- دەبێت دەم بنێت بە سەری هەناری گوڵبەدەمەوە، وەگەرنا چا نابێت، بڕۆن هەنار پەیدا بکەن.
شاگردە دەڕوات و بە شپرزی دێتەوە، دەڵێت: حەکیمباشی، مەملەکەت خاڵییە لە هەنار! ئەوسا ئەم قسەیە دەچپێنن بە گوێی وەزیری سێیەمدا، کە لە حزوری پاشادا لەگەڵ وەزیرانی تر چاوەنواڕن. مات دەبێت، پاشا دەڵێت:
- وەزیر چ باس، ئەدی بۆ ڕەنگت پەڕی؟
وەزیر دەڵێت:
- پاشام سەلامەت بێت، دەڵێن: عەیب نەبێت کوڕەکەم دەبێت دەم بنێت بە سەری هەنارەوە، وەگەرنا چابوونەوەی ئەفسانەیە. هەناریش لە مەملەکەت چکی کردووە، یەک دانە نەبێت، ئەویش کچی جەنابتانە.
پاشا سەیرێکی ئەملاولا دەکات، دەڵێت:
- بیدەنێ با نەمرێت.
وەڵا هەنار لە دەستێک پۆشاکی شاهانەی هەناریدا بۆ کوڕە دەبەن، کوڕە مووی گیانی وەک سیخ بەرز دەبێتەوە، هەڵدەستێ لە جێ... هاهاهاها...
جا نۆرەی کوڕی چوارەمە، وەزیر نەبزی دەگرێت، دەڵێت:
- ئەم جەوانە داماوە، حاڵی ناحاڵە!
دەست و پێوەند دەڵێن چۆن قوربان؟ چۆن؟ ئەی دەرمانی چییە؟ حەکیم باشی دەڵێت:

-  دەبێت بۆن بە سێوە لاسوورەوە بکات.
شاگرد دەنێرن پەیدای بکات، شاگردە دێتەوە، خۆی مات و مەحزون دەکات، دەڵێت:
- قوربان لە شار، سێوە لاسوورە نەماوە و قاتییە!
ئەم قسەیە دەگاتە بە گوێی وەزیر، ئەویش دەموچاوی سوور هەڵدەگەڕێ. پاشا دەڵێت:
-  وەزیر چی ڕوویدا؟
ئەویش دەڵێت:
- قوربان کوڕەکەم بیلامانێ بە بۆنکردنی سێوە لاسوورە چا دەبێتەوە دەڵێن هەموو شار گەڕاون هیچیان دەستنەکەوتووە، یەک قل نەبێت پێیان شک دێت، ئەویش کچی جەنابتانە!
پاشا لێوێک ئەقورتێنی و دەڵێت عەجەبا! دە بیدەنێ با خاسەوە بێت.
وەڵا سێوەخاتوونی شازادە لە دەستێ بەرکی شاهانەی زەرد و سووردا دەهێنن، کوڕەی کەساس بە بینینی حۆری وا، هەڵدەماسێ هاهاهاها...
وەڵا نۆرە دێتە سەر کوڕەی پێنجەم، حەکیمباشی دێتە لایەوە، دەڵێت:
- ماڵ کاول بووە وەزیر، خوا پێت عەتا بفەرمووێتەوە جارێکی تر.
جەماعەت دەڵێن، قوربان بۆ چییەتی؟ ئەی دەرمانی چییە؟
حەکیم دەڵێت:
- دەرمانی ئەمە هەرمێی ناوقەدبارێکە، دەبێت لە دوو دەستی نێ.
شاگرد دەڕوات شار تەی دەکات، بە هەناسەبڕکێ دێتەوە، دەڵێت:
- حەکیمباشی وەک ئەوەی جادووکرابێت، چی هەرمێ هەیە لە شار، مەحف بوونەتەوە. قسە دەگات بە گوێ وەزیر، وەزیر لە ئەنجومەن، ڕەنگی ڕەش دادەگەڕێت، پاشا دەڵێت:
- وەزیر چ بوو؟ چ باسە لای حەکیم؟
وەزیر دەڵێت:
- قوربان عەزری جەنابتان بکەم، دەوای کوڕەکەم دوور لە ڕووی ئێوە لە دەست نانی دوو هەرمێی ناو بارکە، لە شاریش دەست ناکەوێ، یەک دانە نەبێت ئەویش کچی جەنابتانە!
پاشا مێزەرەکەی دەجووڵێنێ و دەڵێت:
-  باشە بیدەنێ جەوانە، با نەمرێت.
کچەی پاشا، بە ناز و عیتاب، لە دەستێک جلی زەردی سوورمەچندا دەبەنە لای کوڕەی وەزیری تاگرتووی ئوفتادەی ناوجێ، بۆ کچە نابینێ فەقیرە لە جێ ڕەق ڕەق دەوەستێ، هاهاهاها.
بە سەرەش بێت، سەرەی کوڕەی شەشەمە، حەکیمباشی دەست دەخاتە سەر سکی و دەڵێت:
- قوڕبەسەرم ئەمە چییە؟ خوا ڕەحمی پێ بکات!
غولامان و نۆکەران، کە دەستەونەزەر وەستاون، دەڵێن:

قوربان مەمان ترسێنە، ئەمە دەرمانی چییە و دەردی لە کوێوە بۆ نازل بووە؟
حەکیمباشی دەڵێت:
-دەرمانی ئەمە بۆنکردنی بەهێ و خواردنی ناوکەکەیەتی!
شاگرد دەنێرێت بۆ بەهێ، شاگردە بە غوڵماوی دێتەوە دەڵێت:
- حەکیمباشی بەی لە شارا، بە دارەوە نییە!
ئەمە دەگاتەوە بە وەزیر، وەزیر دەتاسێ. پاشا دەڵێت:
- وەزیر چ بووە؟ وەزیر دەڵێت:
- قوربان چ بێ لە جەنابتان نهێنی، پەرژینێ قایم بێت، دەرمانی کوڕەی تاقانەم، بۆنکردنی بەهێ و خواردنی ناوکەکەیەتی، لە مەملەکەت دەستیان نەکەوتووە یەک دانە هەیە، ئەویش شازادەی جەنابتانە!
پاشا عەباکەی کۆ دەکاتەوە و دەستێ دەهێنێ بە ئەژنۆیا و دەڵێت:
- سوبحانەڵا لەم دەرد و دەرمانانەی پەیدابوون، بچن شازادە بەهێی بدەنێ با نەمرێت!
وەختێک شازادە بەهێ لە دەستێ جلی بەهێ ڕەنگدا، بە لەنجەی کەو و قومری ئاسا دەبەنە لای کوڕە وەزیر، کوڕەی نەخۆش لە حەژمەتا ناوکی دەرەپەڕێ... هاهاهاها.
هاتینە سەر کوڕی وەزیری حەوتەم، حەکیم دەچێت دەست دەخاتە سەر سەری و مەچەکی دەگرێت، ئەڵێت:
- پەنا بە خوا لە دەردی وا، لە کارەساتی نەبیستراو و نەبینراوی وەها!
جەماعەت دەڵێن:
- چییە؟ قوربان چ باسە؟
ئەویش دەڵێت:
- دەردی گرانە، دەبێت شاتووی ناسک و سوور بخشێنن لە لێوی، بە حاڵ لێوی پێ تەڕ بکەن ئەوجا شیفای دێت!
وەڵا شاگرد دەڵێت:
- ناچم قوربان ناچم، بۆ شار، چونکە دەزانم نییە لە شاران، قوربان، لە دنیادا شتی وانییە و بەس لە کتێبدا هەیە، خۆت بۆت باسکردووم.
وەڵا خەبەر دەدەبەن بۆ وەزیر، ئەویش یەکسەر لە تاوا هەڵدەستێ، شا دەڵێت:
- چییە وەزیر؟ بۆ پەشۆکایی، نەکا خەبەری مەرگ بێت؟
وەزیر دەڵێت:
- قوربان؛ حەکیم دەڵێت: بیلاتەشبیھ عیلاجی کوڕەی نازدارم، لە لێوخشاندی شاتووی تەڕ و ئاودارە، دەشڵێن ئەمە بەس لەناو کتێبدان دایە.
پاشا دەڵێت:
- نا نا، بوەستە، تۆ نازانی من کچێکم هەیە ناوی شاتووە، لێی خشێنن باش دەبێت، ئەلحوکمولیلا.
هەر حەوت وەزیر پێدەکەنن. شاتووی عەیاری غەمماز لە دەستێک جلی سوور سووری ئاوداری جیلوەداردا، دەبەن بۆ

کوڕەی نەخۆش. وەڵا کوڕەی وەزیر بە بینینی ئەوپەری و حۆرییە ڕێکوڕاست چاک دەبێتەوە، چاوقایمانە دەڵێت: بیهێنن لێمی خشێنن... هاهاها...

ئیتر هەر حەوتیان شوو دەکەن، ڕێک پڕ سەبەتەیەک میوە.

# شەوی بیست و سێ

دوێشەو ماھپەیکەری خۆشمەشرەف بە ناوی بەخشەری گوناھـ مەجلیسی پڕ قسەوباس کرد، ئەمشەو من کە بە سوورمە ناسراوم، حەکایەت بە ناوی بەرخەری بەلاوە سەرئاغاز دەکەم. هەر چەند وەک هی ماھپەیکەر خۆش نییە، بەلام بە خوا منیش بە قسەخۆش ناسراوم، حیکایەتی ئابڕووبەرەتان بۆ ئەگێڕمەوە. دەڵێن ڕۆژێ لە ڕۆژان، دوو کچ ئەبن، چاولێکەری یەکن و قینەبەرەکێی یەک دەکەن، یەکێکیان ناوی نارێ ئەوی تر ناوی نەرگز دەبێت. نارێ گەورەترە و تۆزێ عاقڵترە، نەرگز منداڵکارە و حەزی لە چاولێکەرێییە. ئەم کراسێک دەکات ئەویش لە داخا کراسێک دەکات، ئەم گۆزە ئاو دێنێ لە کانی ئەویش دەچێ دەیهێنێ، ڕۆژێک پیاوێک دێتە داوای نارێ، نەرگز کە ئەیبیستێت ئاگران ئەگرێ نازانێ چ بکات، نارێ، شوو دەکات بە پیاوە، پیاوە دێنێتە سەر ماڵ، نەرگز حاڵی ناحاڵە، هەرچی دەکات ئەم ڕادەسپێرێ ئەو ڕادەسپێرێ هیچ، چونکە نسیبی نەبووە، شوو ناکات. وەلا لە تاو نارێ، ڕۆژێک کابرایەکی گێلۆکە، کە بۆ وردەنان ئەگەڕێ، نێرگز بانگی دەکاتەوە ژوورەوە، دەڵێت:

- خاڵە ژنت هەیە؟ ئەویش دەمی دائەچڕێ، دەڵێت:
- نەوەلاااا. نەرگز دەڵێت:
- حەزەکەی ژن بێنی؟ گێلە دەڵێت:
- ئەرەوەلااااا. دەڵێت:
- ئەی بۆ نایهێنێ؟ ئەڵێ:
- چوزانم وەلاااااا. نەرگز ئەڵێ:
- وەرە من بێنە. گێلە ئەڵێ:
- بۆ کوێت بێنم؟ نەرگز دەڵێت:
- وەکو ژن بمهێنە. گێلە ئەڵێ:
- ئاخر بۆ کوێ؟ نەرگز ئەڵێ:
- کەرە بۆ ژێر خۆت. ئەوسا گێلە لیک بە دەمیا شۆڕ ئەبێتەوە دەڵێت:
- ئاخر من کەرم لەژێرە دڵم نایەت فرێی بەم. نەرگز ئەڵێ:
- حەیوان وەرە داوای من بکە، من دەبمە ژنت نەک کەری تۆ. گێلە دەڵێن:



- ئاخر ئەگەر نەبی بە کەری من، دەبێت من ببم بە کەری تۆ. نەرگز ئەڵێ:
- حەز ناکەی ببی بە کەری من؟ گێلە ئەڵێ:
- ئاخر ئەی کەرەکەم هیی کێ بێ، کە من کەری تۆم؟ نەرگز ئەڵێ:
- هیی خۆت دەبێت . گێلە دەڵێت:
- تێگەیشتم، گوێدرێژەکە کەری منە، من کەری تۆم، تۆیش دەبێت ببی بە کەری گوێدرێژەکە، حا حا حا... نەرگز دەڵێت:
- باشە موهیم ئەوەیە بە یەکەوەبین و تۆ پیاوی منت بیت. گێلە دەڵێت:
- من پیاوی تۆ نیم، من پیاوی ئاغام. نەرگز دەڵێت:
- بیبڕەوە گێلە گیان، ئیمشەو خۆت بشۆ، بێ بۆ ماڵمان مەلا دێنم و مارەمان دەکات.

گێلە ماڵەوماڵ دەگەڕێ ورتکەنان کۆ دەکاتەوە و دەڵێت: ئەمشەو ژن مارە دەکەم. شەو خۆی دەشوات، دەچێت بۆ ماڵی نەرگز و مەلا مارەیان دەکات. نەرگزیش شیرینی بۆ ماڵی ناری ئەنێری تا بزانن شووی کردووە.

شەو کە مەلا و شایەتان ئەڕۆن، نەرگز بە گێلە ئەڵێ، دەی وەرە با ئیشی خێر بکەین، گێلە دەڵێت:
- باش.
هەڵدەستێ یەک سەبەتە مێوژیان هەیە دەینێتە سەر سەری و دەچێتە دەر، ماڵەوماڵ دەگەڕێ و چنگێ مێوژیان دەداتێ و دەڵێت: وەریگرن من ئەمشەو ژنەم وتوویەتی با ئیشی خێر بکەین، منیش خەریکە ئیشی خێران دەکەم، هەموو خەڵک کە ئەوە ئەبیستن، پێدەکەنن و مشتەمێوژەی لێوەرەگرن. دوای سەعاتێ بە قوڵینەی بەتاڵەوە دەچێتەوە ماڵ. نەرگز دەڵێت: پیاوەکە ئەوە چییە بۆ دیار نەمایت؟ دەڵێت: چووم مێوژەکەی ئەم زستانەم بەخشییەوە، وتم با ئیشی خێرم کردبێ. نەرگز ئەکێشێ بەسەر گێلەیا دەڵێت:
- دەبەنگ ئیشی خێر جا ئەوەیە؟ ها؟ گێلە دەڵێت:
- ئەی چییە؟
- نەرگز دەڵێت ئەوەیە بە یەکەوە بخەوین.
ئینجا دەچنە ناو جێگە، نەرگز خۆی تەیار و ئامادە دەکات، گێلە بانگ دەکات، ئەویش ئەنیشێتە سەری، تەماشای نەرگز دەکات، دڵی پڕ دەبێت و دەست بە گریان دەکات، نەرگز دەڵێت:
- باوانت شێوێ بۆ ئەگریت؟ گێلە دەڵێت:
- من چۆن دڵم دێت عەزێتت بدەم، قەت عەزێتی کەسم نەداوە، تۆ لە دایکم دەچیت، بیری ئەوم کەوتەوە، من ئەمەوێ بچمەوە بۆ لای دایکم.
نەرگز خەریکە شێت دەبێت. پەلاماری کابرا دەدات و شەرواڵی ئەترازێنێ، دوور لە رووتان کچان، سەیرەکات، پیاو نییە… هاهاهاهاها… نەرگز بە هەردوو دەستی دەکێشێ بەسەر گێلەیا و دەڵێت بڕۆ دەرەوە. گێلە دەڵێت: تۆ ژنی منی چۆن ئەڕۆم، بە تەنیا شتێکت بەسەر دێ بە خوا ناڕۆم. ئیتر ئاوا نەرگز بە دەست گێلەوە دەناڵێ و لە کۆڵی نابێتەوە. تا وای لێ دێ نەرگزیش وەک گێلە، گێل دەبێت. دوو گێل دەکەونە یەک.
ڕۆژێک کوڕی ئاغا نەرگز دەبینێ ئەوەنە جوان و گێلیشە، بۆی حەیران دەبێت، دەڵێت: با بچم خۆمی پێ تاقی بکەمەوە. وەڵا ڕۆژێ نەرگز دەچێتە سەر کانی کوڕەی ئاغا نزیکی دەبێتەوە و دەڵێت: نەرگز خان، ئەوە من داریکم هەیە دەیەڵی بیخەمە ئەو ئاگردانەکەتەوە، نەرگزیش دەڵێت: قەیچێکا وەرە بیخە بەس من ئاگردانم نییە. کوڕە دەڵێت با هەتە، وەڵا دێتە وێزەی و ئیشی خۆی لەگەڵ دەکات، ئەوکات کوڕی کوێخای گوند لەگەڵ گێلەی مێردی نەرگزدا دەگەن، کە وەزعەکە ئەبینێ دەڵێت:
- گێلە ئەوە ژنەکەی تۆیە ئەها سواری بوون، گێلە دەڵێت:
- قەیچێکا ئەها ئێمشەو سوار کەربووین. کوڕی کوێخا دەڵێ:
- کەرە ئەوە ئیشی خراپی لەگەڵ دەکا، ئەوسا گێلە ئەڵێ:
- چۆن دڵی دێ؟ شەرت بێت بیکوژم، من هەر ئیشی باشی لەگەڵ دەکەم چۆن ئەو ئیشی خراپی لەگەڵ دەکات.
بە دارێکەوە بەرەو ڕووی هەڕا دەکات، سەری بکات بە دوو کەرتەوە، وەڵا خەڵک و خوا لێیان کۆ ئەبنەوە گوڵمەزێک دروست ئەبێت ئەوسەری نەبێتەوە. نەرگزیش ڕووت و قووت لەسەر بەردێک لەو لای کانی و ئاوەوە دانیشووە قژی

شانە دەکات. لەو حەنەدا ڕێبوارێک ڕێی دەکەوێتە ئەو ناوە. تەماشا دەکات گوڵمەزە دە پانزە مێرخاس یەکیان گرتووە، بکوژ و بڕۆیانە، خەریکە یەک قات دەکەن... ڕێبوارە بە خۆی دەڵێت: باشە لێرەوە بڕۆم ئێستە ئەم ڕۆستەم ئاسایانە لەت لەتم دەکەن، با لەو لاوە بڕۆم، کە تەماشا دەکات ژنێکی جوان ڕووت و قووت لەسەر بەردێک دانیشتووە و قژی شانە دەکات، ئەی خوایە دەڵێت: باشە لێرەوە بڕۆم تووشی گوناح دەبم و شەیتان زەفەرم پێ دەبات. چ بکەم؟ وەڵا سەر دێنێ و دەبیات نازانێ چی بکات. قەرار ئەیات لە لای ژنەوە بڕوات. دەچێتە پێشەوە سەر دادەخات دەڵێت:

- خوشکێ ئەوە عەیب نەبێت ئەو هەرایە لەسەر چییە؟ ئەو پیاوانە بۆ چ وادەکەن؟ ژنە سەیرێکی پیاوەکە دەکات و خاوەخاو دەڵێت:

- وەڵا برام نازانم، دەڵێن گوایە منیان گاوە، بۆیە شەڕیانە... هاهاهاهاهاها

# شەوی بیست و چوار

دوێشەو هەقایەتەکەی سوورمە زۆر خۆش نەبوو، سوورمە گیان قەزات لە گون و گورچەویلەم، دڵەی بچووکت حیچ نەکات. وەرن خۆم هەقایەتان بۆ بکەم، خاتوون من ناوم کاکۆڵە و دەمەوێ یەکێک لە بەسەرهاتەکانی خۆمانت ئا لەم مەملەکەتەدا بۆ بگێڕمەوە.
لە مەملەکەت پیاوانی خواناس و کچانی ناو کتێب و شتی موهیم موهیم زۆرن، گوایە ئەگەر وا نەکەن، وا بکەن خوا دەیانسووتێنێ و هەڵیان ئەچزێنێ و ئەوشتانە. خوا ئاگای لە دڵە نەک فسکەفسکی دەروێشان، خوا هیی هەمووانە نەک بە تەنها ئی ئەوان. خوا جوانە و جوانی خۆشدەوێ نەک ئەو ناشرینانە.
بەسەرهاتی فەقێ حۆری نەقڵ دەکەم. لە مەملەکەت فەقێیەک هەبوو ئێستە وابزانم بۆتە مەلا. فەقێ زۆر بە پەلە بوو، ئەیویست زوو بگاتە مەلایی، زوو ئیمانی قایم بێت، ببێ بە موفتی و کوڕە چوزانم بە مەلای هەموو مەملەکەت. خوا هەڵناگرێ عیبادەت و تاعەتیشی زۆر بوو، وەکو باسیان دەکرد، شەوی پەنجا هەزار قوڵهووەڵا بەس لە نوێژدا دەخوێنێ. نوێژی شەونوێژ و سونەت، هیچی لە دەست دەرناکات. بڵێن ئێ؟
ڕۆژێک بەسەر پردەگاوردا پیاسەمان دەکرد، لەناو تاقێکدا وەستابووین و ڕوومان لە ئاوەکە کردبوو، هەر حەوتمان کریک و ورمان بوو. لە تاقی ئەولاوە دەستەیەک فەقێی جەوان وەستابوون قسەیان دەکرد و بە شتێک سەغڵەت بوون، شتەکە ئەوەندە موهیم بوو، فەقێ بێت و ئەم حەوت فریشتەیە نەبینن. وەڵا مەرجانی ساختەچی دانیشت و گوێی نزیک کردەوە بزانن چی دەڵێن، تەمەس باس باسی ئەو فەقێ نیعمانە بوو، کە چۆن بە تەڵەکە دەیەوێ لەمانی بباتەوە و پێشیان بداتەوە و ببێ بە مەلا، ئەو زیرەکە و مەلا نجوم ئەوی خۆشتر ئەوێت و مەلا عەباسیش هەر بارەکەڵا و ئافەرینی دەکات. ئەمان حاڵیان ناحاڵە عیبادەت دەکەن، بەڵام هەر لێیان ناڕازین، کوڕە نازانم کتێبی شێخە شیرازی و مەلا تورکە و عالمە کوفیان ئەزبەر کردووە و سوودی نییە، هەر باس باسی ئەوە...
وەڵا مەرجان لە مەسەلە حاڵی بوو، وتی: بۆستن جەماعەت شتێکم لێگیر بوو بە دوایدا دەچم و پێتان دەڵێمەوە. ئێمەیش وتمان باش. وەڵا ئەو ئێوارەیە ڕۆیشت و بڕایەوە. مەرجان کە خۆی لێرە حازرە، دەچێت نامەیەک بۆ یەکێک لە فەقێکان ئەنووسێت، دەڵێت ئەم مەسەلەیەتان بۆ حەل دەکەم، بەڵام لە بری ئەوە دەبێت ئەم شەو لە سەکۆی مزگەوت دانیشن خەتمی قورئانێک بکەن و بڵێن خێرەکەی بۆ حەوتەوانە. ئەگەر سبەی شەو کۆڕی قورئان خوێنیتان کرد، ئەوە من دوو سبەی بۆتان حەل دەکەم. نامە ئەگات بە فەقێ و ئەیخوێنێتەوە، فەقێ دێت دەستەی فەقێیانی تری لێ ئاگادار دەکاتەوە،

دەڵێت یەکێک لە حەوتەوانە ئەم نامەی ناردووە و ئەوە داواکەیەتی، دەڵێن چی ئەم شەو سی فەقێمان دانیشین و بە دەورە سی جوزئەکە لە خێری ئەوان بخوێنن؟ هەمووان بارەکەڵا دەکەن.
بۆ ئەو شەوە لەسەر سەکۆی مزگەوت، سی فەقێ لە دەوری یەک کۆبوونەوە و دەستیان بە خوێندنی سی جوزئی قورعان کرد. یەکی جوزئێک، سەردەستەکەیان وتی: خێری ئەم خەتمە بۆ حەوتەوانە. هەر کەس گوێ لێ بووایە وایدەزانی حەوتەوانەی ئاسمان یان حەوت ئەسحابانە. ئەوسا مەرجان نامەیەکی بۆ ناردنەوە، وتی: ئەوە خێرەکە چووە سەر تەرازووی ئێمە، ئێمەیش ئەم شەو دەستبەکار دەبین، بەڵام ئێوە هیچ مەڵێن و خۆتان بکەن بە کەڕەی شەربەت.
ئینجا مەرجان هاتە لای ئێمە، وتی:
- کچان هۆ کچا... ئێمەیش وتمان:
- هۆو هۆ... وتی:
- وەرن دەمێکە کەتنمان نەبووە، ئەمشەو یەکی خێری جوئێک قورئانمان بۆ هاتووە، با هەق بۆ ئەو فەقێیانە بکەینەوە، ئەو فەقێ نیعمانە ئەوەنە لە خۆی ڕازی نەبێت، ئێمەیش وتمان:
- چی بکەین؟ وتی:
- من بە پرسیار حوجرەی ئەوم دۆزیوەتەوە، لە پشتەوەی مزگەوت لە دەستەڕاست ئاخر ژوورە، دوو ژووری ئەملاوەی چۆڵن، پەنجەرەی حوجرەکەی لە پشتەوە بەسەر باخەکەیا دەڕوانێت. شەو جوان جوان خۆتان بگۆڕن و یەکی عەبایەک بدەن بەسەرتاندا کەرەستەی پێویست بێنن و لە دەرگای پشتەوەی مزگەوت ئامادە بن.
وەڵا بەو جۆرەی بۆی دانابن، خۆمان ڕازاندەوە کراسیی یەخەکراوەمان پۆشی، زوڵفمان داهێنا و خۆمان بۆنپرژێن کرد. بە فرکان چووینە ناو مزگەوت و لەبەردەم پەنجەرەی فەقێ نیعمان خۆمان داگرت. تەماشا دەکەین، فەقێ نیعمان نوێژ دەکات و ئەگریەت، دەڵێت: خودایە دەمێکە من ئەپاڕێمەوە و نیشانەی خودایم نیشان بدە، ڕووتبەم عالی بکە خودایە. ئەوە من حەوت مانگە، حەوت هەزار جار داوای عەتا و بەخشینی نوورم کردەوە، ئەوەی لەو دنیا پێم کەرەم دەکەیت لەم دنیا نیشانم بدە. خوایە من حەوت دەرگای تۆم کردەوە هیچم دەست نەکەوت:
لە دەرگای یەکەمم دا بۆت نەکردمەوە
لە دەرگای دووەمم دا بۆت نەکردمەوە
لە دەرگای سێیەمم دا بۆت نەکردمەوە
لە دەرگای چوارەمم دا بۆت نەکردمەوە
لە دەرگای پێنجەمم دا بۆت نەکردمەوە
لە دەرگای شەشەمم دا بۆت نەکردمەوە
لە دەرگای حەوتەمم دا بۆت نەکردمەوە، خودایە بۆ وا لە منی بەدبەخت دەکەیت، خودایە، خودایە خودایە... کە تەواو بوو لە پاڕانەوە، سەری لە سوجدە دانا. وەڵا مەرجانیش عەبای دانا و کراسەکەی نەختێ بۆ خوار داکێشا تا سنگی باشتر دیار بێت، کاسەیەک ئاوی گرت بە دەستیەوە و چووە ژوور، بە هێواشی دانیشت، تا فەقێ نیعمان سەری لەسەر سوجدە بەرز کردەوە، جا مەرجانی بێناموس کە چاوی پڕ لە کلە کردبوو، بۆنی ڕۆژەڕێیەک ئەڕۆی، بزەیەکی کرد و وتی:



- فەقێ بگرە، خوا کاسەیەک ئاوی زمزمی بە مندا بۆ ناردووی هەقی لە دەرگادانی یەکەم، بەڵام تۆ نەوەستای ڕۆیشتی، ئەگەر تۆزێکی تر لە دەرگات دابا، من خۆم بۆم دەکردیتەوە.

فەقێ نیعمان دەمی داچەقاند بوو، حەپەسابوو، فەقیرە چاوی دەچووە سەر بەرۆک و مەمکی مەرجان، ئیمان لە کەڵلەیدا نەدەما. مەرجان دوو پەنجەی لە ئاوی کاسەکە ژەند و لە دەموچاوی پرژاند و دەستی هێنا بە سیمای فەقێدا، وتی:

- من حۆری خودایم.

جامە ئاوەی کرد بە دەمی فەقێیەوە، فەقێ حەیران و مەستانە بە هێواشی دەستی هێنا بەسەر دەستی مەرجاندا. تۆزێکی پێچوو چاوێکی داگرت لێمان و ماهپەیکەر عەبای دانا و کاسەیەک هەنگوینی هێنا، کراسەکەی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی

لەبەر پێی نەگیرێ و پلوپوزی دەرکەوێ، هاتە لای فەقێ نیعمان وتی:

- فەقێ بەشارەت بێ، خودا منی بۆ لای تۆ ناردووە، ئەو کاتەی لە دەرگای دووەمت دا، سەبرت نەگرت و هەڕات کرد، یەک جاری تر لێت دابا من بۆم دەکردیتەوە، بەڵام قەیدی نییە، ئەوە خودا منی ناردووە تا هەنگوینی بەهەشت بکەم بە دەمتەوە.

ماهپەیکەر پەنجەی دۆشاومژەی لە کاسە هەنگوین هەڵژەند، بە هێواشی هێنای بە لێوی نوعمانی داماودا، فەقێرە دین و ئیمانی لە دەستدا. ماهپیەکەر پەنجەی لە دەمی ڕادەدا و نیعمانیش لە تاو لەزەت چاوی نوقاندبوو. مەرجان چاوێکی لێمان داگرت. خومار عەبای دانا، بە لەنجەیەکی پیاوکوژ و خۆبادانەوە کاسەیەک گوڵاوی هێنا و خۆی کرد بە ژووریدا، چووە بەردەمی فەقێ نیعمان و ئەژنۆی بە ئەژنۆیەوە نا، وتی:

- فەقێ نیعمان، ئەویش وتی:

- فەقێ لە دەورت گەڕێت. خومار وتی:

- ئەو کاتەی لە دەرگای سێیەمت دا بۆ زوو ڕاتکرد؟ یەک جاری تر لێت دابا خۆم دەهاتم لێم دەکردیتەوە، بەڵام نەچووە بچێ، ئەوە خودا بە کاسەیەک لە ئاوی کەوسەرەوە منی ناردووە. بێنە قومێکی لێ بخۆ، منیش دەست تەڕ ئەکەم ئەیهێنم بە سینەی تۆدا، تا ئەوەی لە قورعان و حەدیس حیفزت کردووە لە بیرت نەچێتەوە.

فەقێی داماو چی لێ نەهات؟ چواردەوری پڕ لە کچ بوو، ڕەنگی پێوە نەمابوو، لە تاو نەرمی دەستی خومار ئەینرکاند. ئینجا کاکۆڵ عەباکەی دانا بە کاسەیەک شیرەوە، وەژوور کەوت، چووە کنی و دەستی خستە سەر ڕانی، وتی:

- فەقێ نیعمان، ئەو کاتەی لە دەرگای چوارەمت دا زۆر کەم حەوسەڵە بوویت، من هاتم کردمەوە و تۆ فرتەت کردبوو، لە دوورەوە دیاربوویت، ئەمێستا خودا لە بری ئەو جارە، بە کاسەیەک شیری بەهەشتەوە بۆلاتی ناردووم، ئەز موڵکی خۆتم، وەرە پەنجەیەک بکە بەو شیرەیدا و بیکە بە دەمما، تا منیش وەک تۆ موبارەک بم.

فەقێ وەهای کرد و لیک بە دەمیا شۆڕبووەوە. ئینجا گەوهەر هاتە ژوور، خرەی خرخاڵی دەهات و بە نازەوە، سەبەتەیەک میوەوەی لە باوەش گرتبوو، بە ئاستەم خۆی لەنگاند، تا مۆزێک بکەوێتە باوەشی فەقێیەوە، ئینجا وتی:

- ئۆۆۆی فەقێ گیان! ئەوە بۆ ئەو جارەی لە دەرگای پێنجەمت دا بێ ئۆقرانە چاوەنواڕی وەڵام نەبووی؟ ها؟ من لێم دەکردیتەوە، بەڵام چونکە ڕۆیشتی نەتبینم.

ئینجا بە ئەسپایی دەستی بۆ کۆشی فەقێ برد و مۆزەکەی هەڵگرتەوە، سێوێکی دەرهێنا و نای بە دەمی فەقێیەوە وتی:

- قەپاڵی لێگرە، موڵکی تۆیە و میوە میوەی بەهەشتە.

ئای فەقێ لەژێر جبەکەوە هێنی دیار بوو. نۆرە هاتە سەر مەستوورە، یەک سینی پلاو و گۆشتی هێنا، لەبەردەم فەقێدا داینا، گرتکە گۆشتێکی هەڵگرت و خستییە ناو دەمی فەقێیەوە، وتی:

- ئەوە مامزی بەهەشتە بیخۆ، خوا تۆی هەڵبژاردووە، چونکە ئەو جارە فریا نەکەوتم دەرگای شەشەمت بۆ بکەمەوە، بۆیە ئێستا بۆم هێناویت.

وەئەخیرەن منیش عەبام دانا و کاسەیەک شەرابم هێنایە ژوور، ئەوان بە ئەڵقاوئەڵق لە دووری دانیشتبوون، منیش خۆم خستە باوەشییەوە، وتم:

- فەقێ نیعمان، تۆ بێ، ئەز دەرگاوانی حەوتەمم و دەرگات بۆ دەکەمەوە، وەرە ئەم شەرابی تەهورە نۆش کە!
کاسە شەرابم کرد بە دەمییەوە تا مەست بوو، ئەوسا شتەکانمان بەجێ هێشت عەبامان بە سەردا دا و رامان کرد، نزیکی بانگی بەیانی بوو. هەموومان لە ماڵ ماهپەیکەر خەوتین. سبەی نیوەڕۆ هەستاین. دەبینین لە شار هەراوزەنایە، دەنگۆ بڵاوبوو، ئەمشەو فەقێ نیعمان شەرابی خواردۆتەوە و بێشەرعی کردووە. بە پەلە بەرەو ماڵی خۆمان بڵاوەمان لێکرد، کاتێ سۆراخ دەکەین بۆمان دەرکەوت:
بەیانی کە مەلا بانگی داوە هەمووان بۆ نوێژ حازربوون، فەقێ نیعمان نەبێت، نوێژ دەخوێنن و تەلیلە دەکەن، دنیا ڕووناک دەبێتەوە مەلا عەباس دەچێ سەر لە فەقێ نیعمان بدات، چی نابێنێ ئەستەغفیرۆڵا، بە چواردەوریدا سورمە و پولەک ڕژاوە حەوت کاسە لە شەراب و شیر و ئاو و هەنگوین خواردن و میوە و شیرینی دانراون. فەقێ نیعمان لە ناوەڕاستیاندا بوراوەتەوە. دەستبەجێ بانگی مەلایان دەکات و دەنێرن بە شوین مەلا نجومدا، فەقێیان لە خۆشیاندا دڵیان ئاو دەخواتەوە. مەلا عەباس کە ئەمە دەبینێ دەهری دەبێت، سەتڵێ ئاو بە سەروچاویدا دەکات، هۆشی دێنێتەوە. مەلا نجوم کە دەبیبنێ ئەوە حاڵە و دەیان مەلا و سەدان فەقێ کۆبوونەتەوە لا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم دەڵێت و سەر دەلەقێنێ. کاتێک لێی دەپرسن ئەوە چییە؟ دەڵێت خودا حەوت دەرگای لێ کردمەوە، حەوت حۆری بۆ ناردم. ئەوانیش دەدەنە هارەی پێکەنین و دەڵێن: قوڕ بە ماڵت، حۆری چی بەلەنگاز، تۆ ڕیازەتت شکاندووە و شەرابت خواردۆتەوە و ئیمانت لە دەستداوە، خەریکی خراپە بوویت لەگەڵ ئافرەت و هێناوتنە ماڵی خواوە، هەی خوا غەزەبت لێ گرێت. شەرت بێت تەمبێت بکەم. کاتێک مەلا نیعمان تەماشای دەوری خۆی دەکات، تەریق دەبێتەوە، بەڵام سەری لە مەوزوع دەرناچێت. ئەوسا مەلا عەباس بە دوو فەقێیان دەڵێت: بە دارەکەی حەوشەوە بیبەستەوە تا ببێ بە عیبرەت، وەڵا دەیبەستنەوە و فەقێیان پێی پێدەکەنن. مەلا نجوم بیر دەکاتەوە، دەڵێت مادەم ئەمانە حەوت کاسەن، هەبێ و نەبێ کەتنی ئەو کچانەیە، ئەو حەوت کچە. دەمەو ئێوارە مەلا نجوم سەرمەد دەنێرێت بە شوێنماندا، دەڵێت: ماهپەیکەر بێتە حیکایەتخانە. ماهپەیکەر دەڵێت: ئاخۆ بۆچی بێت، چونکە سەرمەد پێی ناڵێت مەلا نجوم پێی وتووە. کە ماهپەیکەر لەوێ مەلا نجوم دەبینێ سەر دادەخات، مەلا نجوم ئێژێت خوا خەجاڵەتتان کات، بۆ واتان کرد؟ ئەویش دەڵێت: بۆ ئەوەی تەمبێ بێت، بزانین ئیمانی چەندێک بەرگە ئەگرێ... هاهاهاهاها...
ئیتر ئەوسا مەلا نجوم دەگەڕێتەوە مزگەوت، فەقێ لە دارەکەی دەکاتەوە، دڵی دەداتەوە: گوێ مەیەرێ ئەوە شەیتان بووە زەفەری پێبردووی لە سەرەتاوە دەست پێبکەوە فەقێ حۆری، دوای ئەوە فەقێکان نامەیەکیان بۆ مەرجان ناردبوو، وتبوویان شەڵا واتان لە ئێمە بکردایە... هاهاهاهاها...

# شەوی بیست و پێنج

دوێشەو کاکۆڵ ئەو پەند و مەسخەرەیەی بیر خستمەوە ئای چەندە پێکەنین، بەزمی وەهامان زۆرن، وەرە با شتێکی ترت بۆ بگێڕینەوە. من ناوم خومارە؛ لەتەک کچان خەریکی کەیف و سەفاین، پێدەکەنین تا ژیان بە دەممانەوە پێبکەنێ. مادەم ئەمشەویش کۆبووینەتەوە ئەمن گەرەکمە بەزمێکی تری خۆمانت بۆ باس دەکەم. جەماعەت بەزمەکەی حەمیدبەگ...
هاهاهاهاها.... بەسە؛ بۆستن:
خاتوون ئا لەم مەملەکەتەی تۆ خەڵکی هێند سەیر و سەمەرەی تێدایە، تا لە ناویدا نەژیت نازانیت چەندە گەورەیە و چەند بەشەری لێیە، چەند پیاوی چەتە و دز و چەندەش پیاوی باش، بۆرەپیاو، ناپیاو، بێناموسی لێیە.
ڕۆژێک هەر حەوتمان تاسی حەمام و لفکە و داڕوو، دیمەشۆر، سپیاوی قەڵایی، بەردەپێ و کەرەسەی حەمامەمان لە بنهەنگڵ نا، چووینە حەمامی خاتوو زین، ئەو گەرماوەی بە ناوی خاتوو زینی دۆستی مەمی ئالانەوە ناونراوە، گوایە هەر ژنێک بچێتە ئەوێ وەک خاتوو زین لەبەردڵان دەبێ، کوڕان لە شارانی دوورەوە شەیدای دەبن... هاهاهاها کە ئەمە لە درۆکانی مەملەکەتە. وەڵا لە حەمام هەر کەسە و لە ئاوازێ دەیخوێند، ئێمەیش خەریکی تریق و وڕ بووین، ئەمما دەڕوانین ژنێکی نازکبەدەنی جوانی، پەری شێوە دەگریە و دەناڵێنێ، کەنیزێک پشتی دەشوات و ئەویش بە دەست ڕاوەشاندنەوە قسە بۆ ژنێک دەکات و دیارە لە دەردێکی قووڵ خەمگینە. وەڵا مەستوورە کاریگەر بوو، دەموچاوی مات بوو، چووە پێش لێی وتی:
- ماشەڵا ناوی پەریت بیستووە؟
ژنەش وتی:
- ئەیچۆن.
وتی:
- ئەی بینیوتە؟
ژنە وتی:
- نەوەڵا.
مەستوورە وتی:
- دە تۆ پەری و حۆریت.



ژنە وتی:

- ڕۆڵە پەری چی و شتی چی، کە بەخت نەبوو، نییە، شەڵا دۆم بوومایە و پیاوەکەم خۆشی بویستمایە. هەموومان لە دەوری کۆبووبینەوە و من دەستم بە داهێنانی قژی کرد، مەرجان سپیاوی قەڵایی دا لە دەموچاوی، گەوهەر وەزەنی دەساوی لە قاچی، ئەویش حیکایەتی خۆی بۆ دەگێڕاینەوە. وەک لە زاری خۆیەوە بیستمان، ئەوپەری تیمساڵە، کە دوایی زانیمان ناوی (مینایە) حیکایەی وەهایە: وەختی خۆی لە شەڕی ناو بەگەکاندا پیاوێک دەکوژرێت، بە قەستی خوێنخۆشکردن، مینای گەردنبلور، دەدەن بە کوڕی یەکێک لە بەگەکان بە ناوی حەمید بەگ، میناش مینای چی ئەوەنە

شەنگ بوو، برای خۆی دڵی بۆی دەیزیراند، هەرچۆنێک بێت مینا شوو بەم پیاوە دەکات، بەڵام پیاوە هەر لە خۆیەوە بیانووی پێ ئەگرێت. هەفتەی یەکەم دەڵێت: تەڵاقت ئەدەم تۆ منالّت نابێت، باجی ئەجاوی میمکە جەمە دێین، بۆلای دەڵێت: ڕۆڵە بۆ خۆفی خوات لە دڵ نییە حەوت جار توخنی نەکەوتووی هێشتا ئەتەوێ کوڕە کوڕیەت بێ، لەسەر دەستێکم ئەگەر تۆ مانگی تر منالّی نەبوو، وەڵا دوای ماوەیەک سکی دەردەپەڕێ، ئەوسا بەهانەی پێ دەگرێت دەڵێت: کچ هەڵهێبێنی، واو وات لێ دەکەم و دەیترسێنێت، خودا ڕەحمی پێ دەکات کوڕی دەبێت. ئینجا بیانووی پێ دەگرێ دەڵێ تۆ زەعیفیت قەسەم بە خوا حەوت ژنت بەسەر دێنم. ژنەش لە ترسی هەڵوەشاندنەوەی خوێن ناوێرێ بتۆرێت و بڕوات، چونکە پیاوان بەر دەبنەوە یەک. بۆیە حاڵی ناحاڵە، ئەوە کوڕێکی بە بەرەوەیە دەڵێی مانگی چواردەیە. مەستوورە زۆر دڵتەنگ بوو وتی: خاتوو مینا خوا چارەسازە خەمت نەبێت، چاوێکی لە من داگرت تا کەنیزەکە مەشغوڵ کەم، ئەوسا چووە لای مینا خاتوونەوە وتی: دەڵێت چی تەمبێی کەم؟ خاتوو مینا دەڵێت: بەرازە بە هیچ تەمبێ نابێت، بە سەروەت و ماڵیەوە دەزانێ، بە ئاڵتوون و گەوهەرەوە ئەنازێ، ئەمن لە ماڵی خۆمان مەلیک بووم، ئێستا نان و سەگم ئەیاتێ. مەستوورە دەڵێت: ئەزانی چی بکە، شەڕێکی بچووکی پێ بفرۆشە، با بڵێ حەوت ژن ئەهێنم، ئەوسا دەلالّ ڕائەسپێرم کار حەل بکات. وەڵا خاتوو مینا کۆڵێک خەنی دەبێت، بزەیەک ئەیگرێ. کە لە خۆشوشتن بووینەوە و ماشەڵامان لێ بێت وەک خۆری شەبەقان دەدرەوشاینەوە. تەکبیرمان کرد هەق لەو حەمید بەگە بکەینەوە. مەستوورە ناردی بە شوێن دەلالّدا وتی: ئێمە حەوت کچین ئەمانەوێت شوو بە یەک پیاو بکەین بزانە شتی وا هەیە؟ دەلالّ وتی: باشە من پارەی خۆم وەرەگرم و بە پێی شەرع یەکێکتان بۆ ئەدۆزمەوە. دوای سێ ڕۆژ دەلالّ ناردی بە شوێن مەستوورەدا وتی: من حەمید بەگم بۆ دۆزیونەتەوە هەر حەوتتان لە خۆی مارە دەکات. بە پەلە پەیامامان بۆ خاتوو مینا نارد، بێت بۆ حەمام تا یەک ببینین بزانن مەسەلە چی بووە. وەڵا خاتوو مینا گێڕایەوە: نیوەڕۆ داوای قەل و قەرەخەرمانی کرد، منیش لە بری قەل قازم لێنا و نەمهێشت کەنیز بچن خۆم بۆم برد، تا سەرودڵی بگرم، وتم بەگم لێم تێکچووە لە بری قەل، قازم لێنا، بۆ وەهام نەوت ئاگری گرت و خواردنی بە سەرمدا پرژاندم و وتی: تۆ کەی ژنی؟ من ئەچم ژن دێنم. منیش وتم دەی برۆ پیاو نەبی ئەگەر نەیهێنی! وتی: ئەم سمێڵە بەری قەحپە بێ ئەگەر نەیهێنم. بە توورەیەوە چووە دەر، لەسەرا دەلالّ دەبینێت و دەڵێت: چییە بۆ وا توورەیی؟ ئەویش دەڵێت: لە ژنم نارازیم، سوێندم خواردووە حەوت ژنان بەسەر ژنمدا بێنم. دەلالّ دەڵێت: بۆ تیر لە دڵی ژنەت نادەی بە جارێ حەوت کچی نەوشکوفە ناهێنی، حەمید بەگ دەڵێت: جا کەی شتی واهەیە، ئەویش دەڵێت: سەد دینارم بەرێ، من بۆت جۆر دەکەم. سەد دینارەی دەداتێ و دەڵێت: تا سێ ڕۆژی تر تۆ ساحێبی حەوت ژنی.

کە مەسەلەی تەواو کرد دامانی هارەی پێکەنین و وتمان ئۆزۆ هەشت هەوێ. وەڵا حەمید بەگ ناردی بە شوێنماندا وتی مەسەلە چۆنە؟ مەستوورە وتی، ئێمە بەهارێ چوو بووین بۆ کنگر خودا لە لافاو ڕزگارمانی کرد، ویستمان لە چەم پەڕینەوە، هەر حەومان ئاوبردینی، لە تاو ڕۆحی خۆمان، نەزرمان کرد ئەگەر خوا نەمان کوژێ، بەڵێن بێ ببینە هەوێی یەک. حەمید بەگ وتی: بە چی ڕازین و چیتان دەوێت؟ مەستوورە وتی: ئێمە کچین و بوخچەی نەکراوەین، لە یەک ژوور ئیدارە دەکەین، ماڵ و سەرامان ناوێت، تەنێ یەکی هەزار لیرەی نەقد مارەییمان ئەوێت. حەمید بەگ وتی: زۆرە شتی وا نییە، مەستوورە وتی: ئاخر نەک یەکێکمانت حەز لێ نەمێنی، تەڵاقمان بدەیت. شەرعیش داوای هەق و هقوق دەکات. حەمید بەگ ڕازی بوو، ناردیان بە شوێن قازیدا و تۆمار ئیمزا و مۆر کرا، ئەگەر هەر کەسەمانی تەڵاق دا یەک کیسەی

هەزار لیرەییمان پێ بدات، ڕێکەوتین لە شەوی هەینییەوە هەر شەوەی بێتە لای یەکێکمان.
وەڵا عەزرت بکەم بەم شێوەیە حەمید بەگ لە تاو سینگ و بەرۆکی ئەم حەوت کچە ناسکە دەمی لیکی کردبوو، ئۆقرەی لەبەر هەڵگیرا بوو بۆ شەوی جومعە. مەستوورە؛ بۆ ئەوەی کەس نەیبینێ عەبای لە خۆیەوە پێچا، چوو بۆ لای موسایی سنەیی و وتی: سەد دینارت دەدەمێ توک و دوعایەکم بۆ بکە ئەو پیاوە خەجاڵەت بێت، موسایی وتی: بڕۆ، سێ سەعاتی تر بێرەوە. مەستوورە وتی: نا لێرە سەبر دەگرم. موسایی ناڵی کەر، کاژی ڕەشمار، دانی گورگی هێنا خستنیە کورەوە و پێکەوە تواندییەوە، ویردێکی بەسەردا خوێندن، پاشان هێلکەیەکی هێنا، کونێکی بچووکی تێکرد و ناوەکەی بۆش کرد، پڕی کرد لە گیراوەی سرکە و خۆڵەمیش، هێلکەکەی خستە ناو ئاگرەکەوە و کڵپەی کرد، سووتوویەکی زۆری لێ پەیدابوو، سووتووەی خستە ناو شووشەیەکەوە و دایە دەستمان. وتی: ئەو شەوەی حەمید بەگ ویستی بێتە لاتان، عەورەتان بە ڕۆنی گەرچەک چەور کەن و تۆزێک لەو سووتووەی لێ بساون و ئەرخەیان بن. مەستوورە سووتووەی وەرگرتبوو. بۆ شەوەکەشی حەوت ژنە چوونە ماڵ حەمید بەگ کە سەرایەکی گەورە بوو، یەکی لە ژووری دانراین، لەسەر سفرە وەک خوشک لەگەڵ مینا خاتوون پێکەوە دەبووین و قسەی خۆشمان دەکرد. شەوی یەکەم مەستوورە بۆ حەمید بەگ کرایە پەردەوە. مەستوورە نیوەڕووت بوو، بەگ ویستی خۆی بدات بەسەریدا، تەماشا دەکات سوبحانەڵا ئەم ئافرەتە هەر لە بنەڕەتەوە عەورەتی نییە و تەختاییە وەک بەری دەست، یەک دووجار سەیری دەکات و ڕەنگ دینێ و دەبات. وەڵا ئەنیشێتەوە و لەولاوە جێیەک بۆ خۆی دائەخات و بێدەنگ لێی کڕ دەکەوێت. ئەو شەوەی بە قەڕنێ لێ دەگوزرێت. بەیانی کە بۆ ناشتایی کۆ دەبنەوە، لەسەر سفرە بە سرتەوە پرسیاری لێ دەکەن، ئەویش دەڵێت: توخنم نەکەوتووە، پیاو نییە. ئەوانیش دەڵێن ئۆۆۆۆۆۆو... حەمید بەگ دەڵێت: ئەمشەو پیاو ئەبینی مەرجانێ...
شەوی دووەم دەچێتە کن مەرجانێ، عەینەن حاڵ و مەسەلە، دەبینێ خوار ناوکی وەک بەری دەستی ساف و لووسە، کونی نییە. هەر چەند تەماشا دەکات هیچ. وەڵا دیسانەوە فس ئەیاتەوە، لە دوورەوە جێ بۆ خۆی ڕادەخات و سرتە ناکات. بۆ سبەی مەرجانێ دەڵێت: شووی چی وەڵا ئەمە پیاو نییە... ئەویش دەڵێ بۆم بۆستە پەیکەرێ...
شەوی سێیەم دەچێتە وێژەی پەیکەرێ و دەبینێ ئەویش هیچ داوێنێ نییە و تەختە، وەڵا دیسانەوە لەولا دەخەوێ...
شەوی چوارەم دەچێتە گژ کاکوڵێ... دەبینێ ئەویش کونی نییە و کاکی بە کاکی دەشتە.
شەوی پێنجەم دەچێتە لای سوورمە و دەبینێ عەینەن تاس و عەینەن حەمامە.
شەوی شەشەم دەچێتە کاکوڵێ و وەهایە.
شەوی حەوتەم هاتە لای من، فەقیرە بە ترسەوە شەرواڵی پساند و دیتی منیش تەختاییە ڕستێ جنێوی دا، و لەولاوە خەوت. بۆ بەیانی وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت دەستمان بە پڵاو و گۆشت لێنان کرد، نانخواردن و میوانداریەک ڕێکخرا ئەوسەری نەبێتەوە، قاقامان ڕۆژەڕێیەک دەڕۆی. ئەویش تووڕە و تۆسن، خەریک بوو بۆ ژن شێت دەبوو، ڕووشی نەدەهات داوا لە مینا بکات. حەفتەیەک حاڵی وەهابوو، ئاخرییەکەی چووە لای مینا، وتی: مینا دانەیەکم بەرێ، مینا وتی: هەی ئابڕووت چێ، حەوت ژنت بەسەر هێناوم، ئینجا دەتەوێ من بتدەمێ؟ بڕۆ بۆ لای ئەوان. حەمید بەگیش دەڵێت: ئافرەت ژنی چی من تۆم ئەوێ، میناش دەڵێت: منی چی؟ بڕۆ تا ئابڕووم نەبردووی، ئەو ژنانەت مارە کردووە گوناحت دەگات بڕۆ لایان. ئەوسا حەمید بەگ زۆری بۆ دێت و دەڵێت: ئافرەت ئەمانە هیچیان کونیان نییە. مینا بە سینگی خۆیدا

ئەکێشێ و دەڵێت: خوا بتگرێت بوختان بۆ ئەمانەش دەکەیت. ئاوها چل شەو بێ هاوجێی دەناڵێ و ئەمانیش خەریکی پەخشان و تەخشانی ماڵن، کە حەمید دەبینێ لە سەر هەشت ژنیدا بێ ژنە، کەللەیی دەبێت و دەچێت دڵی خۆی لای قازی دەکاتەوە. قازی دەڵێت:

-چۆن شتی وا هەیە؟

ئەویش دەڵێت:

- قوربان وەڵا خوا شاهیدە وەهایە.

قازی دەڵێت:

- دەتوانی دەست بدەیت بە قورعاندا؟

ئەویش دەست بە قورعاندا دەدات. وەڵا قازی دەچێت باجی ئەجاو ڕادەسپێرێ تا بزانێ شتەکە چۆنە. ڕۆژی پێنج شەممە هەر هەشتمان بە دەم لەنجە و پێکەنینەوە چووینە حەمام، لەوێ باجی ئەجاو هاتە لامان، وتی: کچان دڵتان گەرد نەگرێ، قازی بۆ مەسەلەیەکی وا ناردوومی، ئێوە خۆتان بشۆن و منیش کاری خۆم دەکەم. ئێمەیش وتمان بۆ حەمید بەگ چی وتووە؟ باجی ئەجاو وتی: قەسەمی خواردووە هەر حەوتیانم مارە کردووە، کەچی عەورەتیان نییە! ئێمەیش دامانە هارەی پێکەین هاهاهاها، دوور لە ڕووی تۆ خۆمان دەپەڕاند و کێشامان پیایدا، وتمان ئەی ئەمە چییە؟ ناپیاوی وا، ئێمە حەیامان نەبردووە، ئەو قسان دەکات؟ کە پیاو نییە ژن ژنی لە چییە؟ بۆ ڕۆژی دووەم ئێمە لای قازی گلەمان کرد، وتمان دەستی بڕیوین، پیاو نییە، توخنمان نەکەوتەوە، دەبێت مارەییمان باتێ و تەلاقمان بات، ئێمە دەچین شوو دەکەینەوە. قازی هەردوولای ڕووبەڕوو کردەوە، ئەوسا وتی: باجی ئەجاو ئەم کچانە بیلامانێ عەورەتیان هەیە؟ باجی ئەجاو وتی: چل شاهید ئەهێنم کە ئەمانە عەورەتیان هەیە. قازی وتی: قوربان تۆ هەم سوێندی درۆت خوارد، هەم دەستت بڕین، فەرموو ئەوان بە پێی شەرع تەلاقیان دەوێت، سەرو هەزارە لیرەیان بدەرێ با بڕۆن.

حەمید بەگ سەری شۆڕ کرد، ناردی حەوت کیسە لیرە بێنن و سەری کیسە لیرەمان وەرگرت، یەکی لیرەیەکمان بە دیاری بە قازی بەخشی، لیرەیەکیش بە باجی ئەجاو. ئینجا دەڵاڵمان ڕاسپارد تەلارێکی شاهانەی بۆ کڕین و دامان بە مینا خان، وتمان: بچۆ ئەوێ تا قاچت ڕانەمووسێ و تۆبە نەکات نەچیتەوە ماڵی. حەمید بەگ هەم سەروەتی لە دەست دابوو، هەم ژنە و هەم حەیا، خەریک بوو شێت ئەبوو. ئینجا ئێمە پێنج سەد دینارمان دا بە مزگەوت بۆ فەقێیان و پێنج سەد دیناریش بۆ تەکیەی گەیلانی، ئەوی تریشمان دایەوە بە مینا خانم. دوایی مینا خانم وتی: سەربەقوربانە ئەوە چیتان کرد، ئێمەیش حاڵ و مەسەلەمان بۆ گێڕایەوە و دامانە هارەی پێکەنین، ئێستاش کە دەمانبینێ دەڵێت:

- ئەوە کونتان بۆ دروست نەبوو؟

ئێمەیش دەڵێن:

- جارێ نەوەڵا...

# شەوی بیست و شەش

خومار هەقایەتی خۆی نەقڵ کرد، با منیش بەزممان بە هەقایەتی خۆم خۆشترکەم. دەڵێن پێکەنین نایەڵێ بەشەر پیر بێت، پێکەنین خۆش بێ پیری حەدی چییە بێتە سۆراخمان. من ناوم مەرجانە بەسەرهاتی جارێکی تری خۆمان لە مەملەکەت دەگێڕمەوە. کەتنمان زۆرە، هەریەکەمان و چکۆلە کەتنێکی خۆمان دەگێڕینەوە.
لە مەملەکەت پیاوێک هەس ناوی ڕەزا ورچەیە، دیتووتە؟ قەت هێناوتەتە ناو حیکایەت؟ دەی موهیم نییە. پیاوێکی زلەی بێ مێشکی گەڵوگیپاڵ پانی قەڵەوە، پیاو بە بینینی دڵی توند دەبێت و ئەگوشرێت. ماوەیەک فێرببوو، خۆی سەرخۆش دەکرد و جنێوانی بە ژن و داک و خوشکی ئەوەی بە بەردەمیدا ڕەتبایە، دەدا. شێخ، مەلا و زاهید یان بازرگان، حەماڵ و شوان فەرقی نەبوو، قسەی ناخۆشی دەکرد. جارێک دارۆغە پێی وتبوو: ئەم کەچ ڕەفتارییەت لێ قەبوڵ ناکەم، ئەویش پلارێکی زۆر ناشرینی لە ژنی دارۆغە دابوو، کە دارۆغەی هار کردبوو و دارێکی دابوو بە سەریدا. ورچەش شکاتی بردبووە لای قازی، وتبووی من مەست بووم هەرچی بڵێم لەسەرم نییە، ئەو سەری منی تەقاندووە، دووبارەی بکاتەوە بە گرتی دەدەم. بۆیە دارۆغە ئیتر هەقی بەسەرییەوە نەبوو. جارێکی تریش یەک دوو جەوانی خوێنگەرم تێلاترێنیان کردبوو، بەڵام دەستبەردار نەئەبوو، لە عەسرەوە تا شەو جنێوی دەدا. ئەمە وەها ڕۆی، تا وردە وردە جنێوی فراوان بوو، نەعوزوبیلا ئەولیا و ئەنبای و خوا و پێغەمبەری گرتەوە. یەک دووجار مەلایان نەسیحەتیان کرد، فەقێیان پارەیان داپێی، بەڵام دوای ماوەیەک عەینی تاس و حەمام لە سەر شارێکان قنگی پان دەکردەوە، جوێنانی دەدا.
ڕۆژێک ئێمە هەر حەوتمان سەروبەستمان دانابوو، خۆمان ڕازاندبووە بەبێ عەبا و ڕۆبەند دەڕۆیشتین، بە پلپلە و لەرزانە و خەزێمی لووتەوە، بە ڕەوتی کەو و پۆڕ دەڕۆیشتین، وەڵا ڕەزا قن ورچ، کە زۆر مەست نەبوو، ئێمەی دی، کەوتە باسی پلوپوزمان، خۆی هەواڵە کرد و عەرز و ئاسمانی داگرت کە سەڵیتەی وەک ئێمەی خستۆتە شار، وتی ڕۆژی بە هەزار چوو بێت، دەبێت واو وامان لێ بکات. وەڵا گەنجان کۆبوونەوە و خوێنگرتنی دەستیان بە لێدانی کرد، گەوهەر، چووە پێشەوە وتی: وازی لێبێنن مەستە! کوڕان وازیان لێهێنا، ڕۆیشتین و ئەویش شێت ببوو بۆمان هەر سەیری سمت و کەفەلی دەکردین، یەع ئەو قن ورچە. هاهاهاها ماهپەیکەر هات، تەکبیری بۆ کردین، وتی: جەماعەت ڕاتان لێ هەیە بۆ کەتنێکی تازە؟ هەمووان پێکەوە وتمان یەڵا سەروەر بە. وتی: ڕاوەستن خۆم دەزانم چی لێ دەکەین، بەس تا سبەی شەو سەبرتان هەبێت.
ئەم ماهپەیکەرە حازرییە، هەستا عەبای دا بەسەریدا و چوو تۆپێک خامی سپی، تۆپێکی ڕەشی هێنا، دای بە گەوهەرە



وتی: برۆ بیدووره بە چوار دەست جلی سپی و سێی ڕەشی پانوپۆڕ و نیقابدار... ئینجا لەولاشەوە چوو، بۆلای عەولی ئاسنگەر، وتی مام عەول، نهێنییەکت لابێت سەد دینارت دەدەینێ، وتی: لە جێی خوشکمی من لە خزمەتدام، سەد دینارەی داپێی وتی: بیستووتە دوێنێ ڕەزا قن ورچ چی پێ وتووین؟ ئەویش سەرێک دائەخا و دەڵێت بێشەرەفی وا دەبێت بسووتێنرێت، ماهپەیکەریش دەڵێت نا، ئێمە دەزانین چی پێ ئەکەین، بەس تۆ کەمەربەندێک و قەفەزێکم بۆ هێنی دروست کە، کە بە قوفڵ داخرێت و هەقت نەبێت. ئەویش دەڵێت: وا دەستبەکار دەبم. ئینجا دەچێتە لای سڵێوە عیسا و دەڵێت: دەستم داوێنت ئەم عەسرە دەرمانی خەو بکە ناو شەرابەکەیەوە بڵێ لە بەردەرکە دانیشێت. ئینجا دەچێتەوە بۆ لای عەولی ئاسنگەر، سەیر دەکا، قەفەزێکی وەک قەفەزی تەیران لە شێوەی کەمەربەندا دروست کردووە، کە لە پێی

هەڵدەکێشرێت و دەرگەی دادەخرێت و کڵۆم دەدرێت.
ئەو ئێوارەیە ڕەزا قن ورچ دەچێتە مەیخانە و سڵێوە عیسا پێ دەڵێت: لە بەردەرگا بە، ئەمشەو خێری حەزرەتی مریەم شەراب بەخێر دەبەخشینەوە. ڕەزا قن ورچیش شەرابە دەخواتەوە قوم قوم و مەست دەبێت، وردە وردە لەگەڵ تاریکبوونی ڕۆژدا بۆی لار دەبێتەوە. ئینجا ئێمە عەرەبانەیەکمان هێنا، عەبایەکی ڕەشمان بەسەردا دا و بە هاریکاریی سڵێوە عیسا خستمانە سەری و بەرەو سەرقەبرانمان برد. لەوێ ماهپەیکەر شەرواڵەی قن ورچی دەرهێنا، یەع لە... گەلۆگوونە ڕەشە بۆگەنەی، لووتمان هەڵبەست و دەرپێ ئاسانینەی لە پێکرد، نەختێ گەزنەی کوتراوی بە هینیا ڕشت، دەرگای قوفڵ کرد و کلیلەی لە بن خۆڵکرد. پاشان سەتڵێک ئاوی بەسەرا ڕشت و هاتەوە هۆش خۆی، ئەمە لەناو گڵەکە ڕاکشێنراوە و ئەم لای سێ کەسی سەرتاپا ڕەشە ئەولای چوار کەسی سەرتاپا سپی. ڕەشەکان خۆمان دەنگ تووڕە و تۆسن نیشان دەدەین، سپییەکان نەرم و هێواش. ڕەشەکان وتیان: ڕەزا بەگ تۆ مردوویت، دێیت بۆ شاری ئێمە کە هیی شەیتانە یان نا... سپییەکان بە نەرمی دەیانوت: ڕەزا بەگ وەرە بۆ شاری ئێمە کە هیی مەیلائیکانە، ڕەزاش لە تاو گەزنە کە وەک تێزاب گیانی دابوویە خورووە خەریک بوو گڕی ئەگرت، نەیدەزانی سەیری کێ بکات، ئەمان وتیان هیی ئێمەیە و ئەوان وتیان هیی ئێمە. ڕەشەکان وتیان چونکە جنێوی باشی داوە ئەوە سەر بە ئێمەیە و دەیبەینە لای خۆمان. بە توندی پەلکێشمان کرد و بە توێی دەرپێیەکەوە ڕووت و قوت هەر لەوێدا خستمانە ناو چاڵێکی قوڕەخەستەوە و جێمان هێشت. وەڵا شەو بڵاوەمان لێکرد و بەیانی زوو هەستاین بزانین دەنگو چییە. دەبینین لە شار باس باسی ڕەزا قن ورچە. دەڵێن دیویانە بەو بەیانییەی ڕۆژی جومعە خەڵک چوون بۆ زیارەتی مردووان ئەو لەناو چاڵە قوڕێکدا هاواری کردووە، کەس لێی نەپرسیوە وتوویانە سەرخۆشە لێی گەڕێن، هەر هاواری کردووە مەست نییە و ناڵاندوویەتی بە هۆشە و بیکەن لەڕێی خوا ڕزگاری کەن وا ناوگەڵی سووتا، ئەوانیش وتوویانە جا بۆ ئەوەنە دەیکوتی بە داروبەردا هەر هیلاک دەبێت. لە تاو توندی دەرپێی ئاسنین و گەزنە ناڵاندوویەتی و بەساقەی خوا و پێغەمبەر و ئەولیا و قاچی هەمووان بووە، ئینجا دوو موریدی تەکێی گەیلانی دەریان هێناوە، بە گەڵەگەڵ و دەستی بەناو گەڵییەوە ڕادەکات دەچێتە حەمام، کە خۆی ڕووت دەکاتەوە، هەموو ئۆمەت موتەحەیر دەبن، ئەو قەفەزە چییە بۆ هینی دروستکردووە خۆ تەیر نییە بفڕێ! دەیکەنە گاڵتە و پێکەنین، دەڵێت سەد دینار دەدەم پێتان بۆم بکەنەوە خەریکە هینم دەتەقێ، ئەوانیش دەڵێن جا با بتەقێ... دوای بەزەییان پێدا دێنەوە دەڵێن بچۆ بۆ لای عەولی ئاسنگەر بۆت بکاتەوە. وەڵا بە گەڵەگەڵ دەچێتە بازاڕ منداڵەورتکە دوای دەکەون، لەوێ عەول دەڵێ دەرپێ داکەنە، ئەویش دەڵێت: بە بەرچاو ئەو خەڵکەی بازاڕاوە؟ عەول دەڵێت: ئەی تۆ لەم بازاڕەیا بۆ عالەمت نەدەنارد قەیدی چییە با موسافیرانیش ببینن. منالەورتکە و دەرودرواوسێ دوکان قاقا پێدەکەنن، عەولی ئاسنگەر دەڵێت با بزانی بە پێنج سەد دینار دەیکەمەوە، شاهید بن، ئەویش دەڵێت: باشە! عەول قەباڵەی پێ ئیمزا دەکات. ئەوسا بۆی دەکاتەوە. ئیتر ڕەزا قن ورچ برای بە بڕ عارەق بخواتەوە نەک هەر ئەوە بە ئیشی موهیمیش نەبووایە لەناو شار دەرنەدەکەوت. ئەوەش کاری ئێمە... هاهاهاهاهە.

# شەوی بیست و حەوت

ئەز گەوهەرم، فرە قسەسوێر نیم، بەڵام هەقایەتێک دەگێڕمەوە تا مەجلیسمان پڕ لە خواردن و شیرینی و قسەی خۆش و پێکەنین بێت.

دەڵێن کاتی زوو، لە مەملەکەتی کوردان، کچێکی ناسکی نەونەمامی نەشکوفتەی شیرین زمانی، عیلمبازی، فرەزان دەبێت، لە دە ساڵییەوە دڵی وا بەلای کوڕەباخەوانی ماڵی میرەوە، قەول دەدات بە کوڕە هەر بوو بە شانزە ساڵان خۆی لێ مارە ببڕێت، بەڵام ئێستا سەبری هەبێت. کوڕەش دەڵێت قەیدی چییە هیچ پەلەمان نییە نەرگزەکەم. کچی نازدار و نەشمیل و فرەزان هەر لە منداڵییەوە لەتەک باوکی کە بەخێوکەری هەنگە دەچێتە کێوان، جوانترین هەنگوینی مەملەکەت دێننەوە. هەمووجار کوپەیەک هەنگوین هەڵدەگرێ و دەچێت بۆ ماڵی میر، بەو عەیبارییەوە پەنجەیەک دەکات بە هەنگوینا و لە دەمی کوڕەی دڵداری دەکات، ئەوسا دەڵێت: بچۆ پێیان بڵی هەنگوینی نێو شاخانم بۆ هێناون لێم دەکڕن؟ ئەوانیش دەڵێن بیهێنە بزانین چییە، کە لێی دەخۆن دەبینن ئەو تامەی لەم هەنگوینەدایە مەگەر لە هەنگوینی وەعدەدراوی بەهەشت دابێت، بۆیە کچە بە نرخی دوو بەرابەر پێیان دەفرۆشێت، هەم خێر دەکات هەم پارەی دەبینێ. نەختێ دەسبازی دەکەن و کوڕە هەمەچەشن گوڵ دەدات بە کچە، وەک گوڵە بەیبوون بیکاتە ئاوی کوڵاو و دەموچاوی بەسەرا بگرێت، کاتێ سپیاوی قەلایی لێ دەدات. گوڵە مێخەک بۆ ناو جلەکانی بۆ بۆنخۆشی و گوڵە هێرۆ بۆ بەهێزی قژ و هەزار گوڵ بۆ گوڵاو و مرەبا. ساڵی چوار جار کچە وەها دەچێتە باخی میر و گوڵان دێنێت و هەنگوینان دەبات. تا ساڵ دێت و ساڵ دەڕوات کچە دەبێتە پانزە ساڵان. ئەوسا کوڕی میر نۆکەرێکی دەبێت کە چاوی لەسەر کچانی وڵاتە و کەسیانی لێ دەرناکات، لە بۆ میر خەریکی دەڵاڵیکردنە، بۆ کوڕە میریان دەنێتەوە و ئەویش دەڵێت: پێش شەوی زاوایی دەبێت بیکەنە کن من. نۆکەرە کاتێک ئەم کچە نەشمیل و جوانە چاوگردە چاودەکات، دەچێتە لای میرزادە و دەڵێت: قوربان بچۆ لە باخ بزانە چ گوڵێک دەبینیت؟ میرزادە دەچێتە باخی لالە و گوڵەنبەر، دەبینێ کچێک دانیشتووە دەڵێی پەڕەی گوڵە، بە بەرگێکی نەخشینی تاوس ئاساوە، ناز دەکات و باخەوان تاجەگوڵینەی بۆ دروست دەکات. لە ناکاو دەچێتە پێش، هەرتکیان لە ترساندا هەڵدەستن، میرزادە دەڵێت:

- ئەڵا ئەڵا ئەم بولبوول و گوڵانە لێرە هەن و ئێمە نەمانزانیوە، حەیف بۆ ئێمەیشتان بانگ نەکرد؟

تەماشای دەستی کوڕە دەکات و دەڵێت:

- ئەوە چییە؟

کوڕە لە ترسان دەیخاتە پشتی و دەڵێت:
- هیچ قوربان!
میرزادە لە دەستی دەگرێت و دەڵێت:
- ئەم تاجەگوڵینە بۆ شای پەریانە، دەبێت کوڕی شازادان بیکاتە سەری نەک گەدای وەک تۆ.
تاجە دەکاتە سەر سەری کچە و لا ملی رادەمووسێت، کوڕە لە داخدا تفێک رۆ دەکات و کچە سوور دەبێتەوە، میرزادە دەڕوات. کوڕە بە گریانەوە دەڵێت: هەرگیز جارێکی تر مەیە ئێرە، بێ شەرەفی وەک ئەو کوڕە نییە، ئەوە سڵ لە خوشکی خۆی ناکاتەوە، کچی مەملەکەت نییە کونی نەکردبێت، تازە بەدبەخت بووین و تۆی لێم سەند. کچە دەڵێت: من هیی تۆم، کەس ناتوانێ تۆم لێ وەربگرێت. زوو پێش ئەوەی ببمە شانزە ساڵان خوازبێنم کە و بمهێنە. کوڕە دەڵێت: ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت؟ نازانی هەفتەی پێشوو چی بەسەر دەزگیرانی کوڕەی شواندا هێنا؟ کچە دەڵێت: نا چی بووە؟ کوڕە دەڵێت، کچی جوتیار و کوڕی شوان وەک من و تۆ دڵ و دڵخواز دەبن، سێ ساڵ دەیانەوێت پێکەوە بن و لە ترسی میرزادە ناوێرن، چونکە بە نۆکەردا جوابی ناردبوو یان نابێت بیهێنێ، یان کە هێنات شەوی یەکەم بۆ منە. کوڕە و کچەش ئەوەندە یەکیان خۆشدەوێت، کچە ئەڵێت، مارەم بکە، ئەگەر بۆ یەکجاریش بێت با ئاوێزانی یەک بین، کوڕە هەرچەند دەڵێت: شتی وا نەبووە و نابێت، کچە دەڵێت: با بەو حەسرەتەوە نەمرین. ئەوسا مارەی دەبڕن و دەڵێن هەفتەیەکی تر دەیگوێزینەوە. پێش وادەی خۆی ئەو هەفتەیە شەوان دەچنە کن یەک و وەک ژن و مێردان بە یەکەوە رادەبوێرن. کاتێک دێتە سەر زەماوەند و بووک دەڕازێننەوە، نان دەخورێ و شایی دەکرێت، ماڵە بابانی هەردوولا بە دزییەوە خۆ دەڕنن و دەگریەن، چونکە دەبێت شەوی یەکەمینی کچەکەیان بۆ میرزادە بێت. کچە بۆ میرزادە دەبەنە پەردەوە، کاتێک میرزادە دەچێتە سۆراغی و دەبینێت بووە بە ژن، خەنجەرێک دێنێت و ناولەشی هەڵدەدڕێت، کچە گیانی دەردەچێت، ئەوسا دەڵێت ئەم قەحپە فڕێ بەن من و شوانیشی هەڵخەڵەتاندووە، ئەو ژنە! ئینجا شوانە ئەوە ئەبیستێ دەچێتە سەر خەرەندی شار و خۆی فڕێ دەدات و دەبێتە هەزار کوتەوە.
ئینجا کچە وتی:
- ئاخ چ ئێشێکت بە دڵم گەیاند، سوێند بە خوا نایەڵم بەسەر ئەم پیاوەوە بچێت. کوڕە وتی:
- گوڵەباخ واز بێنە با لە دووری یەک بسووتین باشترە وەک لەوەی ئابڕووی من بتکێ و تۆم لە دەست بچێت. یان وەرە با لەم مەملەکەتە بڕۆین. کچە وەڵامی دایەوە وتی:
- من شوێنی خۆم جێناهێڵم، دەست لە دڵخوازی خۆیشم بەر نادەم ئێستە دەڕۆم و سبەی دێمەوە.
سبەی گوڵە نەعنا و گوێزی تێکەڵ بە هەنگوین کرد و بردی بۆ میرزادە، میرزادە لە تاوا ئاگر بەربووە ناوگەڵی، نەیەزانی چی بکات، خوتەخوتەی بوو، کچە وتی: قوربان ئەم دیارییە ناچیزەیەم بۆ هێناویت، بەڵام ئەمەوێ عەرزێکت بکەم، میرزادە دەڵێت: داوای رۆح بکە، کچە دەڵێت: ئەو کوڕە حەزی لێمە و من تاقەتم لێی نییە، بەڵام ماڵی باوکم وەختی خۆی قەرزاری ماڵی ئەوان بوون، بۆیە ناتوانم دەستبەرداریم، ئەمن لە بری قەرز دراوم، چل شەوی تر من دەدرێم بەو، ئەگەر تۆ بتوانی فێڵێک بکەیت مەمنوونت ئەبم. میرزادە کە تەماشای مەمک و سک و پوزی کچە دەکات، شێت دەبێت، دەڵێت چی بکەم خودای جوانی؟ کچە ئێژێت: سەد دینار بدە بە کوڕە و بڵێ زوو ژنەکەت بێنە و بڕۆ ئەم مانگە ئیسراحەت کە، با زوو

مارەم کات و بمهێنێ. کە ئەوە سەری گرت تۆیش شەوی بووکێنی بنێرە بە شوێنمدا با بێمە لات، قەت قەت نەڕۆمەوە، کەنیزی خۆت بم. میرزادە پەنجە لە هەنگوین هەڵەکێشێ و سەری کچە دەکات و شێتانە ئەڵێت: بڕۆ باخەوانم بۆ دەنگ کە. کچە باخەوان گاز دەکات، دەڵێت: چی وت بە قسەی بکە ڕێی ڕزگاریم دۆزیوەتەوە. کوڕە دەچێتە لای میرزادە و دەڵێت: قوربان نۆکەرتم و لە خزمەتام، میرزادە دەڵێت: بڕۆ ئەوە دوو سەد دینار، گوناهە، ئەو کچە دوامەخە مارەی بکە و ئەم دوو مانگە ئیسراحەت کەن. کوڕە دەڵێت: قوربان باخەکە سیس دەبێت، میرزادە دەڵێت: بڕۆ گەوجە ئەو گوڵەی خۆت ئاو بە، ئەوسا دەست دەبات بۆ مێزەرەکەی و دایدەنێت و دەستی لێ دەخشێنێ.
تەدارەک ڕێ دەخرێت و گۆڤەند و زەماوەند ساز دەکرێت و بووک و زاوا ڕێ دەخرێن و ماڵە باوانی هەردوو لا دەیکەنە شێوەن و ڕۆڕۆ، کچەش قاقا پێدەکەنێ و ئەڵێت: خەمتان نەبێت من شایی خۆمە و لە دەستی نادەم و نامەوێ دڵتەنگ بم. شەوی مەقسود دێت، کچە کوپەڵەیەک هەنگوین و کوپەڵەیەک گوڵاو لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت و نۆکەری میرزادە دێت بووک دەبات. میرزادە وا لەوێ کەوا و سەڵتەی لێ داکەندووە، ئۆقرەی لێ بڕاوە، بە دەرپێیەکی سپییەوە دێ و دەچێ و نازانێ چی بکات. کاتێ کچە چاو دەکات، لیک بە دەمیدا شۆڕ دەبێتەوە و دەماری ملی هەڵەماسێ و تەمایەتی پەلاماری بات. کچە دەڵێت:
- سەبر سەبر میری میران، تۆ بۆستە هەزار ساڵمان هەیە و هیی یەکین، ئەم پەلە پەلە بۆچ؟ بۆستە!
ئەوجا لە نێوان دوو مەمکۆڵانیدا، شووشەیەکی چکۆڵە دەردێنێت، کە بۆنی هەزار گوڵە و دەیدات لەبەر سمێڵ و لا ملی میرزادە تا هێمن بێتەوە، ئەویش ئەوەنەی تر شەیدای دەبێت. پاشان دوو کوپەڵەکە دەردێنێت و لای جێگەکەیاندا دایدەنێت، دەڵێت:
- میرم خاتری منت چەند دەوێت؟
میر دەڵێت:
- ئەوە چ قسەیەکە، بەقەت دنیا!
- یەعنی بە قسەم دەکەیت؟
- کوێر بم بە قسەت نەکەم!
ئینجا نازدارە، دەڵێت:
- میرم وەرە، دەرپێکەت داکەنە و نزیک بەوە، میرزادە لە خۆشیاندا تڕ بە قنگیەوە ناوەستێت، جا دەڵێت:
- ئەوە دوو دیاریی من و ئەو گێلەی دەزگیرانمە، وەرە بۆ ئەوەی یەکسەر کوڕم بێت لێت، هێنت هەڵکێشە لەو کوپەڵە هەنگوینە با موبارەک بێت، شیفایە بۆ هەموو دەردێ!
میرزادەی گەلۆر، هێنی هەڵدەژەنێت لە کوپەڵۆچکە هەنگوین، دەیەوێ بیهێنێ، دەڵێت:
- نانا بۆستە فێڵمان لەو گێلە کردووە، با گوڵاوەکەی بەکار بێنێن، ئینجا هێنت بەو هەنگوینەوە هەڵکێشە لەو کوپە گوڵاوی هەزار چەشنە، با موبارەک بێت.
ئەوسا میرزادە هێنی هەنگویناوی هەڵەکێشێ لە کوپەڵۆچکەی گوڵاو و قیژەی دەگاتە عەرشی ئەعلا، هەموو کۆشک دێنە سەری، کچە ڕادەکات دەڵێت حەکیم بانگ کەن، حەکیم قاو کەن، میرزادە سووتا بەدبەخت بوو، حەکیم بانگ کەن!

تومەس ئەمە تێزاب و زوخاو بووە نەک گوڵاو، کچەش ئەوە فیڵەکەی بووە. حەکیم دێنن و کچە عەبا دەدات بە سەریدا لەو کەس بە کەسەی کۆشکا و لەگەڵ کوڕە بە دوو سەد دینارەوە هەڵێن بۆ شارێکی تر، کوڕی میریش بۆ خۆی هینی دەوەرێتە ناو بە مەعنا کوپە گوڵاوەوە، هاهاهاها...

# شەوی بیست و هەشت

مەستوورەم، شەش شەوە پێدەکەنین و قسەی شیرین و باسی نوکتە و کەتنی خۆمان و بێناموسی پیاوان باس دەکەین. ئەم شەو ئەمن ئەو حیکایەتە نەقڵ ئەکەم، کە ئێمەت بۆ برد. وەک هەمیشە حیکایەتی خۆت بوو، تاریک و نووتەک بوو. دەزانم تۆ ئیمانت بەو نەوعە حیکایەتانە نییە، کە ئێمە ئەم چەند شەوە دەمانگێڕایەوە، بەڵام خاترجەمم لەگەڵمان پێدەکەنیت تۆزقاڵێک بێتاقەتت بیر دەچووەوە، تۆ کوشتەی کۆست و شین و نەگەیشتنی، بۆیە ئەو حیکایەتەی هەر حەوتمانی تیابوو، قەت قەت بیرم ناچێتەوە.

هەفتەیەک دوای ئەوەی کەتنەکەمان بەسەر ڕەزا ورچەدا هێنا، تۆ هەرچی خۆشییە بیرت بردینەوە. ئێوارەیەک لەسەر پردەگاور بووین، قسە و باسمان بوو سەرمەدی قاسید هات، سڵاوێکی کرد و وتی: باش بوو پێکەوە بوون، خاتوون ناردوویەتی بە شوێنتاندا بۆ حیکایەتخانە، وەرن بۆ وێ. منیش ویستم تۆزێک بیدوێنم وتم:

- بە شەرتێ دێین، هەر حەوتمان پێکەوە سوار ئەسپەکەت بین!

ئەو وتی:

- تەنها جێی دوانتان دەبێتەوە.

- دە باشە پێنجمان سوار خۆت دەبین.

سەرمەد سوور سوور بووە وتی:

- ناکرێت!

وتم:

- دە باشە بەس خۆم سەرەکەوم!

ئەمانیش وتیان:

- هینە وەڵا نایکەن ئەی ئێمە؟

بوو بە مقۆمقۆ، ئەو سوار ئەسپەکەی بوو و تێی تەقاند. هەر حەوتمان بە دەم قسە و باسەوە بە سەر پردە و بەناو کوچەی خەراباتیاندا ڕۆیشتین تا تۆزێ کوڕان شیفتە بکەین و هاتینە حیکایەتخانە، تۆ ئێمەت خستەکار بۆ شاکارێکت؟ ها بۆچی؟ لە ڕاستیدا بۆ خەمێکی قوڵ، کە تا ماوەیەک کەسمان نەچووینە دەر و هەر بەڕاستی خەڵکی شار بیریان دەکردین، حیکایەتەکەت وەها بوو...

لە شارێک وەک هەریەک لە شارەکانی کابول، ئەربیل، کرماشان، قەندەهار، بایەزید، دیاربەکر، کوفە، تەورێز، کچێک بە ناوی خەزاڵی سەنگین، کچی بازرگانێکی پیری زەنگین دەبێت، بازرگانێک کە ئیدی خەریکی قورعانخوێندن و تەسبیحاتە، و دایکێکی نوورانی کە کاری چنینی بەرماڵ و سەجادەیە بۆ خێر. لە کۆشکۆکەیەکی ناو باخێکی گەورەدا دەژین. کچە خانێکی لە گۆشەیەکی باخەدا کردۆتەوە و خەریکی دروستکردنی حیکایەتە، خانەکەی دابەشکردووە بۆ سەرایەک و حەوت حوجرە، هەر حوجرەیەی حەوت تاقچەی هەیە و مۆڵگەی جۆرێک لە حیکایەتن. خەزاڵ حیکایەتی هەیە لە گیراوەیەکی عیرفانی و شەریعی دروستی دەکات، حیکایەتی هەیە پێویستی بە نوور و تاریکییە، یان دەبێت بە سووتاندنی ڕق لەناو لێبووردەییدا دروستی بکات، یان بە پرژاندنی میهرەبانی بەسەر دڵبەردا کاری خۆی بکات، حیکایەتیشی هەیە تەنها دەبێت بە ئەوین، بە ئەوینی خاڵس دروستی بکات. حیکایەتەکانی لە قاڵب دەدرێن و لە کورەدا سوور دەکرێنەوە، کە تەواو دەبن، لە سندووقێکی ئەڵقەڕێزی گەورەی سووری ڕەنگڕۆیشتوویان دەهاوێت. بەو شێوەیە بە دەم گۆرانی وتن و هەندێ جار گریان، هەندێ جار پێکەنینەوە حیکایەت ئەسازێ و هەندێ جار کە تووڕە دەبێت حیکایەتەکان ورد ورد دەکات و بە پێی لەسەریان هەڵدەبەزێتەوە تا نەمێنن. بەو شێوەیە ڕۆژگار دەباتە سەر. هەندێک ئێوارە دەچێتە شار بۆ هێنانی گیراوە، هەندێک شەو دەچێتە بەر تریفە بۆ کۆکردنەوەی مادە، زۆرجاریش لەبەر مزگەوت دەوەستێت و تەماشا دەکات تا بابەتی خۆی چنگ کەوێت. زۆر شوێن هەن سەری پێدا کروون، زۆر کۆهـ هەیە چووە، زۆر ڕووبار هەیە لێی پەڕیوەتەوە، زۆر دڕەندە هەیە چاوی بڕیوەتە چاوی، تا بزانێ حیکایەتەکانی چۆن دەتوانن سرک، یاخی، دەستەمۆ و کێوی، ماڵی، نەرم، تاریک، ڕووناک بن.

بەو شێوەیە ڕۆژ دێت و ڕۆژ دەڕوات. حیکایەت وەها دەبێت، شەوێک دزێکی کارامە بە قەستی دزینی بارە ئاوریشم و کەتان و گەوهەر و زێڕ ڕێی دەکەوێتە ماڵی پیرەبازرگان، بەڵام چەند دەکات دەرگاکانی بۆ ناکرێنەوە، چاو دەگێڕێت لەوسەری حەوشە خانێک چاودەکات، مۆمێکی کزی تیا دەسووتێت. بەرەو خانە دەچێت، هەر چەند دەڕوانێت تێناگات، پڕە لە کاغەزی لوولکراو و کوپەڵەی ڕەنگاوڕەنگ لەسەر دەیان تاقچە، بۆنی بوغورد لە ژوورەکە دێت، کورە تاز کوژاوەتەوە و قۆرییەک چایش جێماوە. دزە ئەمسەر دەگەڕێت، ئەوسەر دەگەڕێت هیچ نابینێت بۆ دزی کەڵکی هەبێت، دەیەوێت بچێتە دەرەوە، لە ناکاو لە گۆشەی دەستەچەپی سەرادا، سندووقێکی گەورەی ڕەنگڕۆیشتوو دەبینێت، بزەیەک دەکات، دەڵێت: خەزێنەی پیرەبازرگان لێرەیە، من دەبمە دەوڵەمەندترین کوڕی دنیا و شازادەی پێ دێنم! بەرەو سندووقە دەچێت، سەری هەڵدەداتەوە، سام دەیگرێت، دەبینێت پڕە لە بەستەپەڕەی جیا، لە شتی وەک تەم، ڕەنگاوڕەنگ، پڕە لە شتی وەک تۆپەڵە قوڕ، هەیانە کاغەزی ناسک و تەنکی سپی، هەیانە کاغەزی ئەستووری ڕەنگڕۆیشوو، هەیانە ڕەنگ زەرد، هەیانە چەرمی ناسک، هەشیانە تورت و توند. دزە سەری دەسووڕمێ، هەست بە سەرما دەکات، لەناو سندووقەوە شاڵاوی گەرمای بۆ دێت، سەدای گریان، ئاوازی بولبوول، خوڕەی باران، بۆنی پیس، بۆنی میسک؛ هەموو بە جارێک لە سندووقەوە دەردێن، دزە سەر لەمە دەر ناکات، بەڵام دەست بۆ بەستەیەکیان دەبات و دەیخاتە بن پشتوێنە حەوت قەفەکەی و بۆی دەردەچێت.

دزە دەچێتەوە ماڵەوە دەست دەداتە خوێندنەوەی بەستەکە، دەڕوانێت ئەمە حیکایەتە، بەوپەڕی تامەزۆرییەوە دەیخوێنێتەوە و سەرسام دەبێت، بڕیار دەدات سبەی شەویش بۆی بچێتەوە. هەمان کات و سات کوڕە دەچێتەوە سەر سندووقە

و دانەیەکی تر هەڵدەگرێت و بۆی دەردەچێت، دێتەوە ماڵ و دەیخوێنێتەوە و شەیدای دەبێت. دەڵێت ئەم دووانەی بۆ دادەنێمەوە، بەڵام سبەی سێ قلی تر دێنم. بەو شێوەیە دزە حیکایەتخوێندنەوە دەکاتە پیشەی خۆی، تا شەوێک ئۆقرەی لەبەر دەبڕێت و نەختێک زووتر خۆی بە خانەکەدا دەکات، خەزاڵ دەبینێت، لە ترساندا حەوت حیکایەتی لە دەست دەکەوێتە خوارەوە و تێکەڵی دەکات. خەزاڵ ئەوە دەبینێت هیچ خۆی تێک نادات، دەڵێت:

- ئێرە شوێنی نامەحرەم نییە، تکایە مەیە ئێرە! دزە خۆی دەدات بەسەر کەوشەکانیدا و دەڵێت:
- تکایە ڕێگەم بدە ئەوەی کردوومە بەردەوام بم، من بێ ئەمانە ژیانم تاڵە.

حیکایەتی خۆی بۆ خەزاڵ باس دەکات، دز بووە و لەو کاتەوە نزیکی بیست شەوە ئۆقرەی نییە، دزی بۆ ناکرێت و سەرقاڵی خوێندنەوەی حیکایەتە، خەزاڵ دەڵێت:

- باشە، بەڵام ڕێ دەستی من مەگرە!

بەو شێوەیە دزە هەموو شەوێک نەختێ زووتر دەچێت، خۆ لە حەوشە دادەگرێت و تەماشای خەزاڵ دەکات و دەگری، تا خەزاڵ دەڕوات ئینجا بۆ خۆی دەست بە خوێندنەوەی حیکایەتان دەکات، سپێدان چراکە دەکوژێنێتەوە و دەڕوات. ئەمە دەیان شەو بەردەوام دەبێت، تا کاتێک دزە هەموو حیکایەتەکان دەخوێنێتەوە، هەست دەکات ئیتر هیچی نەماوە لێرە وەری بگرێت، حەوت حیکایەت دەدزێت و تێدەتەقێنێ. خەزاڵ هەرگیزاوهەرگیز نایبینێتەوە.

ڕۆژێک لە دەرگا دەدرێت. خەزاڵ دەستی لە حیکایەتدایە، بە ئانیشک دەربیجە دەکاتەوە، دەبینێت نەقاشێکە، حیکایەتیکی پێیە دەڵێت:

- خاتوو خەزاڵ من حیکایەتیکی ئێوەم لای کتێبدارێک کڕیوە، ئەویش لە بازرگانێکی کڕیوە، دەمەوێت ڕێگەم بدەیت، وێنەی ئەو حیکایەتانە بکێشم!

خەزاڵ دەڵێت:

- ئێرە جێی نامەحرەم نییە!

بەڵام نەقاشە خۆی دەدات بەسەر کەوشەکانیدا و دەڵێت:

- تکایە ئەو حیکایەتانەت، ڕەنگ بە وێنەکانم دەدەن، ڕێگەم بدە!

ئەویش دەڵێت:

- باش، بەڵام بە مەرجێک ڕێ لە من نەگرت!

بەو شێوەیە نەقاش هەموو بەیانی تا ئێوارە دێت بە لای خەزاڵی سەنگینەوە دادەنیشێت ڕەنگ لە حیکایەتەکان وەردەگرێت و وێنەیان دەکێشێت. ڕۆژێک خەزاڵ ناتوانێت بێتە سەرای حیکایەت، بۆ ڕۆژی دووەمین دەبینێت سێ حیکایەتی ڕەنگی ڕەشیان بەسەردا ڕژاوە و بوون بە قەتران. نەقاشیش نەهاتووە، ئیتر نەقاش بەو شکڵە هەرگیز نەهاتەوە.

ڕۆژ هات و ڕۆژ چوو. نیوەڕۆیەک لە دەربیجە درا، خەزاڵ وتی:

- دەستم گیراوە وەرنە ژوور.

ئەمجا مەکتەبلییەک هاتە ژوور، وتی:

- خاتوون ڕێگەم بدە، ئەم حیکایەتانە ئەزبەر بکەم!

خەزاڵ وتی:
- ئێرە جێی نامەحرەم نییە!
کوڕە خۆی دا بەسەر کەوشەکانیدا، بە گریانەوە وتی:
- من دەبێت ئەمانە لەبەر بکەم، دەبیت یارمەتیی فکرم بدات.
جا خاتوون وتی:
- بەڵام ڕێ دەستی من مەگرە.
بەو جۆرە، گشت ڕۆژێک دەهات حیکایەتێکی لەبەر دەکرد و لەژێر چاوەوە تەماشای خەزاڵی دەکرد و دەگریا. بەیانییەک خەزاڵ چووە خان دیتی شەش حیکایەتی ناخوێنرێنەوە و ناشێ بزانرێت چی نووسراون و کوڕە بۆ هەتاهەتایە دیار نەما.
ڕۆژ هات و ڕۆژ چوو، عەسریک لە دەرگا درا، خەزاڵ وتی:
- وەرنە ژوور ئەمن دەستم گیراوە.
کاتێکی زانی کوڕێک هاتە ژوور بە کەوڵۆسێکی لبادی قوچەکی و جانتایەکی چەرمینی گەورە و سندووقێکەوە، حیکایەتێکی پێ بوو وتی:
- خاتوون هاتووم ڕێگەم بدەیت ئەم حیکایەتانە بنووسمەوە!
خەزاڵ وتی:
- ئێرە جێگەی نامەحرەم نییە!
کوڕە دەستی هاورد بە پێڵاوەکانی خەزاڵدا، وتی:
- خاکی ژێرپێتم، بیهڵە بیان نووسمەوە!
خەزاڵ وتی:
- بەڵام نابێت ڕێ لە من بگریت.
ئینجا هەموو ڕۆژێک خەتخۆشە دەهات، سپێدان تا شێوان حیکایەتی بە خەتی جۆراوجۆر دەنووسییەوە. تا ئەویش بەیانییەک دیار نەما، دوای ئەوەی خەزاڵ دی نۆ حیکایەتی بوون بە مشتێک وشەی هەڵرژاو، ئیدی نە حیکایەتە نە قسە، کەڵکیان نەماوە.
بەم شێوەیە دەهاتن و دەچوون، ڕۆژێک لە دەرگا درا خەزاڵ وتی:
- فەرموون.
پیاوێکی میانەساڵ بە عودێکەوە هاتە ژوور، حیکایەتێکی پێ بوو، وتی:
- خاتوون هاتووم حیکایەتەکانت بکەم بە ئاواز!
خەزاڵ وتی:
- ئێرە جێی نامەحرەم نییە!
پیاوە خۆی دا بەسەر قاچی خەزاڵدا، وتی:
- تکایە ڕێم بدە، تکایە ئەز بێ ئەو حیکایەتانە ژیانم دۆزەخە!

خەزاڵ وتی:
- بەڵام ڕێ دەستی من مەگرە!
عودژەن هەموو ڕۆژێک بەرەبەیان تا ئێوارێ دەهات و حیکایەتی بە ئاواز دەکرد. تا ئەویش ڕۆژێک بۆ هەمیشە ونبوو، لەتەک خۆیشیدا، پێنج حیکایەتی مەحف کردەوە، کە تەنها گەردێک لە شوێنەکەیان جێ مابوو.
مانگ هات و مانگ چوو، جارێک لە دەرگا درا، پیاوێکی قەڵەمی بوو، سێ حیکایەتی پێ بوو، وتی:
- خاتوون ڕێگەم بدە حیکایەتەکانت بگۆڕمە سەر زمانی سەما، من ئەکرۆباتم و دەمەوێ بە ڕیتمی ئەوان بجووڵێم!
خەزاڵ وتی:
- ئێرە جێی نامەحرەم نییە!
کوڕەی خۆی دا بەسەر کەوشەکانیدا و وتی:
- مەیەڵە بکەومە خوار من لە لێوارم، بێ ئەو حەکایەتانە ناژیم و بەر دەبمەوە.
خەزاڵ وتی:
- باشە، بەڵام ڕێدەستم مەگرە و لە گۆشەیەک کاری خۆت بکە.
جا پیاوەی باریک ئەندام سپێدان تا شێوان، بە ڕیتمی حیکایەتان لەسەر پەتێک بازی دەدا و سەمای دەکرد، تا بەیانییەک ئەویش بۆ هەمیشە ونبوو نەهاتەوە، لەگەڵ خۆیشی سێ حیکایەتی بێ وشە کرد، چونکە پەڕەکان فێری سەر تەناف بوون و وشەکانیان هەڵڕشتبوو. ساڵ و هات و ساڵ چوو. ئەم جارە پیاوێکی بازرگان هاتە ژوور. حیکایەتێکی لە پارچەیەک ئاوریشم پێچابوو، وتی:
- خاتوو خەزاڵ ئەمە هیی تۆیە، هاتووم لەم جۆرە حەکایەتانە ببەمە دەر و بیفرۆشم.
خەزاڵ وتی:
- هیچی وایان نەماوە هاتن و تاڵانیان کرد!
بازرگانەکە وتی:
- ئەوەی ماوە بمدەرێ، من دەیاندۆزمەوە و چاکیان دەکەمەوە.
خەزاڵ حیکایەتەکانی فرۆشت و خانەکەی داخست. چووە لای دایکی وتی: لەمە بە دوا دەگەڕێم، هەموو ماڵ و مزگەوتێکی شار سەرو بەرماڵیان دەدەمێ، چونکە ساڵانێک بوو بەرماڵە دەستچنەکانی لە دایکی وەرگرتبوو، بیری نەبوو بیان گەیەنێت، لە ژوورێک هەڵی چنینی بوون. خەزاڵ دەستێک جلی ڕەشی پۆشی و هەورییەکی بەستە ناوچاوی تورەکەیەکی گەورەی کردە کۆڵی، ماڵ بە ماڵ و مزگەوت بە مزگەوت سوجادەی دەبەخشی. کولبەی هەژار، ماڵی دەوڵەمەند، نەدار و دارا، بەگ و کوێخا شا و گەدا، جوو و مەسیح و موسوڵمان. ڕۆژێک ڕۆی ڕۆی گەیشتە دوا ماڵی کۆڵانێکی بنبەست، ماڵەکە حەوت قات بوو، بۆنی گوڵ و شەرابی لێ دەهات، بە حەوت ڕەنگ جیلوەی دەکرد، ڕازاوە بوو بە چراخان و ئینجانەی پڕ لە گوڵی وەنەوشەیی، لە دەرگەی دا، وتی:
- چەند ماڵێ خوشکێ؟
کچێکی شیرین زمانی نیمچەڕووت، وتی:

- ناوساجی خێرت بۆ هێناوین؟ ئێمه حەوتماڵین.
خەزاڵ وتی:
- نا بەرماڵم بۆ هێناون.
کچه قاقا پێکەنی و سەرێکی بردە ژوور و وتی:
- گوڵینە وەرن، یەکێک هاتووە بەرماڵی بۆ هێناوین!
هەموویان لە قاقای پێکەنینیان دا، لە ژوورەوە دوو کوڕ کە ئەمیان چاوکرد، بەرەو کۆشکی سەروو هەڵاتن. گوڵان وتیان ئەمە بۆ مەزاق خۆشە، با بانگی بکەین. جا وتیان وەرە ژوور. خەزاڵ بۆنی شتێکی دەکرد، خەزاڵ دڵی کەوتبووە پەلە پەل، خەزاڵ حاڵی گۆڕا. گورج کە دییان حاڵی وەهایە یەکێک لە کچەکان بە ناوی گوڵخەندەران، گیراوەیەکی گوڵاو و دارچین و نەباتی هێنا و کردی بە دەمیەوە. کاتێک خەزاڵ هۆشی هاتەوە لەسەر تاقچەیەک حیکایەتێکی خۆی دی، ڕەنگی وەنەوشەیی و بۆنی موحیبەتی لێ دەهات. خەزاڵ وتی:
- بەرماڵم لێ وەرگرن!
کچان وتیان:
- ئێرە ماڵی سۆزانیانە و نوێژکەران قیبلەیان ئێمەیە و ئێمەیش نوێژ ناکەین.
خەزاڵی سەنگین وتی:
- خێری دایکمە وەری گرن، خوا پشت لە عەبدی خۆی ناکات.
کچان دەورەیان دا، کردیانە قسە و ژاوەژاو، ئەو کچەیان لا دڵگیربوو، پرسیاری حاڵی خۆیان لێ کرد، وتیان:
- حیکایەتی خۆت بگێڕەوە، ئێمە شەیدای حکایەتین.
خەزال وتی:
- ئێوە حیکایەتی خۆتان باس بکەن!
هەر حەوتیان کە ئێمە بووین، پێکەنین و وتمان: تا ئێستا کەس حیکایەتی ئێمەی نەبیستووە، تەنها حیکایەتی خەڵک دەبیستین.
خەزاڵ وتی:
- ئەگەر حیکایەتی خۆتان وەگێڕنەوە، قەسەم بە کەلامی قەدیم، ئەمنیش حیکایەتتان بۆ دەگێڕمەوە.
ئینجا کچێکی یەخە ڕووتی لێو ئەستووری گوارەشۆڕ وتی:
- حیکایەتی ئێمە درێژە. خەزاڵ وتی:
- درێژ، کورت دەکرێتەوە، بۆم باس کەن.
کچە دەستی کرد بە حیکایەتەکە:
ئێمە حەوت خوشکی نەفرەتلێکراوین، بە ناوەکانی گوڵخەندەران، گوڵعوزار، گوڵبەهار، گوڵبەدەم، گوڵعەنبەر، گوڵئەندام، گوڵقەمەر. هەرگیز خوازبێنیکەرمان نەبوو، نەک لەبەر ئەوەی جوان یان زەنگین نەبووین، بەڵکو لەبەر ئەوەی پیاوانی مەملەکەتی ئێمە تەنها حەزیان لە سۆزانییەکان بوو، قەت قەت ژنیان نەدەهێنا و شەوانیان لە باوەشی ئەوان ڕۆژیان

دەکردەوە، بۆیە قەرار درا لەگەڵ دایک و باوکمان بچین بۆ حەج، قافڵە خرایە ڕێ. لە ڕێ حەوت چەتە هاتە ڕێمان، دایک و باوکمانیان گۆشاوگۆش سەربڕی و ماڵیان بە غارەت بردین، ئێمەیان بە کەنیز گرت، بردینیانە خانێک و یەکی دانەیەکیان داگیر کردین و وایان لێکردین، ڕایان بوارد لەگەڵمان تا مربوون، جا لە هیلاکیدا خەویان لێکەوت. خوشکی شێرئاسامان گوڵقەمەر بە چرپە هەستا، ئیشارەی کردین، وتی:

- هەریەکە و خەنجەری بەر ورگی چەتە دەربێنێت، کە وتم سێ بیچەقێننە بەر دڵیان.

وەڵا بە تەکبیری گوڵقەمەر وەهامان کرد و بە جارێک خوێن بەسەر و چاوماندا فیچقەی کرد. ئینجا هەرحەوتمان بە گریانەوە باوەشمان پە یەکدا کرد. چی ماڵ و سامانی چەتەکان بوو هەڵمان گرت و چووینەوە بۆ ئەو مەنزڵەی دایک و باوکمان سەریان بڕابوو، ناشتمانن و دوعا و فایحامان خوێند و ڕوومان کردە ئەم شارە. گورج بە پارەی چەتەکان، ئەم ماڵەمان کڕی، وتمان هەر کەس حیکایەتمان بۆ بگێڕێتەوە و شەوی پەنجا دینار بدات، بۆی هەیە لەگەڵمان بخەوێت. بەو شێوەیە هەرچی پیاوی شارە کردماننە خۆمان، دەمانەوێت ڕۆژێک واز لەم کارە بێنین و بچینە تەواف، ئەگەر یەزدانی دلۆڤان قبوڵمان بکات. ئەگەر لە وەتەنی خۆمان شوومان بکردایە وەهامان لێ نەدەهات، پیاوان هەمیشە حەزیان لە ژنێکە سۆزانی بێت، نەک ژنانی نەجیب و باش. ئێمە پیاوی عاشقی سووتاومان لە مەحبووبی خۆی کردووە و دوای تفی کردۆتە ناوچاوی وتوویەتی تۆ چیت من تۆم ویستووە؟ ئێمە وەهامان کردووە مەلا لە مزگەوت، حاجی لە حەج، شێخ لە تەکیە، بکەین و بێن لەناو لەشی ئێمەیا بەهەشت ببینن. زۆرێک لە پیاوانی ژندار دێن و بە قوربانی ئێمە دەبن، عاشقە شەرمنە درۆزنەکان لە باوەشی ئێمە هیچیان بیر نامێنێت. قەولمان کردووە شوو بە پیاوێک بکەین، کە ناولەشی ئێمە شێتی نەکات، کە حەزی لە ماڵی سۆزانیان نەبێت، تا ئێستا شتی وامان نەدیتووە.

جارێک عاشقێکی پەتیارە ڕووی کرد ئێرە، برادەرێکی هێنابووی تا هۆشی بێتەوەبەر، عاشقە کوڕێکی ڕەنگ ڕەشداگەڕاوی چاوسوورەوەبووی نەوجەوان بوو، هەفتەیەک، یەک بتوونە لە بان یەک بۆ ئەو کچەی دڵی بردبوو گریا بوو. سوێندی خواردبوو ئەگەر کچە مەیلی پێنەدات، بە تەور کەللەی خۆی بکات بە دوو کەرتەوە. سێ ڕۆژ بوو مانی لە خواردن گرتبوو، دەیوت خودا یەک کچی دروست کردووە، ئەویش کچی ماسیگرەیە، مەقسوی لە باوکی بوو. برادەرە وتبووی بابچین بۆ ئەوێ بەس تۆزێک دەمت تەڕکە و دێینەوە. بە هەزار فێڵ و تەڵەکە هێنابووی. وەختێک هات، فەقیرە جەرگی کون کون بوو، هەر بەڕاست بۆنی خوێن و پشکۆ و خۆڵەمێش لە جەستە و ڕۆحییەوە بەرز دەبووەوە. گوڵخەندەران کاسەیەک شەرابی کرد بە دەمیەوە. وتی:

- براکەم ئیسراحەت کە، خۆتت خۆشبوێت لەناو جامەکە بڕوانە، ئەها خۆتت کردووە بە پیرەمێردی چل ساڵە. گوڵبەهار هات، وتی:

- وای... هەموو تەمەنم شەیدای کوڕی وەک تۆ بووم! گوڵعەنبەر لەنجەیەکی کرد:

- خۆزگە یەک جار منت خۆشدەویست. گوڵعوزار وتی:

- وەی وەی بمرم کە تا ئێستا پیاوێکی وەک تۆ منی نەویستووە، حەیرانم. گوڵئەندام وتی:

- جەستەم هەڵوەرێ کە مەردێکی وەک تۆ نەیلاوێنێ.

بە دەم شەرابخواردنەوە وە کوڕەمەست بوو، دامانە دەست گوڵقەمەر، وای وای، کوڕە چی لێنەهات، بە یەک هەفتە

شێت و هار بوو، لەبەر ئەوەی وێران بوو خاترمان گرت، وتمان شەوی حیکایەتێکمان بۆ بگێڕەوە، ئینجا ئەو هەموو شەوێک حیکایەتێکی دەهێنا و بۆی باس دەکردین. خاتوون ئاخر کەس وەک سۆزانییەکان حیکایەتیان حەز لێ نییە، پێش ئەوەی ئەندامی پیاوە بچێ بە لەشیاندا حەزیان لەوەیە ژیان بچێ بە ڕۆحیاندا، خەیاڵ بچێ بە زەینیاندا. ئیتر کوڕە ئێستە موشتەری ئێمەیە، تۆی چاوکرد بە شەرمان ڕایکردە ژوورەوە.

بەو شێوەیە ئێمە پیاوی مەملەکەت نەماوە، لە دینمان وەرنەگەڕاندبێت، لە خشتەمان نەبردبێت، ناوی کێ دەڵێیت بۆت باس دەکەین حیکایەتی چۆنە، بەڵام بری ئەوە ئێمە بە نەفەسی ئەو حەقایەتانەی کە پیاوەکان بۆمان دەهێنن دەژین. قاقایەکی لێدا و کچان پێکەنین. کچان دەستیان هێنا بە زوڵفی خەزاڵدا وتیان:

- ناوت چییە؟ حیکایەتت چلۆنە؟ چ دەکەی؟ ئەم خێرە لە پای چی و بۆ کێ دەکەی؟ بۆمان باس کە؟ سوێند بە خوا وەک خوشکی خۆمان چوویتە دڵمان و خۆشمان دەوێیت. خەزاڵ، وتی:

- من حیکایەتێکی وەهام نییە بیگێڕمەوە ئێوە نەیزانن، خەزاڵم، حیکایەتسازی مەملەکەت بووم، پیاوان حیکایەتەکانیان لێ دزیم بۆ ئەوەی لەگەڵ ئێوە بخەون!

ئەوکات هەر حەوت گوڵ، بۆنیان کرد و تەماشای دەستیان کرد، نەعرەتەیەکیان کێشا، سینگی خۆیان دادڕی و وتیان بڕوانە بە هەموومان چ حیکایەتێکی تاریکمان دووری. خەزاڵ حەوت بەرماڵی بۆ دەرهێنان و دەستی کردەوە بە گەڕانی ماڵەوماڵ...

دەزانی، خاتوو شەهرەزاد بەم حیکایەتە هەقی شەش شەوی پێشووت لێ کردینەوە؟ دەزانی منیش ویستم بەو تاریکییە خۆشی شەوانی کۆنت بیر بەرمەوە. ئێمەت بردە ئەو حیکایەتەوە و کردتین بە حەوت گوڵی سەیری بەو ئیقباڵی قوڕبەسەر، بە ناوی گوڵخەندەران، گوڵعوزار، گوڵبەهار، گوڵبەدەم، گوڵعەنبەر، گوڵئەندام گوڵقەمەر، بەرامبەر ئێمەیش کچێک کە تا ئەو کاتە و پێش حیکایەت ئێمە ڕقمان لێ بوو، گەلۆرێکی زلە و زرت، زۆر کەس خۆشیان دەویست و زۆر کەس ڕێزیان دەگرت و کەسانێکیش هەبوون دڵیان پێی تەنگ دەبوو، دەزانی کێ دەڵێم؟ ڕووباب کە لەو حیکایەتەدا خەزاڵ بوو، تەواو خەزاڵ خۆی بوو، کە حیکایەت تەواو بوو، لە حیکایەتخانە باوەشمان بە یەکدا کرد و گریاین، زۆر زۆر گریاین، وابزانم کەسمان تا یەک هەفتە نەهاتینە دەر لە ماڵ...

# شەوی بیست و نۆ

مەداحی تەکیەم و ناوم میحرابەدینی جەورکێشە، ساڵانێکی زوو بەر لەوەی بکەومە ئێرە، لە هەمەدان موریدی تەکیەی جەلالی بووم. دەمویست بگەمە مەستی، لە خەیاڵ و زەینمدا پیرانی تەریقەت ببینم، نووری خودام دەستکەوێت، بۆیە سیگارم دەکێشا و بۆنی گیام دەکرد، تا مەست دەبووم، ئەوەی لە ئاگاییدا نەمدەدی، لە مەستیدا بە خەیاڵ دەمدی. ئیدی هێند وابەستەی ئەو خەیاڵە بووم، ڕۆژ بە ڕۆژ گیای زیاترم بۆن دەکرد تا ئیدی چوارپەلیان گرتم و لە تەکیە هەڵیاندامە دەرەوە. چەند جارێکی تر وەهام کردبوو، دەرکرابووم و وتبوویان تاکونێ واز نەهێنێت ناتخەینەوە ناو بازنەی موریدان، من تۆبەم کردبوو، بەڵام دیسانەوە شەیدایانە دەستم پێکردبووەوە. تا ئەو جارەی ئیدی دەرکی ئەستوورەکەی تەکیەم بە ڕوو داخرا، وتیان هەرگیز دەرگای ئێرە پیس نەکەیت، ئێمە بە موریدان دەڵێین زۆر بە کەمی گیا بۆن بکەن نەبێتە لادان، بەڵام زیادەڕەوی تۆ موریدانی فێر کردووە و ناوی تەکیەی پیس کردووە. بەو شێوەیە لەوبەر دەرگای زۆر گەورەی تەکیەوە فەرووەکەمم داخست، لە سەرچۆک دانیشتم و دامە پرمەی گریە، بە جۆرێک نائومێد و دڵڕەنجاو بووم، بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت گریانم بە هەموو دەنگێک ئەزموون دەکرد، یەکەمجار بە دەنگی گڕ، دوای بە دەنگی نەرم، وەک لوورەی گورگ وەک کرووزانەوەی پشیلە و ئیتر لە قوڵپی گریانەوە و چوومە تکەوە. لە ناکاو پیرێکی ڕیش سپی نووریینی چەماوە، خۆی بەسەر گۆچانێکدا دابوو، کەشکۆڵێکی بە شانەوە بوو، لە دەروێشی سەمەرقەندی دەچوو، کە زۆرجار موریدان بۆیە دەیان ویست مەست بن تا ئەو ببینن، ئەو ڕەمزی ئەولیایان و ئەنبیایان بوو. هاتە بەردەمم وتی: ڕۆڵە دڵم تەنگە، تۆ ئەو دەنگە خۆشەت هەیە، بمکە گریان، دەستی برد لە کەشکۆڵەکەی شیعرێکی نالی شارەزووری دەرهێنا و وتی: بیڵێ بەو دەنگە! ئەگەر بتوانی بمخەیتە گریان، ئەوە دەکەوێتە پێکەنین. موستەزادێکی پێمدا، چاوێکم پێدا گێڕا سوبحانەڵا لە خواییەوە ئەزبەرم کرد دەیوت:

ئەی تازە جەوان! پیرم و ئـوفتادە و کـەوتوم
تا ماوە حەیاتم
دەستێ بدەرە دەستی شکستەم، کە بەسەرچووم
قوربانی وەفاتم
تۆ یوسفی نەوحوسنی لەسەر میصری جینانی
من پیرم و فانی
لەم کولبەیی ئەحزانە نە زیندووم و نە مردوم
هەروا بە تەماتم
فەرقێکی نەکرد نەفسی نەفیسم بە عینایەت
وەحشی لە ویلایەت
لـەم گۆشەی وێرانەیە هەر مامەوە وەک بـوم
وەیشوومی وڵاتم

من چاوم داخستبوو، لە دڵەوە شیعرەکەم دەوتەوە، فرمێسک بە چاوی دەروێشەدا کە هەستم دەکرد دەروێشەی سەمەرقەندی بێت هاتە خوار، کە ئەوم دی دیسانەوە چاوم داخستەوە بە هێزێکی سەیرەوە ئەو شیعرەم دەوت. بۆ پیریی دەروێش، بۆ جحێڵی و جەوانی بە بادراوی خۆم، بۆ دەرکردن و نەمان، من شیعرم دەوت و فرمێسک بە چاوانما قەتارەی بەست بوو، ئەلالامەوە هۆشم بە خۆم نەبوو. نازانم چەندێ ئەو شیعرە و چەندان شیعری ترم وت، لە تەکیە و لە سەردەمی حوجرەیا بیستبووم، بەڵام هەستم بە سووڕانەوەی کەون بە دەورمدا، ڕاکشانی زەوی لەبەردەممدا، هەڵواسینی ئاسمان بەسەرمدا دەکرد. هەستم بە ڕاکشان دەکرد لەناو ئاوریشمێکی نەرما، هەستم بە بۆنێکی ئەهوەن دەکرد، هەستم بە نەسیمێکی خۆش و تامێکی شیرین دەکرد لە دەمدا، کاتێک چاوم کردەوە، دیتم شێخ و خەلیفان و موریدان لە تەکیە هاتوونەتە دەر بازنەئاسا دەوریان لێداوم و دەگرین، گریانێکی بە کوڵ، چەند دەروێشێک کڵاو و مێزەریان لێ کەوتووە و پرچیان بڵاوبۆتەوە بەسەر شانیان و بە ڕیتمی غەزەلەکانم حاڵ گرتوونی. هەستم کرد ئەوە یەکەمین مەستی حەقیقی بووە وا چەشتم. حاڵی بووم دەروێشی سەمەرقەندی گەیشتە دادم و دەنگی منی دۆزییەوە، دەنگێک کە دەنگی دەرکردن و هاواری من بوو بۆ موریدان، کاتێک دەستیان گرتم بمبەنە ژوور، وتم نایەم، دووری ئێوە و دەرکردنتان ئەو لەزەتەی پێدام، ئەگەر بێمەوە لەزەتەکەم لە دەست دەچێ و مەستیم ون دەبێت، بیەڵن بڕۆم کۆبەکۆ و دەربەدەر، ئەزبەر غەزلان بڵێم و بگریەم. دەستم بە داوێنی شێخەوە گرت، ئەویش مێزەرەکەی خۆیی داکەند و نایە سەرم، وتی بڕۆ نەغمەی خەمبار لە دەنگت نەبڕێت، بوو بە شیوەن و گریە و زار، من ڕێگای دەشتودەرم گرتەبەر.
نازانم چەندان ڕۆژ و چەندان شەو مەستانە دەمچری، شوانان لە کێوان لەگەڵم گریان، جوتیاران لە مەزرا لە کار وەستان، گورگان پەشیمان دەبوونەوە و پڵنگان ڕادەمان. ڕۆیشتم کاتێکم زانی گەیشتوومەتە مەملەکەتێک نازانم کوێیە، وتم ئەمەش خەیاڵی ناو مەستییە بۆیە نەوەستام لە قەسیدە و مەدیحە و گریە، دەڕوانم بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت، لە بن

دارتوویەکی ئەستووردا دانیشتووم و شێخ بە ڕەحمەت بێت، بە دەستی پیرۆزی خۆی کاسەیەک هەڵوا و کولێرەیەکی بۆ داناوم، وتی: ئەی تازە جەوان باش گەیشتی، منیش لەو دەنگە چاوم هەڵبڕی، تەماشا دەکەم سەدان دەروێش بە دیارمەوە وەستاون، ڕۆندکیان ئەسرن و یەکی بزەیەکیش لەسەر لێویانە، دەروێشی باریک و ڕەنگ زەرد و سەرتاپا سپی. ئیتر حەڵوام خوارد و بوومە مەداحی تەکیەی گەیلانی.

ساڵانێکە لەوێم و شادم، کە مەست دەبم، لەزەت وەرەگرم، ساڵانێکە هەم قورئانخوێن هەم مەداحی تەکیەم. شێخ ناردمی بۆ خزمەت مەلا نجومی دەربەند فەقەرە، وتی: ئەمە کوڕی منە، فێری تەجوید و قورئانخوێنی کەن، هەڵبەت ئەگەر دەنگیتان بە دڵ بوو!

چوومە خزمەت مەلا نجووم، وتی: لاوّ دەنگی ئەتۆ بە مەملەکەتدا بڵاوە، غەزەلێکی حەمیدی بەگی ساحێبقڕانم بۆ وت:

با بە "بیسم الله رحمان رحیم" دەس پێ بکەم
چونکە تینووی ڕەحمەتم دڵ ئاگرینم ڕەحمەتێ
کائینات "الحمد لله" پڕ لە نووری ڕووی تۆ
ئەی حەبیبی یاری "رب العالمین"م ڕەحمەتێ

مەلا تەماشایەکی دوو مەلای جوانی، کە ئەملاولایان گرتبوو کرد، سەرێکی لەقاند و وتی:

– ئەحسەنت، حەیفە دەنگی تۆ قورئانی پێ نەخوێنرێت، بڕۆ خزمەتی شێخ و پێی بفەرموو، مەلا نجومیش بە کوڕی خۆیی قبوڵ کرد. لە بەیانییەوە بێرە حوجرە.

ئیتر لە بەردەستی پیاوچاکانی مەملەکەت غەزەلی عارفان و عاشقانم لەبەر کرد، قورئان و حەدیسیش من دەمخوێند و قامەتیش بە من دەکرا.

کەمتر غەزەلی عاشقانەم دەوت، بەڵام ڕۆژێک لە حەوشەی تەکیەی گەیلانی بووین، بڕیار بوو بۆ ئێوارە مووریدانی دوو تەکیەی تری مەملکەت دەعوەت بن، هەریەکە و خەریکی کارێک بوو، دەستەیەک لە مووریدە پیرەکان، کڵاو و جامانەیان لێ داگرتبوو، باسی گەنجی و دەستەیەکی تر تەسبیحاتیان دەکرد، مووریدە گەنجەکان، لە دەوری خەلیفەیەک کۆببوونەوە، باسی کەرامات و خاریقاتی شێخانی زووی بۆ دەکردن، لە دوورەوە سەرسامیان دیاربوو، ناوبەناو، ئیسمی شێخێکیان دەبرد و دەیانوت ئەی شێخی جونەیدی بەغدادی چۆن بوو؟ یان ئەی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم؟ یان زولنونی میسری و ڕابیعەی عەدەوی؟ سیمایان جۆرێک گۆڕابوو وەک چۆن یەکەمجار بەردێک دێنێت و یەک دوو نێشەی لێدەدەی. ئیدی هەمووان لە حەوشەی گەورەی تەکیە بڵاوەبوون و چایچیش بە سینییەک چاییەوە دەگەڕا و موردێکیش کاسەیەک شەکری کلّۆی پێ بوو بۆی دەگێڕان، لەو کاتەیا، حەیدەر مەقام، تەنبوری بە دەستەوە بوو، ڕەنگی پەڕی بوو، لە چاو خۆیدا ڕیشی زۆر بوو، سپێنەی چاوی زەردوام ئەینواند. هاتە لام دانیشت، نە سەلام و نەکەلام. منیش سەیرێکم کرد، وتم لە کوێی دیارت نییە؟ وتی لە پیر یەعقوبی خاسان بووم. حاڵی بووم دەردی کارییە، ئەوەی حاڵی ناحاڵ نەبێت ئاوا ناچێت لای پیر یەعقوبی خاسان نەزر بکات! وتم چیت بۆ بڵێم؟ سەری هەڵبڕی وتی: هەرچیت ئارەزووە، وتم بە دڵی تۆ، دیاربوو تاقەتی هیچی نییە و دڵی تەنگە، بۆ شوێنێ بۆ شتێ بۆ یەکێ. بە دەنگێکی نزم وتم ڕات چییە لەسەر غەزەلێکی ئیبن عەرەبی؟ وتی قنی ئەو شەقەمان پێوە نییە، ئینجا غەزەلێکی مەلای جزیریم بۆ وت، وردە وردە گەرم بوو،

ڕەنگی زیاتر پەڕا وتی: گۆرانییەکی وڵاتی ئێمە هەیە ئەتوانی بۆم بڵێیت؟ منیش وتم بە ئیزنی خوا غەزەل و قەسیدە و موستەزاد نییە نەتوانم بیڵیم. غەزەلێکی لەسەر تۆمارنووسراوی لە باخەڵی کەواکەی دەرهێنا، دیاربوو لە ئەوەڵەوە بۆ ئەوە هاتبوو، وتی بیخوێنە ئەمن پەرێشانم. کاتێک غەزەلەم دی، جارێکی تر بیستبووم، بەڵام نەمەزانی وەها کاریگەرە، ڕووبابژەن وتی ئەمە لە ناوچەی ئێمە هێمای برین و ئەوینە، دواتر حیکایەتی ئەو غەزەلەی بە درێژی بۆ باسکردین، بەڵام ئەمەوێ حیکایەتەکەی بگێڕمەوە. حیکایەتی ئەو غەزەلە وەهایە کە دەمی خۆی لە هەرات لە سەردەمی تەیمورییان کاتێک لە دانایی و زانایی و هونەر ڕوولەپێشچوون بوو، ژمارەیەکی زۆر مەدرەسە و حوجرە و کلاس بۆ زانستە هەمەجۆرەکان کرایەوە بە سەرپەشتی وەزیری دانا و هونەرکار، ئەمیر عەلیشیر نەوایی کە هەم شاعیر بوو هەم دانا. لەو سەردەمەدا ژمارەیەکی زۆر زانستویست و دانایی جۆ دەچنە مەکتەبخانەکانی ژێر چاودێری شیر عەلی نەوایی، یەکێک لەو زانستویستانە فەقێیەکە بە ناوی محەممەد و لە مەدرەسەی باکووری هەرات بوو نزیک سەرچاوە و ئاوێک کە جیا لەوانی تر ئێواران بە دەم ڕێگاوە تا مەکتەب سەرف و نەحوی ئەزبەر دەکرد و لەسەر ئاوکە لای دەدا و نەختێ پشووی دەدات ئەوسا دەچووە ماڵ.

ڕۆژێک وەک هەموو ڕۆژەکانی تر فەقێ وەها دەکات، بەڵام ئەم جارە قەدەر شتێکی تری لە ڕێ داناوە، کە درەنگتر هاتووە، دەستەیەک لە کچانی جوان بە گۆزەوە بۆ ئاوبردن هاتوونەتە سەر کانی، لە ناویاندا کچی یەکێک لە دەسەڵاتدارانی دەرباری بە ناوی عایشە تێدایە، لە ناکاو بایەک دێت و سەرپۆشی عایشە دەبات، لەبەردەم فەقێ محەممەددا دەیخات، کە هەڵی دەگرێتەوە تەماشای فەقێ دەکات، سوور هەڵدەگەڕێ و دڵیان دەچێت بە یەکدا. ئیتر فەقێی داماو عیلم و دەرسی دەبێت بە عایشە، عایشەش لە دووری ئەو دەسووتێ، فەقێ دەنێرێتە داوای عایشە، بەڵام دەڵێن فەقێ ڕووتەیەکی وەک تۆ چی هەیە کچی بدەینێ؟ بڕۆ خەریکی عیلم و زانستت بە. لەو سەردەمەدا وا باوە، کچان و کوڕان نەزر دەکەن ئەگەر بۆ یەک ببن، دەچنە مەزاری شەریف مەولا عەلی لە مزگەوتی کەبود تا کە نەزرەکەیان هاتە دی لەوێ زەماوەند کەن و سوڵتان پارەی زەماوەندیان بدات، عایشەش کە دەزانێ بە مەلا عەلی نادەن ئیدی ئێواران لە کانی بە نەغمەیەکی خەمباری دڵبڕ و هەستبزوێنەوە ئەم غەزەلە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| بیا که بریم به مزارملاممدجان | سیل گل لاله‌زار وا وا دلبرجان |
| به دربار سخی‌جان گله دارم | یخن پاره ز دست تو نگارم |
| پس از مرگم بیایی بر مزارم | مدامم در دعا در انتظارم |
| بیا که بریم به مزار ملاممدجان | سیل گل لاله‌زار وا وا دلبرجان |

ڕۆژێک بەو نەغمە سۆزناکەوە غەزەلە دەخوێنێ، ئەمیر عەلیشیر نەوایی بەوێدا دەڕوات گوێی لە وەها نەغمەیەکی خەمبارە، دەڵێت: ئەم دەنگە خەمینە، ئەم شیعر و نەغمەیە ڕازێکی تیایە، با بچین بزانین چ باسە. دەچێتە پێش لە عایشە و دەڵێت:

- کچم حوزنی ئەم نەغمەیە سەرچاوەی کێیە؟

ئەویش سەر دادەخات، ئەمیر دەڵێت:
- قەسەم بە خوا ڕازت باس بکەیت، بۆت بەدی دێنم.
ئینجا عایشە دەڵێت:
- سەرچاوەکەی تەلەبەیەکی مەکتەبی تۆیە! ئیتر ئەمیر دەنێرێتە خوازبێنی کچە و دەڵێت: بۆ کوڕی خۆممە، بۆی مارە دەکات، بە پێی نەزەرەکەیان چل شەو مەلا محەمەد و عایشە خزمەتی مەزار دەکەن، ئەوجا دەچنە پەردەوە. ئیتر ئەو ئێوارەیەی تەکیە من بە قسەی ڕووبابژەن غەزەلەی پڕ لە تکام خوێندە و و وتم ئاهەنگەکەیم بۆ کۆک کە، وتی:
- ئاخر ئێرە حەوشی تەکیەیە. ئەم غەزەلە هیی ئێرە نییە. منیش وتم:
- لە ملی من.
ڕووبابەی گەرمکرد و دەستی بە ژەنین کرد، شێخ لە دوورەوە دەرکەوت ڕووبابژەن وەستا، شێخ بە ئیشارەی دەست وتی:
- خەریک بن.
هەمووان گوێیان لە شێخ بوو، کۆبوونەوە و ئەڵقەیان بەست، ئیتر من چوومە حاڵی خۆم و ئەویش ڕووبابەی دەژەند، هەرگیز مەستی وەک ئەو ڕۆژە و تامی ڕۆحی ئەو جارە و تەجەلای نووری ئیلاهی نابینمەوە. هەردووکمان، من بە دەنگ و ئەو ڕووباب دەیوت، کاتێک تەواو بووین. بۆ یەکەمجار فرمێسکم لە چاوی شێخدا بینی، فەرمووی: ڕووبابژەن تۆیش لەگەڵ تەمبوردا وەرە زکرەوە، ئیتر دوای زکر پێکەوە لە تەکیە مەجلیسمان گەرم دەکرد.
کاتێک شێخ ڕێگەیدا ڕووبابیش لە تەکیە لێ بدرێت بە دەم زیکر و موناجات وتنەوە، زۆرێک لە موریدان سەغڵەت و تەنگەتاو بوون، ئەوە لادانە لە شەریعەت و بەرەو پیرچوونی شەیتان و نەفس و شەهەواتە. شێخ ئارام بوو هیچی نەوت، وتی میحرابەدین چی تۆ مەستت دەکات؟ شەراب و خەشخاش یان غەزەل و ڕووباب؟ وتم قوربان ئەوە چ فەرمایشتە، تا جامی غەزەل و ئاوازم نەدۆزییەوە مەست نەبووم! ئینجا هەر لەوێ ڕووبابژەنیشی لێبوو، دەستم بە وتنی دوو بەیتییەکانی بابا تاهیری هەمەدانی کرد:

دو زولفانەت بوەد تاری ڕووبابەم
چی میخاهی ئەزین حالێ خەرابەم
تو کێ باما سەرێ یاری نەداری
چرا هەر نیوەشۆ ئایی بە خابەم

دواتر دوو بەیتییەکانی بابای عارفم دەوتنەوە، کە کوردە و هەموو شەرق زەمین شیعرەکانی دەڵێتەوە. من چەندان جار لە ئارامگاکەی دیومە لە هەرات و کابول و غەزەوە هاتوون بە دەنگی ڕۆحبزوێنی خۆیانەوە ئەو دوو بەیتیانەیان وتۆتەوە. جارێک لە یەکێک موریدەکان وتی: ئەگەر ئەو ڕووبابە لێرە بێت ئەوە من تا زیکری قیام لێرە و دوایی زیکر ناکەم. ئەمەش مانای وابوو نیوە زیکرە و موردید بەوە تووشی دابڕانی ڕۆحی دەبێت. چونکە زیکرەکە وایە لە تەکیەی گەیلانی

بۆ یادکرنەوەی خودا بەکۆمەڵ کۆ دەبنەوە. یەکەمجار نوێژی خەوتنان بە جەماعەت دەخوێنن، نوێژە سوونەتەکان بەجێ دەهێنن، سەر خەتم دێت سێ حەدیسی پێغەمبەر باس دەکات، ئینجا بە ناوی یاهو، دەست بە تەهلیلە دەکەن هەر ناوێکی خودا یەک تەسبیح بە دەورە و بە دەنگێکی زوڵاڵ و بەرز دەکەن، ئینجا حەوت پارانەوەیان هەیە یەکی حەوت جار دەیخوێنن، قورئانخوێن کە منم عەشەرەیەک قورئان دەخوێنێ، مەدد و ڕۆح ئامادەیی پیرانی تەریقەت دەکەن و چەندان وردە ویردی تری بەکۆمەڵ دەخوێنن. جا سێ کەسی شارەزای تەپڵیدەر، هەڵدەستن و دەدەن لە تەپڵ، ئەوان ڕیتمێک لێدەدەن دەوەستن، موریدەکان بە یەک دەنگ جەوابی دەدەنەوە ئەڵڵا، دوای تێدەگەین ئەوان قەراری (حەی)یان داوە، ئەمانیش جەوابی (ئەڵڵا). ئەمەش ڕێک هەمان تایبەتمەندی مۆسیقایە. پاشان دەفژەنەکان دەست بە لێدانی دەف دەکەن بە هارمۆنییەکی تەواو، تەپڵ و دەف و دەنگی دەروێشان یەک دەگرێت. بە وتنی حەی ئەڵڵا، ئەڵا و پاشان یا دائیم... کاتێک موریدەکان بە بازنەیەکی گەورە کۆ دەبنەوە و هەموویان دەست لەسەر سک وەستان و دائیم دەکەن، چەندان مورید حاڵ دەیان گرێت، پاشان کۆی ئەڵقەکە یەک دەگرێت، ئەمەش بەو مانایەی یەکێک خەریکە ڕاز دەدرکێنێ ڕازی مەستی و ڕازی تەجەلایی، وەک حەلاج لە دار دەدرێت بۆیە دەبێت نەیەڵن لە بازنە بترازێت. بۆ ئەوەش ئەو سەدان موریدە دەست دەگرن و ئەڵقەیەکی گەورە دروست دەکەن، دەخولێنەوە حاڵگرتووەکانیش لەناو بازنەکەدان، لە چەقی بازنەکەش خەلیفە وەستاوە تا ڕیتمی بازنەکە ڕاگرێت. بەو شێوەیە لە دایمەوە دێتە نۆرەی مەداح، دەست دەکات بە پارانەوەی قەسیدە و داوای بەخشین لە خودا، ئەمە بۆ وشکەدەروێشەکانە، دواتر دێتە سەر ستایشی پێغەمبەر ئینجا خەلیفانی ڕاشیدین و عەلی بە تایبەت بۆ نموونە لە تەکیەی گەیلانی زۆر دەروێش مەیلیان لەم قەسیدەیە:

لا فتی الا علی  لاسیف الا ذولفقار

بە ڕیتمی چەشنی ترپەی دڵی کەسێک کە یار ببینێ پەلە دەیڵێم، پاشان هێند پەلەی دەکەم تا دەگاتە ترۆپک و ئینجا وەک نەبزی دڵ بە یەک نەفەس سەدای من و تەپڵ و دەفەکەش دەوەستێن، حاڵگرتووەکان ناچارن هۆشیان بێتەوە، چونکە بازنەکە لە جووڵە، سرەوت دەگرێ، ئەو کەون و خۆر و مانگ و ترپەیە بە جارێ دەوەستێ. ئیتر دادەنیشین غەزەلی عارفانە و عاشقانە دەڵێینەوە. هەر لێرەشدا تەمبور و ڕووبابە دێنە ناوەوە.

ئەو جارە دەروێشەکە مەبەستی بوو لێرەدا بڕوات، وتی ئیتر من تووشی پرژانی ڕۆحی دەبم بۆیە ناتوانم بمێنمەوە، شێخ فەرمووی جەنابی مەولانا خۆشی لە ڕووباب دەهات، چونکە ترپەی دڵی خۆی بیستبوو، بەڵام تۆ نەتبیستووە، خودایە تۆیش ببیستی. چونکە کاتێک زولنوونی میسری ڕوو دەکاتە بەغدا، ژمارەیەک مورید لەگەڵ قەوالێکدا دەچنە خزمەتی، لێی دەپرسن، ئایا ڕێگە دەدەن ئاوازەیەک بڵێن؟ ئەویش وتی ئەرێ بیڵێن. قەوال ئەم بەیتانەی وتووە:

صغیر هواک عذبنی   فکیف به اذا احتنکا

وأنت جمعت من قلبی  هوی قد کان مشترکا

أما ترثی لمکتب أذا  ضحک الخلی بکی

دەگێڕنەوە کاتێک زولنوون ئەم بەیتەی بە ئاوازەوە بیست بە دەمدا کەوت، خوێن بە ناوچاوانیدا چۆڕاوگەی بەست، لە کاتێکدا هەرگیز وەهای لێ نەهاتبوو.

# شەوی سێیەم

میرغەزەبم، لە قەولەکانی تۆدا خراپەکارم و فەرمان بەجێهێنم... هەرگیز لە مەملەکەت بێ ڕەحمیم بەرامبەر بە کەس نەکردووە، دانیشتووی کۆشکم و دووراودوور چاوم لە کەنیزان و غولامانی ناو کۆشکە و ناتوانم نزیک ببمەوە، من هەمیشە چاوەڕێی فەرمانم، من مەحکوومم بە ناشرینی!

جارێ منت بۆ حیکایەتێک تەڵەب کردبوو، وەختێ سەرمەدت نارد بە شوێنمدا و پێکەوە ڕێمان دەکرد، خەڵکانی مەملەکەت تەماشایان دەکردم، لەبەر خۆیانەوە دەیانوت: خودا دەزانێ دەچێ کێ دەکوژێ، باری تەعالا لێی قبوڵ نەکات. زۆر جاران پیرەژنان دوعای نەحس و خراپیان لە من دەکرد، بەڵام ئەو حیکایەتە شتێک لە کوشتن ناخۆشتر بوو. ئێستەش کە دەیگێڕمەوە مووچرک بە لەشمدا دێ. جارێک لە حیکایەتێکدا منت کرد بە مێرێکی بەد و خراپ، زۆر خراپ. هێند خراپ کە خۆم شەرم دەکەم لە باسکردنی. لە ئاواییەک، ژنێکیان بە زۆر بە پیاوێک دەدا، نەک لەبەر ئەوەی پیاوەکە بێ ژن بوو یان لەبەر ئەوەی کچە ناشرین بوو، نەخێر قوربان هەم پیاوەکە خاووخێزاندار بوو، هەم کچەکەش جوان و نەشکوفتە، بەڵام بابی کچە بە شیربایی دا، پیاوەش بۆ ناوگەڵی دەیویست ژنی تازەی هەبێت. ڕۆژێ پارە درا بە مەلا، کچەیان بە زۆر و بێ ئاگاداری خۆی لە پیاوەیان مارە کرد. بەڵام چونکە کچە منداڵ بوو، دەترسا و نەیدەهێشت پیاوە توخنی بکەوێ. یەک ڕۆژ وا و دوو ڕۆژ وا، کە پیاوە دەچووە کنی کچە دەیزریکاند و هەرای دەکرد، ڕۆژێک، ژنەی پیاوە کە هەوێی کیژەی تازە باڵقە، بە پیاوەی سمێڵ بابڕی مێردی دەڵێت: خۆ تۆ کچە مەلیکت نەهێناوە من خزمەتی بکەم، برۆ سواری بە، کچە شاهیش بێت دەبێت پیاو سواری بێت، ئەوسا ژنە و پیاوە هاتن، بە گوریسێک و پشتوێنی پیاوە هەردوو دەستی و هەردوو قاچیان گوریسپێچ کرد، ئینجا ژنەی زاڵ و خوانەناس و بێ ڕەحم و میرغەزەبی شەیتانی، تیرۆکێکی هێنا و دایە دەستی پیاوە وتی پێیدا کە با فێر نەبێت ڕاکات لە دەستت، پیاوە هەتا هێزی تیابوو تیرۆکەی ڕایا لە عەورەتی ژنە و خوێن فیچقەی کرد. ئاهـ ئێستەش کە ئەوە نەقڵەکەم جەخاڵەتم. بۆ وات کرد؟ دەتویست بەوە چی بڵێت؟ ها؟ دەتویست ناشرینتر نیشانی بەیت؟ دەتویست ئینسان سووک کەیت؟ ئینسان خۆی سووکە، کەس نەیزانێ میرغەزەبان دەزانن کە هەمیشە بۆ تاوانبار و بێتاوان ئامادەی سەرپەڕاندنن، بەڵام بۆ ئەوەت گێڕایەوە؟ ئەویش بە من؟ ئای ئەو کچە کەساسە، لە بەدبەختی خۆی نەمرد، هەفتەیەک نەزیف بوو، دوایی ڕایکرد و سەری خۆیی هەڵگرت، دەگێڕنەوە ئاخرییەکەی مەلایەک لە ڕێی خوا لە خۆیی مارەی بڕی. ئەوەش حیکایەتی جوانت!

کەس وەک میرغەزەبان لە تووڕەیی مرۆڤ و ڕقی ئەستووریان شارەزانییە، کەس کەس. بۆ یەک سات ئاسودەیی،

داوێنی خۆیان دەکوژن، میرغەزبەکان دەزانن گومان و ئیتمنان چییە! هەرگیز میرغەزەبێکت دیوە بڕوا بە کەس بکات؟ نا ئەو نایکات، بۆیە منیش وەها هەرگیز بڕوام پی نەکردی. چونکە تۆ هەموو چرکەیەک حازر بوویت بۆ نەهێشتنی کەسێک، بۆ نەمان، ژمارەی ئەوانەی لێرە ون ئەبن کەم نین! بەڵام ئەوانە بە دەستی من ناکوژرێن، ون دەبن، دڵنیابە خۆتن نە کەسی تر. ئێمە بۆ خۆمان لێرە مۆڵگەمان بەستووە دەژین، نە هەژارین نە نەخۆش، ئیدی ئەمە بەهەشتە، بەڵام تۆ لە بەهانەی تا هەندێکمان وەدەرنێیت، وەلێ ئەمن هەرگیز بە سیما و قسەی نەرمی باشترین سوڵتان و گەورەکان و میهرەبانترینان، فریو ناخۆم، چجای خراپترینیان! پاشایانی زۆرم دیوە و کوژاوانی بێتاوانی فرەش.
هەندێ جار ڕووپۆشە ڕەشەکەم لادەبەم، تەماشای ئاسمانی ڕوون دەکەم و لەبەر خۆوە دەڵێم: جیاوازی نیوان کوڕی سوڵتان و جەلاد و دەرۆزەکەرێک چییە؟ فەزیلەت لای کامانە؟ کێهەمان مرۆڤی باش و کێهەمان بەد و خراپ و شەقین؟ کێ بریاری داوە من جەلاد بم، دلاوەر نەبەرد بێت، ڕوحنەواز ناسکە عاشقێک؟ کێیە تەور بۆ کوشتن دەداتە دەست من و گوڵ بە ناسکە کوڕێک دەدا کە گوایە عاشقە؟ ها؟ لە بنەڕەتەوە ئەم دابەشکارییە هیی چ شەوێکی ناخۆش و نەحستە وا بەرۆکی ئێمەی گرتوتەوە؟ ئەو کاتەی دەنگۆی ئەوە بڵاو بووەوە ئێمە دروستکراوی توین، دروست یان هەڵە، گومانم نەبوو، بەوەی من دەکەیت بە نوێنەری خراپە و توورەیی، تەنها بۆ ئەوەی حیکایەتەکانت شتێکیان کەم نەبیت، تەنها بۆ ئەوەی دەمانێک شازادە و سوڵتان کە سرتە و جووڵەی فێلاویان بە دڵ نەبووە و فەرمانیان کرد، ئەمن بە سوورکردنی دەستی خۆم کەفی دڵی پڕ لە کوڵیان بنیشێنمەوە! خاتوون شتێک هەیە بیزانە، ئەگەر ئەوەت بەشی من دا، لەم مەملەکەتەدا مەحکوومت کردم بە تەنهایی، بزانە من بەشێک لە دڕندەیی خۆتم، دڕندەیی خۆت!
دیاریی من شووشەیەک خوێنە! خوێنی کەس نا، خوێنی دەستی خۆم تا بزانی من نابمە ئەو خراپەکارەی تۆ دەتەوێت، هەموو دنیا بەرامبەر بە من ناشرین بوون، ویستت تۆڵەی خۆت لە دنیا بە من بکەیتەوە، ئێستا یارییەکەت تێدەگەم. هاتی لە ئەوەڵەوە بەو ڕەنگە هێڵی تاریکت بۆ من کێشا، تا بتوانی بمکەیت بەگژ قولەی قافا. نەتزانی من هیچم پێ ناکرێت. وابزانم یەکە سەرپێچیکەری ناو مەملەکەتەکەشت منم، بەڵێ تۆ ئەوانەت خۆشدەوێن لەبەر کێژان دەتوێنەوە، ئەوانەی قسەی گەورە دەکەن و باسی بەهەشت و جەحەنەم. نەکا منێک کە قسەت ئەشکێنم و لادەدەم، مەعلومە شووم و بۆخوێنم! لەو جارەوەی لە حیکایەتت دەرچووم منت بەر نەفرەتی خۆت خستووە. بیرتە کام حیکایەتە؟ دیارە بیرت نییە، تۆ لە شاهان خوێنڕێژتر و ڕۆحفڕێنتری، چما بیرتە کێت کوشتووە و کێت زیندوو کردۆتەوە؟ ئەو حیکایەتەی باسی شایەک و شابانوویەک دەکات، شاژنێک کە دەیان شازادان بوونەتە گەدای بەردەرگای، بەڵام چونکە پەیمانی ئەویندارى لەگەڵ کوڕە وەزیری یاریدا بەستووە، بۆیە پەنجەیەکی کوڕە وەزیر نادات بە سەڵتەنەتی گشت سوڵتانان. کوڕە و کچە هێند دڵیان بە یەکەوە دەبێت، کە شەو و ڕۆژ لە دووری یەک دەسووتێن، نە کوڕە و نە کچە ناوێرن لای عەبدەل بەشەر پەیمانی ئەویندارییان بدرکێنن، تا پاشای بابی کچەشا، لەسەر جێ دەکەوێ و وەسێت دەکات، کچم دڵت بە کێوەیە با بتدەمێ و تەختی پادشایی نەکەوێتە دەست دوژمنان، کچە دەیدرکێنێت دڵی لە گرۆی کوڕە وەزیردا داناوە، بابی دەڵێت پیرۆزی یەک بن. بەو شێوەیە باوکە، گیان دەسپێرێت و کچە مێرد بە کوڕی وەزیر دەکات، ئەو دەکات بە شاهـ و خۆیشی بە شاژن. وەک دوو ئەویندار لە ئامێزی یەکدا دەژین و وڵات لە سایەیان پڕ لە بەرەکەت و خۆشی دەبێت. تا ڕۆژێک سەرکاری کەنیزانی کۆشک، وێنەی ئەمان لە دڵی توند دەبێت و سوێند دەخوات شاژن بە کوشت

بدات و خۆی بچێته جێگەی. بۆ هاتنەدی ئەو ئاواتەشی پلان دەکێشێ، شەوێک دەرمانی بێهۆشکەر دەکاتە ناو خواردنی شاژنەوە و ڕووت و قوت دەیبات لەناو غولامان دەیخەوێنێت، لەو لاشەوە غولامێک دەنێرێت تا پاشا بێنێت و دیمەنەکە ببینێت، پاشاش هیچ کاتێک بێ میرغەزەب ناچێتە دەر، بۆیە کە شاژن بەو شێوەیە دەبینێ، شێت و کەللەیی فەرمان دەکات: میرغەزەب سەری شاژن بپەڕێنە. نەخشەی حیکایەتەکە وەها بوو من سەریم دەپەڕاند ئەوسا سێ لە کەنیزان و بیست لە غولامان سوێند دەخۆن کە ئەوە پلانی سەرکار بووە، ویستوویەتی تۆ فریو بدات تا خۆی ببێتە شابانوو. ئینجا پاشا لە پەشیمانیدا یەخەی خۆی دادەڕێت و بە میرغەزەب دەڵێت ژنەی سەرکار ئەنجن ئەنجن بکات. بەو شێوەیە پاشا لە حەیبەتا دیق دەکات، مەملەکەت لە ژێردەستی دوژمناندا کاول دەبێت. هێڵی حیکایەتەکەت وەها بوو تراژیدی بخولقێنیت تا باسی مەحف بوونەوەمان بکەیت، بەڵام بە یەک سەرپێچی من هەمووشت دەگۆڕدرا، بەو گۆڕانەش بیسەری حیکایەتەکەت لە دەست دەدا. بەڵام من ڕازی نەبووم ئەو تاوانە بکەم، هەر لە حیکایەکەدا فەرمانی پاشام بەجێ نەهێنا و ڕام کردە دەرەوە، پاشا بە تووڕەیی شوێنم کەوت، شاژن خەبەری بووەوە، خۆی داپۆشی و غولامان ترسان لەو هەرایە، پاشا قاچی هەڵکەوت لە دارێک و سەری دای بە لێواری حەوز و فوارەی کۆشکدا و لە هۆش خۆی چوو. حەکیمیان هێنا، کاتێک شاژن ڕووداوەکەی بیست، وتی مادەم شا وەها لە من ڕادەبینێ و بڕوا بە بوختانان دەکات، سوێند بە خوا کۆشک جێ دێڵم بۆ ئەبەد نەمبینێ. ئینجا لە دەرگای دالانی ناو ژێرزەمینەوە بەرەو کۆشکێک و باخێک کە بۆ ڕۆژی تەنگانەی دروست کردبوو، ڕۆیشت. ئیتر حیکایەت وەها گۆڕا، کە تۆ تووڕە بوویت، زۆر تووڕە. منیش لە حیکایەتخانە دەرچووبووم و چووبوومەوە ماڵەوە بۆ قەدەری بە دەم دەگریام، بۆ ئەو تاوانانەی نەمکردبوون. لەو کاتەوە دوو چاوت هەیە من نابینێ، بەڵام دیارە ئێستە نە دەمناسی نە دەزانی چ باسە، ها بگرە ئەم خوێنە، بەڵکو بیرت بکەوێتە زوڵم مانای چییە، خوا بۆ زاڵم، زەواڵ دەنێرێ.

# شەوی سی و یەک

بە ناوی پیرۆزیی ئەوەوە شروع دەکەم، خۆی پیرۆزمان کات، دووەم شەوە دێمەوە حزورتان و دەست بە گێڕانەوەی حیکایەتە پیرۆزەکان دەکەمەوە، هیچ وەک حیکایەت پیرۆز نییە، حیکایەت جێی گەورە و بچووک، خراپ و باش ناشرین و جوانی تێدا دەبێتەوە، لە حیکایەتدا هەمووان مەنزڵیان هەیە، ئەمە پیرۆزیی نییە چییە؟ ئاهـ خەجاڵەتم بیرم نەبوو، ئادەمی حیکایەتخوانم. باسی پیرۆزی حیکایەت دەکەم. من ڕام لێیەتی ڕۆژێک باشترین حیکایەتەکانی دنیا بە ئاوی ئاڵتوون بنووسرێنەوە، داوا لە چل منداڵی زۆر زرنگ بکرێت ئەزبەریان بکەن، تا بمێنتەوە، نەمرن.

یەکەم جار بۆت باسکردم، حیکایەت لە نەبوونی گوێگردا لەناودەچێت، کەچی ئەوەتەی مەملەکەت هەیە، دەژی، خەریکە بیری ساڵانی خۆی دەکەوێتەوە، بیری ڕەچەڵەی خۆی. خەریکە شتەکان سەرگوزەشتەیان دەبێت، زۆری نەماوە هەریەکەیان خۆیان بگێڕنەوە. هەریەکەیان و دەست بکەن بە هەگبەکەیاندا و حیکایەتپرژێنت بکەن. سەرەتا قورس بوو بیانخەینە سەر ئەوەی بێن و حیکایەتی خۆیان باس بکەن. زۆر قورس بوو. کە باس هاتە سەر بەڵاکە، لە مەملەکەت قاو درا ئێمە خەیاڵی تۆین و بوونمان نییە، شار ورووژا، وەک ئەو دەمەی تەتەر دێت و نامەی شاهنشاهی ڕۆمی پێیە و دەڵێت بەم زووانە هێرش دەکەنە سەر مەملەکەت، ژنانتان بە کەنیز و کوڕانتان بە دیل دەبرێن، ئاوها قەلەندەرئابادەکە ورووژا، سام لە ڕووی خەڵکان نیشت، مەملەکەت بۆ جاری دووەم دیسانەوە بۆنی تۆزی لێ پەیدا بوو، ئەو بۆنە دێرینەی من شەیدا دەکات، بۆنی خەلق، بۆنی جەنابت! قوربان کەس نازانێ چۆن هەواڵەکە بە مەملەکەتدا پێچرا و بڵاو بووەیەوە، یەکەمجار بە چپە و سەرتەوە بە گوێی یەکیاندا دەدا، ئەوەی دەیوت بە سامەوە دەیوت، ئەوەی دەیبیست بە واقوڕماوییەوە وەری دەگرت. پاشان بوو بە ئاشکرا، هەر دەستەیە و پەنایان بۆ شوێنێ برد. دەستیەک بە هوروژم ڕوویان لە بەردەرکی مزگەوتی ئیمام کرد، داوایان لە مەلا نجومی دەربەند فەقەرە کرد وەزعەکەیان تێگەیەنێت، نەعوزوبیلا چۆن شتی وا دەبێت. دەستەیەکی تر ڕوویان لە شیفاخانە کرد، ڕووی زار لە حەکیمباشی، وتیان: قوربان ئەمە لێک بدەوە، بزانە ئەم مقۆمقۆیە تەواو ناکەیت. دەستەیەکی دیکە بەرەو خانەی کتێب، ڕوو لە دوڕ محەممەد وتیان: سوڵتانی کتێب، تۆ کتێبانی فرەت دیتووە، پێشتر شتی وا ڕووی داوە؟ ڕوو دەدات ئێمە خەیاڵ بین؟ دەستەیەکیش بێباکانە ڕوویان کردە مەیخانەکەی سلێوە عیسا، دەستیان دایە ساغەر و پیاڵە، دەیانوت: تێکە ساقی با مەملەکەت کاول بێ بە ئێمە چی، کە باری خۆمان بە خۆمانەوەیە. هەندێکی تر لە خەڵکی ڕوویان لە حیکایەتخانە کرد، تا من ڕاست و دروستی شتەکەیان بۆ باس بکەم. خەڵکەکە بێتاقەت، مات، خەمباربوون. هەمووان شەک و گومان، ڕەنگی ڕەش داگەڕاندبوون،

خاتوون لەوە دەترسان حیکایەتە گەورەکە نەگێڕدرێتەوە، ئەوان بێهوودە ژیا بن، ترسی گەورەیان ئەوەیە، جەنابت دەبێت ئەو ترسە بکوژی، دەبێت لەبەر خۆت لەبەر مەملەکەت، حیکایەتەکەت بگێڕیتەوە. قسەلۆک و واتەوات لە شار تەواو نەدەبوو. قەرار درا، جارچی لە مەملەکەت جاڕ بدات، کێ دەیەوێت خاتوون ببینێ بە مەرجێ حیکایەتێکی هەبێت بۆ گێڕانەوە، دەتوانێت ناوی خۆی بنووسێت، پاشان ئێمە هەڵیانبژێرین، تا خۆیان بچنن و بزانن چ باسە. ئەو دەم لەگەڵ ئیبن حاتەمی مەغریبی و مەلا نجومی دەربەند فەقەرە و دوڕ محەممەد و خەلیفە حەمەومینی ڕیش چەرموو، کۆبووینەوە تا چارەیەک بدۆزینەوە. شەوێک تا بەیانی لە ماڵی ئیبن حاتەمی مەغریبی، جەدەل بوو لەسەر وەزعەکە. لەسەر ئەوە ڕێ کەوتین، چەند کەسێک هەڵبژێرین تا بێن حیکایەتت بۆ باس بکەن، بەڵام مەلا نجوم دەیوت: نا ئەمن پێم وایە دەبێت سێ شەو لەسەر یەک بچین وتاری ئاینی بۆ بدەین، حەدیس و ئایەتی بۆ بخوێنینەوە تا هۆشی دێتەوە. دوڕ محەممەد ڕای وا بوو حەوت شەو بە کتێبێکەوە، هەر شەوەی بابێکت بۆ وەخوێنین. خەلیفە حەمەومینی ڕیش چەرمووش دەیوت: دەبێت چل شەو ئەسمائولای بەسەردا بخوێنین تا چا دەبێتەوە. مەلا نجوم دەیوت: زۆر کەس نەخۆش بوون، بەڵام چەند شەوێک جوزئێک قورئانمان بەسەردا خوێندوون تا چا بوونەتەوە، چابوونەوەی هەر کەس و بە سورەتێکی قورئانی پیرۆزە، ئێمە نازانین کامەیە، دەبێت لە فاتیحا و بەقەرەوە دەست پێ بکەین، تا بزانین بە کامیان چا دەبێتەوە، هەیە هەر بە یەکەم ئایەتی فاتیحە ئەهوەن دەبێتەوە، هەشە تا دەڕوات دەڕوات تا دەگاتە یاسین، هەشە تا ئەلناس و فەلەق چا نابێت، ئەوە سێ شەو قورئانی بەسەردا دەخوێنین. دوڕ محەممەد دەیوت: ئەوە ڕەنگە ماندووی بکات، لەوانەیە بۆ ڕۆحی خراپ بێت، من دەڵێم ئەو هەموو کتێبە سەمەرەیە هەیە، دەتوانین شەوی بابێکی بۆ بخوێنینەوە، شەهریار بە خوێندنەوە و حیکایەت لە ژنکوژی چا بوویەوە. بەڵام هاوڕێیان وتیان جا کامە کتێبە ئەوەندە باشە، کە ئەو تاقەتی لێی نەچێ. من دەمویست هەر کەسە و بێت حیکایەتی خۆی، حیکایەتی ڕابردوویت بۆ باس بکات، تا شتێکت بیر بکەوێتەوە. لەم مقۆمقۆیەدا بووین. ئیبن حاتەمی مەغریبی، وتی:

فەرمایشی هەمووتان بەجێیە، دەبێت بە گشتمان کارێک بکەین خاتوونمان چا بێتەوە و حیکایەکەی نەقڵ کات. بۆ ئەوەش قسەی هەمووتان پڕ حیکمەت و نایاب بوو. ئێمە چل شەو ویرد و ئەورادی بەسەردا دەخوێنین، وتاری بۆ دەدەین، حیکایەتی بۆ باس دەکەین. بەو تەرزە خودا یار بێت دوای چل شەوە چا دەبێتەوە. ئێستە کاری ئێمە ئیختیارکردنی خەڵکانێکە، حیکایەتیان هەبێت و بێ ویرد نەچنە حزوری.

ئیتر بە حیکمەتی ئیبن حاتەم وەهامان دانا، تا یەک بە یەک سەرگوزەشت و بەسەرهاتی خۆیانت بۆ باس بکەن، بە ورد و درشتەوە، ئەوەی بیریانە ئەوەی تێدەفکرن، ئەوەی خەیاڵی دەکەن، ئەوەی ڕووی داوە، بەڵکە خەم و جەخاری وابەرت بدات. لە ڕاستیدا قەراردان نەختێک قورس بوو، بە تایبەت مەلا نجوم نەیدەویست حەوتەوانە، ئەو حەوت کچە دڵپاکە قسەلەڕوو و ماهروویە بێن، نەیدەویست روبحعامی موسایی تێدا بێت، بەڵام من پێداگریم کرد، چونکە دەمزانی تۆ بۆ گێڕانەوەی حیکاتە گەورەکەت لە عارفان و عاشقانەوە تا لاوانە و کچانە حیکایەتی بچووکت دەوێ، تۆ حیکایەتێکت دەوێ لە هەزار ڕەنگ، هەزار بۆن، هەزار تام، دەبێت بینووسیتەوە. ئایا تا ئێستا هیچت بیر نەکەوتوتەوە؟ هیچ هیچ، ئەو کچ و کوڕ و پیاو و ژنە سەلارانە هیچ کامیان هیچت وەفکر ناهێننەوە؟ ئەو دیارییانەی دەیهێنن؟ سیمورغ، قاڵیچە، موریدەکان، کچە شەیتانە عەیارەکان؟ هیچت بیر ناخەنەوە؟ خۆشییەکانی مەملەکەتت نایەتەوە بیر، شین و چەمەرییەکانیان نایەتەوە

خەیاڵ؟ ونبوون و مردن و لەدایکبوونەکان؟ هیچ... هیچ؟ هەندێ کەس لە مەملەکەت ئەم بەڵایە بۆ زاڵمێتی تۆ دەبەنەوە، کە هەمیشە شێنێک بەرپا ئەکەی، هەندێکی تر بۆ بەڵای ونبوونی خونچە و پیرانی دەبەنەوە، گوایە خوا ئەو ناهەقییەی لێ قبوڵ نەکردووی. حیکایەتی ئەو دووانە تا ئێستاش ناڕوون و گومە. تا ئەو جێیەی من و خەڵکی قەڵەندەرئاوا دەیزانن ئەوەیە، کیژ و کوڕێک لە مەملەکەت دەژین، کچە چاوبەڵەکێکی باڵا لاولاو، کوڕە ڕەشئەسمەرێکی سمێڵ قەیتانی قەڵەمکێش، دڵ و دڵخوازی یەک دەبن، ئەو شەوەی لە یەک مارە دەبڕێن و دەکرێتە پەردەوە، جەنابت بێ ئەوەی ئاگات لێ بێت داوای ئەو دووانە دەکەی بۆ حیکایەتیان بیەیت، ئەوانیش دەڵێن چی دەکەی بیکە ئێمە نایەین. دەگێڕنەوە هەندێ کەس ترساون، وتوویانە بەخوا خاتوو شەهرەزاد تۆڵەتان لێ دەکاتەوە، ئەمشەو بە زیندوویی ڕۆح دەرنابەن، هاکا میرغەزەبی بۆتان نارد، بەڵام ئەو شەوە لە باخەڵی یەک دەخەون و هیچ ڕوونادات، بۆ سبەی هەڵدەستن کچە دەستێ بەرگی سوور و کوڕە دەستێ کەوا و سەڵتەی عەسەلی وام دەپۆشن، دەستی یەک دەگرن و بە شاردا دەڕۆن و قاقا پێدەکەنن، دەڵێن خاتوون چی پێدەکرێت با بیکات، ئێمە هیی یەکین بە یەکەوە دەژین بۆ یەک دەمرین، بەندە و عەبدی کەس نین. دەڵێن ئەو ڕۆژە ئەوان مەستی نەشئەی یەک بوون، لە بازاڕ و قەیسەری و گوزەر چییان بە زاردا هاتبا دەیانوت. شەو دێنەوە ماڵ و شێو دەکەن، چرایان دەکوژێننەوە و دەنوون. دوای ئەوە بۆ هەمیشە ون دەبن، کەس نایان بینێتەوە. دەروودراوسێ دەڵێن شەو ئاگایان لێ بووە کە چرایان کوژاندۆتەوە، بەڵام نە سرتە نە پرتەی تریان گوێ لێ نەبووە. حیکایەتی ئەو دووانە ونە. نە تەرم نە پارچەیەک لە بەرگ و پۆشاک و خشڵ، هیچ هیچ جێ نەما. لەو حەلەوە زۆر کەس بە چاوی گومانەوە لە میرغەزەب دەڕوانن، بەڵام من دەزانم ئەو پیاوی خراپەی وەها نییە. بۆیە هەن لە مەملەکەت دەبێژن خوای خونچە و پیرانی نەوجەوان، ئاوای لێکردی. هەشن دەڵێن: ئەمانە گەمە و یاری خۆیەتی، لەژێر سەری خۆیدایە، فەرامۆشی کەن، خۆی هەموو شتی بیر دەکەوێتەوە. من نازانم چۆن و بۆچی ئەو دووانە ونبوون و هەست دەکەم خەتایەکی خۆیانی تێدایە، بەڵام ئەوەی قورس بوو لای من، ونبوونە سەمەرەکەی شەرارە بوو، ئاوازخوێنە ئەفسانەییەکە. ئەو کچەی بە دەم گۆرانیخوانییەوە گومبوو، هەرگیز کەس نەیبینییەوە. شەرارە چاوڕەشێکی ئەسمەری زوڵف درێژ، لەبەردەم پەنجەری باڵەخانەکەیا لە ماڵیان دەوەستا و گۆرانی دەوت، گۆرانی بۆ ڕێبواران، غەریبان، پیرەکان، دەوتەوە. ئەو گۆرانی دەوت و سڵی لە هیچ نەدەکردەوە، هەندێجار، کە دەستی دەکرد بە گۆرانی، لە خوارەوە خەڵکی مەملەکەت کۆدەبوونەوە، بێدەنگ گوێیان دەگرت. هەرگیز شەرارەم نەدیوە گۆرانی بڵێ تەماشای خوارەوە بکات، یەکجار نەبێت یەکجار. ئەو کچە دەنگ ئەفسانییە چی لێهات؟ کەس نایزانێ؟ هەندێ دەڵێن: ئەژدیهای حەوت سەر ڕفاندوویەتی، هەندێکی تر دەڵێن: لە بن کێوەسوور بۆتە ژنی ورچێکی گەورە، هەندێکی تر دەڵێن: خانم بردوویەتییە لای خۆی تا شەو و ڕۆژ گۆرانی بڵێت، خۆیشی حیکایەت بنووسێت. خەراباتیانیش دەڵێن: لە دەنگی ترساویت بۆیە لە مەملەکەتت وەدەرناوە. حیکایەتی ئەو کچەم هەرگیز لە دڵ دەرناچێت، ئەو کچە لە بەرزەوە گۆرانی دەوت، خەڵکیش بە سەبەتەکەی دەستیانەوە، بە میوە و سەزە و ماسییەوە، دەوەستان و گوێیان دەگرت، لەبەر گوێڕادێران بۆ دەنگە ئەفسانییە گەورەکەی شەرارە، نانخوادنی نیوەڕۆیان دوادەکەوت. ئێوارەیەک هاتە باڵکۆن و دەستی کرد بە ئاوازچڕین، ئەو ئێوارەیە دیاربوو لە ناخیدا شتێک هەیە، ئاوازەکەی خەمین بوو، زۆر خەمین، ئەو ئێوارەیە کۆچی یارم کۆچی سوورەی وت، لە دوورەوە توراب گوێی لێبوو، هات و دەستی بە ژەندن کرد، ئەو ئێوارەیە توراب دەیژەند، ئەو گۆرانی دەخوێند، پاشان توراب بۆ یەکەمجار



دەستی بە گۆرانی چڕین کرد، میللەت سەرسامبوون بە دەنگی، بۆ یەکەمجار شەرارە تەماشای خوارەوەی کرد، هەر ئەو سەیرکردنەی ئەو، جۆشی دایە دڵی خەڵکەکە، بە تاسەوە تەماشای ئەویان ئەکرد، هەبوو چاوی لەسەر ئەوەوە دەچووە سەر باز و شاهینی ئاسمان، هەبوو دەفڕی دەفڕی بۆ لای یاری، هەبوو بۆ کۆنەهەوار و دیاری خۆی. شەرارە کڵپەیەک بوو، هەموو خەڵکی مەملەکەتی گەرم دەکردەوە، وەک پەروانە دەورەیان دابوو، شەرارە بە دەنگی خۆی ئاگری یەکەمین شەوی تۆی بیر دەخستمەوە، ئازار و عەزابی لە بەرچاو پێ باڵا دەکرم، بۆنی خۆڵی لە کەللەمدا دەورووژاند. ئەو شەوە هاتمە حیکایەتخانە، وتم: شەهرەزادی خوداوەندگاری حیکایەت، دەمەوێت شەرارە بگێڕمەوە. بەڵام نازانم چی بوو، نازانم چۆن بوو بیرم چووەوە، بەڵام دەزانم، ونبوونی شەرارە ڕێک حەوت ئێوارە دوای ئەو ئێوارەیە بوو!

بەڕاست شەرارە چی لێهات؟ شەرارە کڵپەی دڵی توراب یان من، یان مەملەکەت بوو ساردبووەوە؟ شەرارە بۆ کوژایەوە؟ بۆ ناوی شەرارە ون بوو؟! شەرارەت بۆ خۆت برد؟ بۆ چ حیکایەتێکت هەڵت گرت؟ من دەزانم شەرارە ڕۆژێک بڵێسە دەسەنێت و دەردەکەوێتەوە، ئاهـ شەرارە.

# شەوی سی و دوو

به ناوی زاتی جوانی ئەوەوە، کە خۆی دڵ و ناخمان جوان کات. غولامی کاکۆڵ قەترانی دەرباری کۆشکم، کۆشک سەرووی مەملەکەتە قەدیمەکەتی گرتووە، چەندان شازادان، سوڵتانان و شاهانی لێیە. کۆشک هێند گەورەیە، مرۆڤ تێیدا ون دەبێت. کراوە بە سێ بەشەوە، بەشێکی بۆ دەست و پێوەند و وەزیران و گزیرانە، بەشی دووەمی کە کۆشکی شاهانەیە، بۆ شاهان و میوانان و پیاوانە، بەشی سێیەمی حەرەم و ئەندەروونە، مەخسوسە بە ژنان و کیژان و کەنیز و قەرەواش و کارەکەران. کۆشک دەستووری خۆیی هەیە، حوکمی کۆشک بەسەر کۆشک خۆیدایە و شاهان بۆیان نییە بەسەر مەملەکەتدا فەرمان دەرکەن، ئەوان لەوێن تا نۆرەیان بێت بینە حیکایەتەوە، بەڵام شاهانەیی خۆیان بەسەر ئێمەیا ئەنوێنن، چونکە لە ئەوەڵەوە تێگەیەنراون، ئەوان شاهی مەملەکەت نین. ژمارەی شاکانی ئێرە زۆرە، حەوت شای لێیە، بە کچان و کورانەوە حەفتا شازادەی ڕەسەنی لێیە. وەزیران دوانزە و گزیریان چل دانەن. غولامانی قولە و ڕەش سێ بەشن، هەر بەشێکیان حەفتا غولامن، غولامانی کاکۆڵ زێڕین چل دانەن، غولامانی کاکۆڵ ڕەش حەوت دانەن، غولامی کافوری کاکۆڵ قەترانی کەمەر زێڕین یەک دانەیە، ئەویش منم! کاری هەریەک لەم غولامانە لە حیکایەتدا جودایە. غولامە ڕەش و قولەکان، هەمیشە بە خراپ باس دەکرێن، لەوانەن کە لە شاهی خۆیان هەڵدەگەڕێنەوە، ژنانی شا دەکەنە کەنیزی خۆیان. غولامانی کاکۆڵ زێڕین بۆ پەزێرایی میوانان و زۆرجار بە دیاری دەدرێن بە شاهان و میوانانی سوڵتان، وەک بارە ئاوریشم و سندووقی عەقیق تەماشا دەکرێن. غولامانی کاکۆڵ ڕەش، لە خزمەت شاهـ و شازادەدان و تایبەتن بەوان. بەڵام غولامی کافور ڕەنگی کاکۆل قەترانی کەمەر زێڕین، مەحبوبی سوڵتان و شاهانە، شاژنان بە ڕەقیبی خۆیانیان دەزانن. ئەم دانە و حەوتەکە دەتوانن لە سێ بەشی کۆشک بچنە هەر شوێنێ کە بیانەوێت.

شوکر بۆ خوا من لەو غولامانە نیم، بیەڵم ببمە پیاوی هیچ شایەک و دەمەوێ ببمە پیاوی شاژنێکی دڵبەر، نەک سوڵتانان سوارم بن و دەست بە سمت و کەفەڵمدا بێنن. لە کۆشک بە غولامی یاخی ناسراوم و خۆم لە سوڵتان بە کەمتر نازانم، ئەوەش سەروسورەتمە وەهای کردووە لێم قبوڵ بکرێت. زۆرن ئەوانەی شەیدای منن، بە بینینم خورپەیان لێدەکەوێت، کچان دەبورێنەوە، پیاوانی شەهوەتیش ئابڕوویان دەچێت و کلکیان دەردەکەوێت. ئەگەر بڕوا ناکەی بچۆ لە کۆشک بپرسە بزانە وەهایە یان نا. ڕۆژێک لەگەڵ حەوت غولامی کاکۆڵ ڕەش لە باغی چل ئاواز بووین، کە چل جۆر تەیر تێیدا دەجریوێنن و هەریەکەیان حیکایەتێ دەخوێنێت. لە بن گەورەترین داری باغ کە دارئەرخەوانێکی شێت ڕەنگە، کۆ ببووینەوە، پێکەنین و قسە، مەزاقمان بوو. لەولای ئێمەیشەوە کەژاوەیەکی گەورەی لێیە و هیی شاژنانی شووکردووە.

ئەو ڕۆژە شاژنێکی بە غەمزە، لەناو بەرگی شاهانی زێڕچنی زیودووردا، بە سکێکی قوتی جوانەوە لەناو ئەو فوستانە چیندارەدا دەرکەوت، شەش لە کەنیزی شیرین کەلامی لەتەک بوو، تا بە قسە دڵی خۆش بکەن و سکەکەی باش گەشە بکات، لە دوور ئێمەی دی چاوی لێ هەڵنەگرتین، وەختێ نزیک بووە و چاوی کەوتە سەرم، ڕەنگی تێکچوو سەرسمێکی دا و کچان بە لەز گرتیانەوە. ئەوسا چووە ناو کەژاوەی لە هەزارگوڵ و بە دەست پرسیاری منی کرد، یەکێ لە کەنیزان وتی ئەوە دوڕدانەی کۆشکە، غوڵامی کافور ڕەنگی کاکۆڵ قەترانیی کەمەڕ زێڕینە، دانی وەک مرواری و نەفەسی وەک میسکە. بە دەنگێک وتی تا ئێمەیش گوێمان لێ بێت، شاژن دەموچاوی گۆڕا، وتی بانگی بکەن. منیش چووەمە بەردەمی، ئادابی سوڵتانانم بەجێ هێنا و ئێکلامم کێشا. وتی: سەر هەڵبڕە تا هێزی تیابوو تەماشای کردم، ئەوجا وتی بڕۆ. من ڕۆیشتم و شاژن ڕەنگی تێکچوو خەریک بوو بکەوێ بەلایا، بە پەلە گرتیان، دەستبەجێ خوێن هاتە خوار بە داوێنیا، کچان زریکاندیان، من و هەر حەوت غوڵامان ڕامان کرد، من باوەشم کرد و بردمانە کۆشک، حەکیمباشیان هێنا، وتی: ئەمە خورپە لێی داوە بە هەواڵێکی خراپ، تووشی خوێنبەربوون بووە و منداڵەکەی داناوە. پرسی ئەو هەواڵە چی بوو پێتان دا، هەموو کچان ترسان هیچیان نەوت، حەکیم دووبارەی کردووە. ئەوسا یەکێ لە کچان وتی: غوڵامەی کەمەر زێڕینی دی! ئیتر ئەو منداڵەش تۆ خۆش. شا تووڕە بوو، نەیهێشت ئیتر ژنان تەماشام کەن. منیش باکم بەوان نەبوو. چونکە لە مێژە دڵم چۆتە گژ کچی بازرگانیی زەنگینی مەملەکەت و ئەویش پێم ڕازی نابێت. بە دەیان نامەم بە سەرمەدی قاسیدا بۆ نارد، بەڵام دڵی نەرم نەدەبوو، دوای دەیان نامە، ڕۆژێک بۆی نووسیبووم، دەڵێن تۆ گوستاخ و یاخی کۆشکیت، نازی سوڵتان و پاڵەوانان دەفرۆشی، ئەگەر هەر بەڕاست وەهایت، بڕۆ لە حیکایەتخوانی سەرەوە یاخی ببە! کە ئەوەم دی بیری قەرارە قورسەکەیم نەبوو، لە خۆشی ئەوەی نامەی جەواب داومەوە، خەریک بوو شێت دەبووم. بۆم نووسی قەسەم بە کەلامی خوا، لێی یاخی دەبم تا تۆ بڕوا بە عەشق و ئەوینم کەیت. ئیدی هێندەی نەبرد، وەک ئەوەی دڵت خەبەری دابێت، سەرمەدت نارد بە شوێنما، منیش وتم:

- بڵێ نەخۆشە و نایەت.

دوایی لە حیکایەتخوانم بیست چۆن بەو قسە شکاندنەت نائومێد بوویت. بەڵام تۆ لێم مەگرە من دەبوو دڵی ئەو بە دەست بێنم، وەگەرنا من حەدم نییە هێند ڕووقایم بم... بەڵام خاتوون تۆ گەورە بوویت، تۆ لێم تووڕە نەبوویت، ئەو حەزی دەکرد تووڕە بیت، ئەو دەیویست وردم کەیت، دەیویست گوێی لە دەنگی بەرزی تۆ بێت و دڵی ئاو بخواتەوە، گەرەکی بوو ناشرینی تۆ ببینێ و نەیدی. هەر ئەو شەوە نامەیەکم بۆ نووسی: لەسەر قسەی تۆ بێ قسەیی خانمم کرد. نووسی بووی: چ زوو دەتەوێت منت دەستکەوێت، خاتوون، مەرجێکی تری دانا بوو وتبووی، بڕۆ پەڕی سیمورغم بۆ بێنە، کەی هێناتەوە ئەوسا من ماچت دەکەم. منیش بە عەقڵی خامی خۆمەوە، کەوتمە سەر هەوای ڕۆیشتن، بەیانییەکی زوو نامەیەکم جێهێشت و پریاسکەم پڕ کرد و کەوتمە ڕێ. لە شوورەی یەکەم ترازام و بەرەو دەشت و سەحرا کەوتمە ڕێ، دەڵێت لەناو چەقی مەملەکەتەوە تا گەیشتن بە سیمورغ، کە نازانم هەیە یان نا بە سواری ڕەخش و دوڵدوڵ، حەوت شەو و ڕۆژە ڕێیە. منیش کەوتمە ڕێ، منێک تا ئێستا پەنجە نە بە ئاوی گەرم نە بە سارددا نەکردووە و نۆکەرم هەیە. حەوت ڕۆژم بوو بە ڕێگەی هات و نەهاتەوە بووم، خەڵکانی مەملەکەت ئیدی خەریک بوو منیان بیر بچێتەوە. هێندەی لە شوورەی یەکەم دەرچووم بە سێ ڕۆژە ڕێ، ڕێم هەڵە کرد بەرەو بیابان، تووشی خۆری گیانپرووکێن بووم، دەرۆیشتم

و بیابان گەرما بوو، دەڕۆیشتم خۆڵ و ڕەشەبا بوو، لە تاو تینوویێتی خەریک بوو کوێر دەبووم، یەک ڕۆژ بەرگەم گرت و لە پێ کەوتم، هۆشم بە خۆم نەما. وەختێک هۆشم دێتەوە، دەبینم لە ماڵێکی خۆڵینی ڕووتەڵ دام، لە توێی جاجمێکدا کەوتووم و کیژێک پەرستارمە. وەختێ دیتی چاوم هەڵهێناوە، بزەیەک گرتی، ئەوسا وتی: دەزانی چەند ڕۆژە بێهۆشی؟ وتم: چەند؟ وتی: حەوت ڕۆژە! کچە بیابانشین بوو، لەتەک باوکێکی پیری دەژیا، وتی: باوکم چووە بۆ کار، تۆ بە هەڵە ڕێت کەوتبووە چەقی بیابان، باوکم ڕزگاری کردیت. دوای ئەم هۆشهاتنەوەیەت، ئینجا تا حەوت ڕۆژ سکچوون و ڕشانەوە گریت، ئیتر دوایی سەلامەتیت بۆ دێتەوە. من وتم نا، نابێت، من غولامی کافور ڕەنگی کاکۆڵ ڕەشی کۆشکم، هاتووم پەڕی سیمورغ بۆ دڵبەرم ببەم. کچە وتی:

- تۆ کوڕی ناو حیکایەتی؟ منیش وتم:

- نا ئێوەیش هیی ناو حیکایەتن، مەگەر ئێوەیش بۆ چوونە ناو حیکایەت نەخولقاون؟ ئەو وتی:

- نازانم باسی چی دەکەیت، بەڵام من ئەو قسانەی تۆم لە داپیرەمەوە بیستووە، کە کوڕەکان وادەڵێن...

کاتێک زانیم کچە نە منی بۆ گرنگە، نە جوانییەکەشم وێرانی دەکات، بەڵکو خەمیەتی تا نەمرم و ترساوە نەمێنم. دڵم توند بوو. زۆر توند. دوای ئەو ڕۆژە قسەکەی هاتە دی، من تا حەوت شەو و حەوت ڕۆژ بە هۆی گرەوە تووشی سکچوون و ڕشانەوە بووم، تەواو بە دەرمانەکانی پەرستارەکەشمەوە لە پێ کەوتم. دوای حەوت ڕۆژە نەختێ باشتر بووم. هێند ماندووبووم، بە دەست نەخۆشی و کەوتنەوە، شەرمەزاری خانەخوێی کچەی بووم. بۆ یەکەمجار زانیم قسەکەی ئەو ڕاستە من لەناو حیکایەتدا ژیاوم، ئەمە ژیانی واقیعییە، کاتێک کە خەریک بوو باش دەبووم، بیرم کردەوە بچم بۆ پەڕی سیمورغ یان نا، بەڕاست ئەگەر من لە حیکایەتدا بم چی؟ ئەی کۆشک؟ ئەی کیژەی دڵبەرم، ئەی ئەگەر پەڕیشم بۆ برد نەیویستم؟ ئەو کچە ئەم نەخۆشییەی من دەبینێ؟ زۆرم لە خۆم پرسی، ئاخیرەن بڕیارمدا، واز لەو حیکایەتە بێنم و بە ڕاستی بژیم. داوام لە کیژەی خوێنگەرمی ڕەشئەسمەری پرچ ئەستوور کرد، ببێتە هاوسەرم، ئەویش وتی: ئەگەر تۆ دەتەوێت من دڵت ناشکێنم. ئیدی من لەوێ مامەوە، بە ڕۆژ دەچووینە سەحرانشینانی دەرودراوسێ لەگەڵ بابی پەرستارمدا، بە شەویش حیکایەتی مەملەکەتم بۆ دەگێڕانەوە. بەو جۆرە من چێژم لە ژیان وەگرت. بەڵام بەیانییەک ئەو ژیانەم بۆ هەمیشە شێوا، کاتێ هەستام لە خەو، من لەودیو شوورەی یەکەمەوە لە مێرغوزارێکدام و بە لێسانەوەی سەگی خاسانی شوان هۆشم هاتەوەخۆ. خاسان کە دیمی، وتی:

- تۆ کێی غەریب؟ منیش وتم:

- لە خەڵکی مەملەکەتم و غولامی کەمەر زێڕینی کۆشکم.

خاسان وتی:

- دیارە تۆ ماندوویت. کاسەیەک شیر و ئەستوورکی داپێم و ڕەوانەی کردم. کاتێک چوومەوە کۆشک، بوو بە هەراوزەنا غولام هاتۆتەوە. من لەگەڵ چوونە ناو دەروازەوە لە پێیان کەوتم. کاتێک هۆشم هاتەوە حەکیمباشیم لە لابوو، دەورم لە شازادان و وەزیران پڕبوو. هەموو بزەیان دەکرد و پرسیار. دواجار حەکیم ئیزنی دان، خۆی دەستی گرتم و وتی:

- لە کوێ بووی؟ وتم:

- نازانم.

ئینجا پرسیم:
- چەندێکە ڕۆیشتووم؟
حەکیم وتی:
- چل ڕۆژە! ئیتر خۆم پێ نەگیرا و دامە پرمەی گریان. دەستم گرت بە داوێنی حەکیمباشییەوە، وتم: حیکایەتخوان بێنە بۆ لام. ئەویش وتی ئەگەر ڕازی بوو شەو لەگەڵ خۆم دەیهێنم. بەو شێوەیە شەو حیکایەتخوان لەگەڵ حەکیم هاتن. کاتێک هەموو شتم لە سەرەتاوە بۆ باس کرد. دەستێکی هێنا بە ڕیشیدا وتی:
- وەڵا بڵێم چی! تۆ لە حیکایەتدا بوویت.
وتم:
- ئەی ئەو کچە؟ ئەو کچەم خۆشویست و ژنم بوو.
- ناوی چی بوو؟
-نازانم.
وتیان:
- ئەی سیمورغت دی؟
- نا.
- ئەی بیری کچەی بازرگان دەکەیت؟
- نا. من تەنها ژنەکەی خۆمم دەوێت.
- تۆ ژنت نییە.
ئینجا حەکیمباشی وتی:
- نەنە خەزێم بانگ کەن.
بانگیان کرد، وتیان وەسفی ژنەکەت بکە. منیش وتم:
- ڕەشئەسمەرێکی خوێنگەرمی، پەلک ئەستووری چاوگەورەی سینگپڕی، کوڵمبەرز. وتیان: نەنە خەزیم کچی وا دەناسیت؟
وتی:
- بەڵێ ئەوە کەژاڵ؛ کەنیزی کۆشکە.
- کچێکی چۆنە؟
-خۆپارێز و عاشق، چل شەوە نەزری بەڕۆژووە.
حیکیایەتخوان وتی:
- بۆچی؟
-نازانم، بانگی دەکەم لە خۆی بپرسن. بانگی کەژاڵیان کرد. من دڵم دەلەرزی نەکا ئەوە بێت. کاتێک خۆی کرد بە ژوورا، ڕووبەندێکی تەنکی وەنەوشەیی دابوو بەسەریدا، حەکیمباشی و حیکایەتخوان و نەنە خەزێم فەرموویان لێکرد، ئەویش بە پێوە دەستەونەزەر وەستا، نەنە خەزێم وتی:

- کەژاڵ، کچم دانیشە. حیکایەتخوان دەیەوێت بزانێت چل ڕۆژ نەزری ڕۆژووت بۆچی بووە؟ کەژاڵ ڕووبەندەکەی، کە وەک پەڕی کاغەز بوو دەلەرییەوە. دیار بوو دەلەرزی. وتی:
- قوربان لەبۆ حاجەتێک!
حەکیمباشی وتی:
- حاجەت گیرا بوو؟
کەژاڵ وتی:
- قوربان مەرگی نەبوو، ڕەنگی هەبوو.
وتیان دەی ڕووبەندت لادە، دەستی دەلەرزی خوا شاهێدە فرمێسک لە چاویا وەستا بوو، ڕووبەندی هەڵدایەوە و تەماشای منی کرد، بۆ نەمدی خۆمم پێنەگیرا و بە هەردوو لەپی دەستم کێشام بە ناوچاوانمدا. ئەویش یەکسەر دەستی گرت بە دەموچاوییەوە و ڕای کردە دەر. میرزا ئادەمی حیکایەتخوان وتی:
-بڕۆ کە حیکایەتت گۆڕا.
نەنە خەزێم وتی:
- ئەو کچە چل ڕۆژە دوعا دەکات خوا بە زیندوویی بتهێنێتەوە. دوعای ئەو تۆی پاراست. ئیتر خاتوون گرم گرت، وتم:
- نەنە خەزێم کەژاڵ هیی منە، من ئەوم دەوێ، کەسی ترم ناوێت.
لە کۆشک بووە هەرا و دەنگۆ غوڵامی کەمەر زێڕین لەو هەموو شازادانەیا شەیدای کەنیزەیەک بووە! ئەوان لە حیکایەتدا بوون، بەڵام من دەمویست بژیم، من جارێک تامی ژیانم کردبوو دەمویست بمدرێتەوە، حیکایەتخوان وتی: کەژاڵ هیی تۆیە خەمت نەبێ، ئیتر لەگەڵ کەژاڵ کۆشکمان جێهێشت، ئێستە لە ماڵێکی بچووکدا دەژین، دەژین وەک ژیان نەک وەک حیکایەت، جارجار سەرمەدی قاسید نامەی کچی بازرگانم بۆ دێنێ، بەڵام من هەرگیز نایکەمەوە دەیخەمە ئاگردانەکەوە، من کەژاڵم نادەم بە کەون!

# شەوی سی و سێ

بە ناوی خودای مرێنەر، کە تەنها ئەو دەتوانێ بمانمرێنێت و بمانژێنێت، ئەوی گەورە، باڵامەقام. شەهرەزاد خۆمم ڕووباب؛ دیسانەوە هاتمەوە، لەو جارەوە هیچت فەرق نەکردووە؟ ئاهـ شەهرەزاد، نەمتوانی بێم، حەوت ڕۆژ بوو لە جێگادا بووم. ئەم جارە ناچار ئیبن حاتەمی مەغریبی هات بۆ لام، پێم خۆش نەبوو، بەڵام حیکایەتخوان ناردبووی، ئەویش سەرمەد پێی گوتبوو. وەها بوو میزا ئادەم سەرمەد بنێرێت بۆ لام تا بزانێت شەوی بیست و یەک نایەم، کاتێک لە دەرکە دەدات و جەواب نابیستێت، ترسی لێ دەنیشێ، سەرمەد بۆنی خوێنی کردووە و زاتیشی نەکردووە دەرکە بشکێنێ، ترساوە کوژرابم، بۆیە بە پەلە دێتەوە حیکایەتخانە و میرزا ئادەمی لێ خەبەردار دەکات، ئەویش دەڵێت: بچۆ ئیبن حاتەمی مەغریبی ببە بۆلای من لە بری ئەو دەچم بۆ لای خاتوون. ئەو شەوە من بریندار بووم، ئیبن حاتەم هات، سەرمەدی ئیزن دا، هێند خوێنم لەبەر ڕۆیشتبوو، نەمەتوانی هیچ بڵێم، ئیبن حاتەم جێ برینەکانی دەسڕین و پاکی دەکردنەوە، ئیبن حاتەم سەری ڕادەوەشاند و بە ئەهوەنی برینی دەپێچا، لە سیمایدا نە تووڕەیی هەبوو، نە بەزەیی، یەک شت هەبوو؛ تێگەیشت بوو عەزاب و برین مانای چییە. ئەمە بۆ من بەس بوو. ئیبن حاتەم متەقی لێوە نەهات، پرسیاری نەکرد، تووڕە نەبوو، دڵی نەدامەوە، گیراوەیەکی گەرم و بۆنداری داپێم و بەلامەوە تا بەیانی ئێشکی گرت.

شەهرەزاد ئەو شەوە تایەکی گرانم هەبوو، دەبوو فێنک ببمەوە، زۆرن ئەوانەی گەرمی تا عەقڵی پێ لە دەست داون، برینێکی حەمایڵ ئاسای پشتم هێند قوڵ بوو، نەمدەتوانی ڕاکشێم، ئەوجا لەرز گرتمی، لەرزێک دانەکانمی وەک دەنکی تەرزە دەدا بە یەکا. دایپۆشیم، چی دەستکەوت پێیدا دام، کورەکەی گەرمتر دەکرد، من هەروا لەبەر ئاگردانەکە بە قنەوە خەوەنوچکەم بوو، چاوم دەچووە خەو لەبەر کزانەوە و تۆزانەوەی برین خەبەرم دەبووەوە، تاوێ بە لەرز، دەمێ بە تا، دوای خەوێکی کورت چاوم هەڵهێنا، فرمێسکێکم لە چاوی ئیبن حاتەمدا دی، دڵۆپێک فرمێسک لە گۆشەی چاوییەوە داکەوتبوو، ئیبن حاتەمیش گریا بۆ من، ئەو شەوە تۆیش گریای، لێرەوە گوێم لە هەنسکت بوو، میرزا ئادەم وەیزانی بە حیکایەتی ئەو ئەگریت، بەڵام تۆ بۆ من دەگریایت. هەر ئەو شەوە خوداش بۆ من گریا، ئەو شەوە کەون گریا، فرمێسکەکانتان هۆن هۆن دەکەوتە سەر برینە تەڕەکانی لەشم و سوێی زیاتری دەبردە دڵمەوە!

پێی چوو تا باش بم، دوانزە ڕۆژی پێچوو تا بتوانم بێمەوە دەر، بەڵام ئەو بەیانییە، بە ئیبن حاتەمم وت: جەنابی حەکیم مەیەڵە کەس بەم برینەم بزانێت! ئەو سەرێکی ڕاوەشاند و بزەیەکی کەمڕەنگ و تاریکی کرد و ڕۆیشت. دوایی خونچەبۆی بۆمی گێڕایەوە، ئەو ڕۆژە حەکیم بۆ یەکەمجار لە مەرقەدی پیر یەعقوبی خاسان دەبینرێت، دەڵێن: دانیشتووە



و فاتیحایەکی خوێندەوە، دوایش دەستی هێناوە بە دەموچاوییا، هەر چوار پەنجەی خستۆتە سەر لێوی ماچی کردووە و ناویەتی بە ناوچاوانییەوە. هەر ئەو ڕۆژ چۆتە بەر مەیخانە و ساقییەکی ڕاسپاردووە تورابی بۆ بانگ بکەن. کاتێکیش توراب هاتۆتە دەر، حەکیم پێی وتووە، ئەم شەو مەیخانە جێ بێڵە لەتەک حەیدەر مەقام و مەسحور وەرنە ماڵی من. دەڵێن: ئەوە یەکەمجار بووە حەکیم دەستەی مۆسیقاژەنان و موتریب بباتە ماڵ و گوێ لە ئاوازی خەمین و بە جۆشیان بگرێت.

شەهرەزاد، حەکیم چ پیاوێکی مەزنە، نەک تەنێ ئەو، ژنانێکی باش، پیاوانێکی خاس لێرە هەن، مەملەکەت خەڵکی جوانی

لێیە، بەڵام وەختێ جێی حەوت خەنجەرت پێوە بێت، وەختێ لەژێر فوستان و کەوا و کراسەوە خوێن قەتماغەی بەستبێ، کوا چاو تینی جوانی بینی هەیە، کوا دڵ هێزی ترپە و جۆش و خرۆشی هەیە، ها شەهرەزاد!

شەهرەزاد بڕوانە، دەزانم تا دڵتەنگی زیاترت بۆ باس بکەم تۆ حاڵت باشترە، دەزانم دەرمانی تۆ حیکایەتی تاریک و ترساوە، حیکایەتێک بۆنی گەرد و وردبوون و سەرمای لێ بێت، حیکایەتێک بۆنی قوڕ و ئاگر و سووتانی لێ بێت، دەرمانی تۆ ئەوەیە، ئەوە...!

دواحیکایەتت بیرە؟ هەردووکمان دڵمان تەنگ بوو، سەرمەدی قاسیدت نارد بە شوێنمدا، وتت: بڵێ ڕووبابە... وەرە... دڵم تەنگە. هاتمە لات، وای ئەو ڕۆژە چەندە تاریک و تەریک بوویت، چەندە نزیک بوویت لە خۆکوشتنەوە، چەندە لەناو برینیدا چەقیبوویت، منیش لە تۆ باشتر نەبووم. منیش بریندارتر بووم، بە دەم ترسی خۆمانەوە نەخشەی خودکوژیمان بۆ خازێ دانا، گران نەبوو تەنها دەبوو من دڵتەنگ بم، تا بتوانم خازێ بم، تاخوا پێی خۆش بێت من دڵتەنگ بووم، قووڵ قووڵ دڵم حەپسی ئینفرادی بوو، لە ناخی ناخەوە شتێک منی دەهاڕی. بڕیارماندا تۆ گێڕەوە بیت، منیش سەرپشک بم لە حیکایەتەکەدا و خۆم نەخشەکێش و جێبەجێکەر بم، من ئێستەش دڵم وەک ئەوکات تەنگە، من هەمیشە دڵم تەنگە. ئەها حیکایەتەکەم بۆ هێناویت، دەتوانم بە نەفەسی دڵتەنگی ئەوسا بیخوێنمەوە دڵنیام شتێکت وەیاد دێنێتەوە:

من خازێم کوشت !

سەرەتای حیکایەتەکە بۆ ئەو دەمە دەگەڕێتەوە، خازێ لە خەو هەڵدەستێ و بەو مەلابانگانە دەچێتە بەر ئاوێنەکە، قژە درێژەکەی دادێنێت، قوڵ دەچێتە ناو بیرکردنەوەوە، شتێ عەزێتی ئەدات و نازانێ چییە، دەربیجەی ئاشەکۆن دەکاتەوە و دەچێتە دەر، ئاخوڕی ئەسپەبۆر دەدات و هێلکەیەک لە بن مریشکە قوڵێ هەڵدەگرێت و بێ ئەوەی بچێتە ژوور بەرەو گوێ چەمەکە لێژ دەبێتەوە، لە ئاوەکەدا بۆ خۆی دەڕوانێت و خۆی ناناسێتەوە، تاوێ دادەمێنێ تا شێوەی خۆی بکات و نایکات! بە هێلکەکەوە دەچێتە ژوور نایبرژێنێ و دەیەوێ پاڵ کەوێ و ژیوان دەبێتەوە، خازێ دڵی ختورەی چتێ خراپی کردووە، چتێ کە بیری نییە چییە، من دەیبینم و دڵم بۆی تەنگە، ناتوانم لێرەوە تەماشای کەم و هیچی بۆ نەکەم، دڵتەنگییەکەی فرە قوڵە و دڵی منیشی کپ کردووە، بە شێنەیی شوێنی دەکەوم و دەچمە ژوور، تەماشای دەکەم، ئەو نامبینێ، ئەو دڵی پیس تەنگە، دەموچاوی وەک هیچ دەمێک نییە، پێستە گەنمییەکەی زەردتر دەنوێنێ و چاوی چاڵ بووە، لە فکر ڕۆچووە و بیر لە شتێ دەکاتەوە، بیبینی دەڵێی ها ئێستە دەداتە پڕمەی گریە، هەستەکەی ئازارێک لەسەر دڵیەتی و دڵی گوشیوە، لە تاو ئازار برۆی بە یەکدا داوە، من دەچمە پەنای هیچ ناڵێم، دڵم کەوتۆتە ناو خەرەندی تاریکی، خەمی خازێمە، دەزانم من هیچم بۆ ناکرێت، خازێ سەرپۆشەکەی دەدا بە سەریدا دیسان دەچێتە دەر، چاو لە ئاوایی دەبڕێ و چاوی لە جووڵە و سرتەی سپێدانە، ئینجانە چکۆلەکەی ئاو دەدات و بیری نییە نازی گەڵاکان بکێشێت و ئاوپرژێنەکەی لە پاڵدا دادەنێ و لەبەر خۆوە ئاوازێکی خەمهاوەر ئەچڕێ. ئەمەوێ بچمە زەینی، ئەمەوێ بچمە شەوی پێشووی و خەونەکەی ببینم، لێ بە خۆما یەم و دەڵێم بیەڵە خۆی قسە بکات. خازێ قسە ناکات، ئەوسایش قسەی نەدەکرد، کە نەیەوێت هیچ بڵێ، واتە نایڵێ. خازێ متەقی لێوە نایەت و دووجار دەست بۆ گەردنی دەبات، وەک ئەوەی گەرووی وشک بێت، یا نەفەسی تەنگ، بەڵام هیچییان نییە. نەختێ ئەوەستێ، دوودڵە ئاشە بخاتە گەڕ، یان نا، دەچێتە بەرەوە، پاشەوپاش دەگەڕێتەوە، دەستی ڕاستی ئەخاتە تەوێڵی و گەرم دیارە، کوڵمەکانی گوڵ ئەگرن و سوور ئەبنەوە،

کەچی هێشتا بەرچاوی ڕەشە و سیمای زەرد دەنوێنێ، دیسانەوە دەچێتە ژوور، منیش شوێنی ئەکەوم. بەو ئیقباڵی من لەوەدایە لەو حیکایەتخوانانە نیم هەموو شت بڵێم، هەموو شت بزانم و بچەمە خەونی، ناچار شوێنی دەکەوم، دەچێتە بەر ئاوێنە ژەنگاوییەکە، زوڵفی دەکاتە دوو پرچ، سەرپۆشە ئەرخەوانییەکەی دەبەستێتە سەری و دوو پرچەش لەملاولا شۆڕ دەبنەوە، خەیاڵی لای خۆی نییە، هەڵدەستێ، دیسانەوە دەچێتە دەر، تەماشای دوور دەکات و چاوی بەرەو تولەڕێی ئاوایی ئەگێڕێ. ڕۆژ بۆتەوە و ژیان بە ترپەی دڵی لاوێکی بەکار ئەجووڵێ، ڕێکوپێک، بەڵام خازێ خەیاڵی لێرە نییە، خازێ ئەمترسێنێ بەو دڵتەنگییەی، دەمەوێ دەستی بگرم، بەڵام دەزانم پێی خۆش نییە لێی گەڕێم، دەزانم...



نەختێ بە پێوە دەبێت، سەری گێژ دەخوات و لە جێی خۆی لەسەر خۆڵەکە دائەنیشێ، تاوێ لەسەریەک چاو ئەترووکێنێ ئەودەم دەچێتە گوێ چەمەکە، دەڵێم چ باشە خەونەکەی بۆ بگێڕێتەوە، دایکم دەڵێت خەونە ناخۆش و تاریکەکانتان، خەونە تاڵ و ژەهراوییەکانتان، بۆ ئاو بگێڕنەوە، زوڵاڵە وەک شیری دایک، وەک حەزی کەوسەر و ئیتر خێر دەبێت، لێ من نابێت هیچی پێ بڵێم حیکایەتخوان نابێ چ بڵێ، دەبێ دانیشێ و بە دیار کارەکتەرەوە ڕامێنێ، من لەسەرەوە ئۆقرەی ڕامانم نییە، هاتوومەتە کنێ، من بە دەردی حیکایەتخوانی نایەم، ئەوەتا خازێ دڵی تەنگە و من ناتوانم هیچ بکەم. خازێ لە ئاوەکەیا پیرتر و خەمگینتر ئەنوێنێ، هێند پیر، کە سام لە ڕووی منیش ئەنیشێ، دەستێ لە ئاوەوە دەدات و وردە



ماسی بڵاوە دەکەن، کە دەستی دێنێتە دەر، دەستی چرچ بووە، هەڵدەستێ بەرەو لای پەیژە دارینەکە، وا دەزانم دەچێتە بان، لێ دائەنەوێتەوە، سەتڵە دارینەکە دێنێ کە بەرز دەبێتەوە تێم دەڕوانێ من ئەترسم نەکا دیبێتمی، وەلێ کە دەڕوانم تەواو سیمای قەیرەیەکی گرتووە، کوێرا وای لێهات، دڵم هارە دەکات و هەستەکەم پێم سست دەبێت، لە جێی خۆم وشک ئەبم، سەتڵەکەی پڕ دەکات لە ئاو. لە دووری دە مەتر لە ئاشەکۆن دایدەنێت، دەچێتە ژوور، بێڵەکە دێنێ زەوییەکە هەڵدەکەنێت، زەوییەکە ڕەقە، ئارەق دەکاتەوە، سیمای قووڵ قووڵ تاریکە و لە گۆشەی چاوییەوە دڵۆپێ فرمێسک لێژ دەبێتەوە، بە پانی بێڵەکە ئەوەشێتێ و چینێک خۆڵ بەرز دەکاتەوە، ئەودەم، بە دەمی بێڵە گردی دەکاتەوە، ئاوی دۆڵچەکە ڕۆ دەکاتە ناوی و دادەنیشێ، وا دەزانم سەری گێژ دەخوات، نا، قوڵی هەڵدەماڵێ و دەست بە شێلانی خۆڵ و ئاوەکە دەکات، کە بۆتە قوڕاو و قوڕەکە خۆش دەکات، دەستی لە قوڕشێلانە و فرمێسک دادەبارێنێتە ناو قوڕاوەکە، سیمای پیرتر دەنوێنێ، دەستی لە قوڕاوەکەدا گیرە و من بۆی دەڕوانم و هیچم پێ ناکرێت. من ناتوانم هیچ بکەم، ناتوانم بیخەمە قسە و خەونەکەی بگێڕمەوە یان بیرەکەی باس بکەم. خازێ قوڕەکە خۆش دەکات ئەوسا بە دەستی قوڕاوییەوە، دەچێتە ژوور، ئاوێنە ژەنگاوییەکە دێنێت و دەیپەسێرێت بە دیوارەوە، سەرپۆشەکەی لێ دەکاتەوە، هۆن هۆن، قوڕ هەڵدەگرێ و لە دوو پرچەکەی ئەسوێ، لە قلە باریکەوە تا ئەستوورایی، دەستی بە قوڕەوە ئەبات و سواغی ئەیات، هەردووکی وەک دوو ماری قوڕین بە لا شانیا دێنە خوار، ئەوسا پڕ بە دەستی قوڕ هەڵدەگرێ و دەیدا بە تەوقەسەریدا، من تەواو بەندی دڵم دەپسێ و دەمەوێ دەستی بگرم و ناتوانم. دایکم دەڵێت گوناحی هەیە، نابێ بنیام بۆ مردوو قوڕ وەسەری نێ، دایکم دەڵێت دەستی بگرن، هەر کەس وای کرد دەستی بگرن و مەیەڵن، من جارێ ئاوها دەستی دایکمم گرت، کە لە حەوشەکە خەریک بوو خۆڵ و قوڕی حەشەی وەسەری خۆی دەنا و دەگریا، هەموان قەڵەمی ئەژنۆیان شکابوو، من دەستم گرت و وتم سوێن بە خوا خۆم ئەکوژم دەست هەڵنەگری. خازێ کچی نییە دەستی گرێ و بڵێ خۆم ئەکوژم، خازێ مێردی نییە، خازێ تەنهایە، من ناتوانم هیچی بۆ بکەم، سەری قورسە، بەڵام دڵی لە سەری قورسترە، من هیچم بۆ ناکرێت و دەبینم کراسە ئاودامانەکەی بەری دادەکەنێ و دەست بۆ ئاوەڵکراسەکەی دەبات وئەویش دادەکەنێ، ڕووت و قووت لەبەر هەتاوی کزی پاییزا دەست بۆ قوڕ ئەبات لە نووکی پێیەوە قوڕی تێدەگرێت تا لاقەکانی و ئەگاتە کۆشی و مێینەیی و بەرەو ناوک و کەمەری و سینەی، دوو تۆپەڵی قورس دەگرێتە مەمکەکانی، تەواوی سنگ و گەردنی لە قوڕ دەگرێت، ئەوسا قۆڵ و بازووی لە قوڕە خەستە هەڵدەکێشێ و دەستی ئەبات سیمای لە تەنکە قوڕێ ئەگرێ، تەنها چاو و دەم و گوێ نەبێ تەواو بۆتە پەیکەرێکی قوڕاوی. هێشتاش من هیچم بۆ ناکرێت، خازێ خۆی لە قوڕ ناوە و من چاوم لێیە دەگری، تەواو دەگری و قوڕاوەکە نەرمە بێت، بەڵام دەزانم خازێ تەواو دڵی تەنگە، خازێ هیچ بە من ناڵێ، خازێ سەرمایەتی و ئەلەرزێ بەکاوەخۆ هەڵدەستێ و دەچێتە ژوور، لەناو جێیەک پاڵ دەکەوێت، و پەتۆکەی ئەیا بە ملیا، من خەمی خازێمە و ناتوانم هیچی بۆ بکەم، من بەرگەی حیکایەتی وەها ناگرم، بانگی گریان هەڵەیەم و ناتوانم وەها بە دیارییەوە دانیشم، من بە دەردی حیکاتەخوانی نایەم، من بودەڵم، خازێ دەناسم زار لە ئاویش نایات، خازێ ڕەق هەڵێ و گورگ لاشەکەی دەهاڕن، خازێ ڕۆ دەکەم و دەرگەکەی قایم دەکەم و دێمەوە سەر، بە دەم گریانەوە، ناتوانم هیچ بڵێم، دەنووسم، خازێم کوشت!

بیرتە، کە حیکایەتەکە تەواو بوو، بانگت هەڵدا؟ بیرتە هەردووکمان دەستمان بە شێوەن و ڕۆڕۆ کرد؟ ئاهـ چەندە



بریندداربووین، بەڕاستی هەردووکمان خازێمان کوشت، خازێی کەساس. شەوانێکی زۆر پلانی حیکایەتی زۆرمان دانا، ڕۆژانێکی زۆریش من خۆمم لێ ون کردیت و نەمەویست بێمە لات، بیرمە پار دوا مانگی زستان بوو، لە دووت ناردبووم منت نەدۆزییەوە، سەرمەدی کڵۆڵ هەموو شوێن گەڕا، کەچی نەیتوانی بمدۆزێتەوە. ئەو هەفتەیە چوومە ژێرزەمینەکە و حەوت کتێبانم دەگەڵ خۆم برد، حاڵم باش نەبوو، نەمویست بێمە هیچ حیکایەتێک، چاییم دەخواردەوە و دەمخوێندنەوە، وێران و هەلاهەلا بووم، ئەو جارە هەموو شت خەتای تۆ بوو، بیرتە؟ ئاهـ ببوورە تۆ هیچت بیر نییە، دەبێت لە نوکەوە باسی بکەم. شەهرەزاد، تۆ ماندوویت و منیش ماندووتر، بەڵام بڕوا بکە ئەم عەزابە ، نە بۆ تۆ، نە بۆ من بەهای نییە، شەهرەزاد شاریان وروکاندووە تا تۆ بێیت و حیکایەت بگێڕیتەوە، گریمان گێڕاتەوە، پێم بڵێ شەهرەی شیرینم، کێ بۆی گرنگە؟ کێ گوێت لێ دەگرێت؟ ها؟ ئاخر ئەگەر حیکایەتگێڕانەوەی تۆ بەهای بۆ کەس نەبێت، بۆچ دەیگێڕیتەوە؟

# شەوی سی و چوار

ئەوەڵ یار و ئاخر یار
تەمبورژەن و رووباژەنی مەملەکەتین، من ناوم حەیدەر مەقامی تەمبورژەنە و خەڵکی کرماشانم. ئەمشەو خەمبارترین حیکایەتی کەون دەبیستی!
پیری ئێمە سوڵتان سوهاکە، کوڕی شێخ عیسای بەرزنجە و کەلاممان کەلامی هەقە، لە ئەزەلەوە هەبووە و تا ئەبەد دەمێنێ، بەڵام چاوی زۆر بینا نەبێت نایبینێ، بۆیە سوڵتانمان وەهای کرد هەموومان ببینین و پێڕەوی بکەین ناوی نا کەلامی سەرەنجام، سەرەتا و کۆتایی کەلاممان یارە، بۆیە بە یارسان، ناسراوین، وەک ئەوەیە تەریقەت و مەزهەبمان تەنها جێگەی یار بێت، یارستان، وەک کوردستان وەک هیندستان، بەڵام ئێمە جوگرافی نین و رۆحین! کاتێ هاتمە ئێرە و سیمایان دیم وتیان ئەمە ئەهلی حەقە!
لای ئێوە بە ئەهلی حەق ناسراوین، چونکە سمێڵ و ڕیش و پرچ دەهێڵینەوە بە سیماماندا دیارە هەیکەلی عومرێکی حەسرەتکێشین. سوڵتانمان هەمیشە بە کەلامی حەق دەستی پێکردووە، ئەمەش دواپلەی کامڵی و گەیشتنە، مورید لە شەریعەتدا قاڵ دەبێت جا دەچێتە تەریقەت و ڕێبازی شێخیەوە، پاشان لەوێوە دەگەن بە مەعریفەت و زانین، کە ئەم سیانەشیان تەواو کرد، مانای ئەوەیە لە حەق تێدەگەن. ئەوانەشی لە مانای حەق تێدەگەن خۆشیان دەوێ، کەسانێکیش هەن لە مانای تێناگەن دەیکەنە مەزاق، ئەمان بەخێرن، کەسانێکی تر هەن تێدەگەن لە حەق، بەڵام بۆیان قبوڵ ناکرێت و دەترسن، ئەمانە جۆرە ترسناکەکەن و دەیانەوێت حەقگۆ بکوژن. حیکایەتی پیاوانی حەقبێژ زۆرن کە دران لە دار، لە حەزرەتی مەسیحەوە تا مانی پێغەمبەر و مەنسوری حەلاج. دواهەقبێژی ئێمە، کە حیکایەتیت بۆ باس دەکەم.
خۆیشکە خواویستی و تەمبورژەنی بڕوای ئێمەیە، لە کۆڕی زیکردا بە تەمبورەوە یار عەلی یار وەلی، دەڵێینەوە، دەچینە زیارەتگای شێخانمان باوە یادگار و پیر شالیار. شێخی ئێمە خەلیفەیەک بۆ بەڕێوەبردنی کۆڕی زیکر هەڵدەبژرێت، لە ناوەوە پیرێکی سەداخۆش کە کڵاوی لبادی سپی لەسەر دەکات، بە تەمبورەوە کەلام دەڵێتەوە و موریدانیش بە ئەڵقە لە دەوەری بە تەمبورەوە لە دوایەوە دەیڵێنەوە. موریدی بێ تەمبورمان نییە. هەم پیاوان و هەم ژنان، تەمبور دەژەنن و یار یار دەڵێینەوە. لای ئێمە غەزەل و ئاواز و ئەوین سیانەی خۆراکی موریدن تا خۆی لە دەست نەدات. غەزەل و بەیت شەرابی دروستکراوی ئەوینە، تەمبورە زمانی بێ کەلاممانە و ئەوین تاسە و مەیلی دووبارەی دیتنەوەی یاری ئەزەلی و یاری ئەبەدییە. لە خانەقاکان دەروێشان بەیتی بابا تاهیری هەمەدانی دەڵێینەوە، کە بە یەکەم شاعیری یارسانی دەزانین،

شیعری هەر شاعیرێکی تریش کە نەغمەی ڕۆحفڕین و مەست ئاوەر بێت دەڵێینەوە.
تەکیەی ئێمە گەورە بوو، پێنج سەد دەروێشی دەگرت، پڕ لە فەرشی دەستچنی دەروێشان، ئەڵقاوئەڵق موریدان کۆ دەبووینەوە، یەکی بە تەمبورێکەوە کە دەستکردی دوو ئوستادی گەورەی یارسانی بوو، گەنجان لە سەرچۆک و پیران چوارمشقی بە شەرواڵێک و کراسێکی سپی و کڵاوێکی شەبەکی چنراو کە پرچکەمان لەژێر دەنا، دادەنیشتین و بە یەک ترپە تەمبورمان دەژەند و مەقام و غەزەلمان دەوتەوە. پێنج سەد دەست بە یەک جار لە پێنج سەد سیم دەدەن، ناڵەیەکی جانخەراش دەهاتە دەرەوە...
ئاهـ خۆیشکە، شێخی ئێمە لاوێکی حەق دۆزەرەوەی نوورانی پەنجەتەڵایی بوو، پێش تەمەنی خۆی حەقی دۆزییەوە و زۆر زوو بانگی حەقی هەڵدا، شێخی ئێمە دەنگساز، دەفژەن، تەمبورنەواز، تار و سێتارژەن، تەنانەت ئامیری فەرهەنگیانیشی دەزانی. شێخی ئێمە، نوورانییەکی باڵابەرزی قەدپڕی ڕیش درێژی پرچ ڕەشی برژۆڵە درێژ بوو، سادە وەک ئاو، قوڵ وەک کەون، سەرچاوی مەعریفەی ئیلاهی بوو. وەختێ پەنجەی بە سیمی تەمبورەدا دەهێنا هوعەلی دەوت، دەروێش نەدەما لەبەر ئەوین خۆی بگرێت، کامە غەزەلی بێجان بوو کە دەیوت ڕۆح دەچووە بەری، ئەو تەمبوری دەژەند دوو دەروێش دەف و هەندێ جاریش کە لە پڕ وەختێ زکر نەبوو ئەو هەمیشە تەمبورەکەی پێ بوو، دڵی گەرم دەبوو تەمبورەی دەردەهێنا و دەستی دەکرد بە وتنی غەزەلان و تەمبوری دەژەند ئێمەیش، چونکە بێ تەمبور بووین بە ڕیتمی ئەو بە پشتی دەست چەپڵەمان لێدەدا، تا دڵمان گەرم دەبێت. سەری هێند دەجووڵاند کڵاوەی نەرمی کە پرچی قورسی دەروێشییەکەی شاردبووەوە، دەرکەوت و یەک باوەش قژ بڵاو دەبووە و حاڵ دەیگرت.
شێخی ئێمە دەچووە وڵاتان، دەڵێن جارێ چووە بووە دیتنی قەڵای درێژ و نەبڕوای چین، لە پڕ حەقی بیر کەوتەوە، دابەزی لەسەر گەرد و خۆڵ دەستی کرد بە تەمبورژەنین و فرمێسک بە چاوانیدا هاتەخوار، دەڵێن هەر شوێن و مەکانێ چووبێت یەکسەر وەبیری حەق دەستی بە تەمبورژەنین کردووە، شێخی مە نووری عەلی بوو لەسەر زەوی، کەلامی حەڵوای بەهەشت و سیما ئەولیای حەق بوو. شێخی ئێمە بەکار چووە وڵاتانی فەرهەنگان، قافڵەیەک لە کتێبدان و تەمبورەی برد، چووە زیاتری باوە یادگار و مشتێ لە خۆڵەکەی کردە گیرفانییەوە. وتی حەفتا ڕۆژ لەوێ دەبێت و دێتەوە، بەڵام حەوت ڕۆژ پێش ئەوەی بێتەوە، شێخی ئێمەیان دایە بەر خەنجەر، گریان بەردایە جەستەی، ئاهـ کوێرام دایە، خۆیشکە، کتێبەکان و کەلامی سەرەنجام و شێخەکەمیان سووتاند، خوێشکە لەمە خەمبارتر حیکایەتت دەوێ ببیستی!؟
کاتێ هەواڵی وەهام بیست قەرار بوو خۆڵەمێشی بهێننەوە، ئەو ڕۆژە هەزاران تەمبورژەنی ژن و پیاو وەک سەمەندەر لە تاو ئەو خەمە دەسووتان، تەمبوریان لێدەدا و دەیان ناڵاند، ئەو ڕۆژە من نەمویست باوەڕ بکەم و ئەو تابووتە ببینم، بە دەم قوڕپێوان و لە خۆدان و حەق حەقەوە، دامە کێو و دەرودەشت، یەکەمجار ڕووم لە داڵاهۆ کرد، شەوێک گریام و تەمبورنەوازیم کرد، دوایی بەرەو دەشت و کۆ هاتم، تا ئەوەی دەبینم، شەوێکی درەنگ لە ئاوەدانییەکام چرای ماڵان هەموو ڕووناکن و لە دوورەوە دەنگی بە کۆی مەلەکوتی دێت وەک ئەوەی هەزاران کەس بە یەک جار بڵێن (یا دائیم) قەیرێک بوەستێ پاشان شەپۆلێکی تری دەنگ دەڵێن (ئەڵا دایم) ئیتر شوێن دەنگەکە کەوتم و خۆم لە تەکیەیەک دیتەوە، هەر ئەو کاتە کە ڕەنگ بە ڕوومەوە نەمابوو سەروڕیشم خۆڵاوی بوو و لە حەوشە بە ڕیتمی ئەوان دەستم کرد بە تەمبورژەنین. هێندەی نەبرد شێخی مەزن هاتەدەر، دەستی گرتم وتی ڕۆڵە ئەوەی چوو لە ئێمەیش چوو. لای خۆیەوە

داینام، وتی بیژەنە ئێمەیش دڵمان تاریکە، بیژەنە!

ئەوە حیکایەتی من بوو.

ساڵانیکە لێرەم، سوێندم خواردووە بێ دەستنوێژ دەست لە تەمبورەم نەدەم، یەکەمجار تا ماوەیەکی زۆریش وەمزانی هەر خۆم لێرە غەزەل و ئەوین و زیکر رادەگرن، تا ئەوەی شەوێک من و میحرابەدینی مەداح و رووبابژەنت بۆ حیکایەتخانە بانگ کرد. باشم لە یاد نییە، بەڵام حیکایەت وەها بوو، من بارگەم کۆکردبووەوە، بچمە زیارەتی بابی سوڵتان سوهاک، کە لای ئێوە بە سوڵتان ئیسحاق ناو دەبرێت، تا نەزرم گیرا بێت، میحرابەدین بە بارگەیەوە دەیویست بچێتە زیارەتی بابا تاهیری هەمەدانی و رووبابژەنیش بۆ مەزاری شەریف. هەرسێکمان لە وڵاتی خۆمانەوە دەکەوینە رێ، شەوێک لە خانێک لە کاروانسەرایەک بەریەک دەکەوین، هەر یەکە و حیکایەتی خۆی باس دەکات، ئەوسا بۆ بەیانی هەر کەس و دەستومۆچ دەکات و بۆ مەنزڵی مەقسودی دەکەوێتە رێ، دەرۆن دەرۆن دەرۆن، کاتێک دەزانن گەیشتوونەتە حەرەمی شەریف، هەر یەکەیان و لە شوێنی خۆی حاڵ دەیگرێ، میحرابەدین بە دەم وتنەوەی غەزەلەوە و من بە تەمبورەوە، رووبابژن بە رووبابەوە ئاهەنگ دەڵێن، کاتێک گوێمان لە یەک دەبێت دەچینە کونجێک و غەزەلێکی شێخی بەهائی دەڵێینەوە: مقصود من از کعب و بتخانە توی تو، چل شەو لەوێ تاعەت دەکەین، دوایی دەگەڕێینەوە. خۆیشکە وابزانم ئەو حیکایەتت هەر بەراستی لەبەر ئێمە گێڕایەوە تا یەک بدۆزینەوە. ئێمە یەکمان دۆزییەوە. خودا تۆیش ئەوانە بدۆزیتەوە کە دەبێت لایان بێت.

# شەوی سی و پێنج

دوێشەو حەیدەر مەقامی تەمبورژەن حیکایەتی خۆی باس کرد، ئەمشەو من. لەسەر ئیزنی ئەو خۆم دەناسێنم، ناوم مەسحور کوڕی بەخت حسێنی عەندەلیبە و لێرە بە مەسحوری ڕووبابژەن ناسراوم، باوکم نەعت و حەمدخوانی تەکیەی 'نازر عیسا'ی چەشتی بوو لە کابول. هەر لەوێشەوە ڕووبابژەنی و دوو تارژەنی فێربووم. بە ڕەحمەت بێت باوکم ئەفسانەی تەکیەکان بوو، هەر یەک لە ئالەکانی وەک: ڕووباب، دووڕنا، دلربا، غیچەک و دمبورە و چەنگ و عودی دەزانی. منداڵ بووم لەگەڵی دەچوومە خانەقا و هەر لەوێش بێ لە غەزەلی ئەفغانی و دەری، گوێم لە غەزەلی عەرەبی و فارسی بوو، بەخت حسێنی عەندەلیبی باوکم، کاری خوێندنی غەزەل و گۆرانی و حیکایەتی عاشقانە بوو، حیکایەتەکانی لەیلی و مەجنون، شیرین و فەرهاد، یوسف و زولەیخا، شیعرەکانی حافز و سەعدی شیرازی و مەولانا جەلالەدین و بیدلیی بە سەبکی خۆراسانی یان بە مەقامی هیندی دەوتنەوە. دەروێشان ماندووی زیکر لە لەشیان دەردەچوو ئەوجا ڕۆحیان قووڵ قووڵ دەکەوتە ناو فەزای ئەو حیکایەتانەوە، هۆن هۆن فرمێسک بە چاویاندا دەهاتە خوار. بەو شێوەیە تا نزیکی شەبەق بەردەوام دەبوو، پاشان دەست دەکرا بە موناجات و پاڕانەوە، دەروێشان کۆ دەبوونەوە و دەست بە دوعا موناجاتیان دەخوێند. کە بانگی بەیانی دەدا دەستیان دەکرد بە دوعاخوێندن و نوێژکردنی بە دەورە بە خوێندنی سورەتە درێژەکانی قورئانی پیرۆز، دواتر هەمووان لەسەر ئیزنی شێخ یان خەلیفەی گەورە خانەقایان بەجێ دەهێشت. حیکایەتی ئەم خانەقا و موریدانە شتی سەیری تیایە، من هەر لە خانەقا بیستم، لە سەردەمی ئەمیر شێرعەلیدا، دوو شاعیر و سۆفی مەزن هەبوون بە ناوی شاهـ نیاز ئەحمەد و مەستان شاهی کابولی، وەک دەڵێن مۆسیقاژەنین لە خانەقا دەگەڕێتەوە بۆ فەیزی شاهـ نیاز ئەحمەد. لەو دەمەدا یەکێک لە موفتییە گەورەکان بە ناوی یار محەمەدی کابولی سوێند دەخوات بچێت بۆ هیند، کە نیاز ئەحمەد بۆ بڵاوکردنەوەی دینی ئیسلام چووبووە وێ، سەری شاه نیاز ئەحمەد ببڕێت، چونکە مۆسیقای بردۆتەوە ماڵی خواوە و بە ناوی زکرەوە حەڵاڵیان کردووە. بەو جۆرە لەگەڵ چەندێک لە دۆستانی دەچنە هێند، وەختێ دەگەنە شوێنی مەقسود هەواڵی شاهـ نیاز ئەحمەد لە موریدێک دەپرسن، ئەویش دەڵێت:

– هەنووکە لە مزگەوت خەریکی سەما و تەرەبە.

یار محەمەد بەو نیەتەوە خۆی بە مزگەوتدا دەکات، هەر پێی دەخاتە ناو مزگەوتەوە شاه نیاز ئەحمەد ڕووی تێدەکات و دەڵێت: باش بوو بە پێی خۆت هاتی، چونکە هێنانی تۆ بەو کوتوپڕییە لە ئەفغانستانەوە شتێکی ئاسان نەبوو. ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی حاڵی یار محەمەد بەو قسەیە بگۆڕێت و مەست و مەدهۆش بێت. کاتێک وەهۆش دێتەوە، بە چەشنێ سەما

دەکات کە دەڵێن تا دوو ساڵ و نیو ئەوە حاڵی بووە، ئەوسا شاهـ نیاز ئەحمەد پێی دەڵێت: تۆ خەلیفەی چەشتییەی، برۆ ئەم تەریقەتە لە کابول پەرە پێ بدە، وەلێ بزانە خۆت ئاخرییەکەی بە دەستی مەلاکانی ئەوێ دەکوژرێیت، بەڵام تۆ بە دڵ و گیان ئەو مەرگەت قبوڵ بێت، کە لەبەر عەشقی تۆیە! حیکایەتەکان دەڵێن: ئەو پیاوە مەزنە یار محەممەد دەستی کرد بە بڵاوکردنەوە و پەرەدان بە ڕێبازەکە، بەڵام مەلاکان سەنگەساریان کرد و کوشتیان. ئەوان یەک یار محەممەدیان کوشت، ئیدی بە دەیان یار موحەممەد هەبوون، کە نەیانهێشت سەماع و موتریب لە خانەقاکان ببڕیت. هیچ کات مەلاکان و شێخەکان دانویان بە یەکەوە نەکوڵاوە، تەریقەت و شەریعەت دوو شتی لە یەک دوورن. شەریعەت دژی هونەرە، تەریقەت هونەرپەروەرە.

کاتێ باوکم عەمری خوای کرد، من ئیدی کەم کەم پێم لە خانەقا کێشایەوە، چونکە دەیانزانی کە دەنگم خۆش نییە و وەک ئەو حیکایەت و داستان و غەزەلانەی فرەم حیفز نییە، دەیانوت: عەندەلیب لە حەمدخوانیدا وەچاخ کوێرە، ئەوان ڕووبابەی منیان بە تەنها نەدەویست، بۆیە ورد وردە پێم لە تەکیە کێشایەوە. ئەوەشی وایکرد ئیتر بەتەواوی نەچم و دوور بکەمەوە، موبەتەلابوونم بوو، موبتەلای گەنجی. ئەو ساڵانەی لە تەکیە بووم و لەگەڵ بابی ڕەحمەتیم حەمدخوانیمان دەکرد، هەڵبەت ئەو دەیخوێند و من ڕووبابم دەژەند، جارجارە بۆ مەجلیسی پیران و شاهان دەبراین، کە تایبەت بوو بە خانەوادە ژنان و کچۆلان بێ ڕووبەند گوێیان لێ دەگرتن، چونکە حسابی مەحرەمیان بۆ دەکرین، ئا لەو کاتەدا من عاشقی کیژی شاهـ زولفەقاری عەتاری بووم کە جێگری شێخ بوو. کەوکەب ئەو کچە شۆخ و شەنگ و نازەنینە، کە هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە. لە تەکیە بە خەیاڵی ئەوە ڕووبابم دەژەند، تا ئەو کاتەی ئەو کچە تاقە درا بە کوڕی سوڵتانێکی دۆستی بابی، ئیتر من تەواو پێم لە تەکیە بڕی و سوێندم خوارد کابول کە بۆ من کاولە جێ بهێڵم. ئیتر وەک ئەوانەی تری مەملەکەت دیارە کە شوێنی خۆم جێهێشت لێرە خۆمم دیتەوە، وەک ئەوەی دەستێک پێش من هەموو شتی دانابێت.

دوای حیکایەتەکەی تۆیش بەتەواوی لەگەڵ تەمبورژەن و میحرابەدیندا بووینە دۆست. ڕۆژێک ئاگری عەشقی کەوکەب لێی دابوومەوە، ئەو ڕۆژە نەمزانی چی بکەم بە کوچەکانا دەڕۆیشتم، لە پڕ هات بە مێشکمدا بچم بۆ لای میحرابەدین لە تەکیەی گەیلانی، دڵنیا نەبووم لەوەی بە ڕووبابەوە بچم لێم تووڕە دەبن یان نا، چونکە تەمبور ڕێ پێدرابوو، بەڵام هێشتا شێخ ڕێی بە ئامێری تر نەدابوو، ئەو ڕۆژە بەو ئاگرەوە چوومە زیارەتی پیر یەعبوبی خاسان، دوای نەختێ خولامەوە ئەوسا خۆم کرد بە تەکیەدا و میحرابەدین بە وتنی مەلا ممەد جان و عەشقی سەرهەڵدراوەی کەوکەب ڕێی تەکیەیان پێ کردمەوە. لەو حەلەوە بۆ کوڕی زیکری شەوانی هەینی من و برام بە یەکەوە دەژەنین و میحرابەدینش غەزەلان دەچڕێت.

# شەوی سی و شەش

یەزدانی دلۆڤان لە قورعانی کەلامی شەریفی خۆیدا دەفەرموویت: "ئەو زاتە بە هەر کەس بیەویت و شایستە بێت حیکمەت و دانایی پێدەبەخشێت و هەر کەس حیکمەتی پێببەخشرێت، ئەوە بێگومان خێرێکی زۆری پێدراوە، جا بێجگە لە ژیر و هۆشمەندەکان کەسانی تر لەو بەهرەیە تێناگەن و پەند وەرناگرن." دانایی و زانایی، بۆ پیاوانی خوداپێدراوە، ئەوانەی بۆ خوا سوڵحاو و بۆ میللەت ڕەنجدیدە و بۆ خۆ ماندوون.

ئیبن حاتەمی مەغریبی تەبیب باشیم. چینییەکان وتوویانە ئەوەی کە دەزانێت، مەعریفەکانی خۆی دەرناخات، ئەوەی مەعریفەکانی خۆی دەردەخات، نازانێت. بە دەمکردنەوەی ئەمشەو، منیش دەچمە ڕیزی نەزانانەوە. دەی کەوایە ئەمشەو گوێ بۆ نەزانێک بگرە، تا زانایی خۆت و دانایی خۆتت بیر بێتەوە، دە ئەمشەو لە نەفامی من ورد بەرەوە و گەوهەری ونبووی خۆت بدۆزەوە. مەگەر ئەو پەندەت نەبیستووە، خوری خۆم نادەم بە زیوی تۆ! دەی ئەوە لەوەوە هاتووە:

دەمی خۆی کابرایەکی بێ قەناعەت دەبێت، دەڵێن پاشا داوای کردووە، هەر کەس هەر کاڵایەکی بەنرخی هەیە، بیهێنێت لە بەردەرکی دابنێت، پاشا ئەگەر بە دڵی بوو، بە نرخی دوو بەرامبەر لێی دەکرێت. هەر کەسە کاڵای خۆی لە هەرچی هەیبوو دانا، کابرای بێ قەناعەت دە کاسەی زیوینی قەدیمی هەبوو، لە ماڵ دەری نەهێنا، وتی: ئەگەر زێڕ بووایە دەمبرد، چما زیویش بووە چشتی بەنرخ؟ چووە بەردەرگا، دیتی هاوسێی دیوار بە دیواری ڕاخەرێکی داخستووە، باوەشێک خوری پشقلاوی داناوە، کابرای لێی دەپرسێ چما ئەوەش بووە کاڵای قیمەتدار؟ خاوەن خوری وتی: بۆ چ بە تۆیش دەڵێت بە ئاوەز، من خوری خۆم نادەم بە زیوی تۆ، چونکە زیوم هەبایە وەک تۆ بێ عەقل دەبووم، خودا خوری و عەقڵی پێداوم دەزانم بە پاشای بفرۆشم. ئەوجا کابرا دەزانێ کە ئەم چ بێ ئاوەز بووە، شتی خۆی بە هێند وەرنەگرتووە. دەچێت کاسەکانی دێنێت و دەیخاتە بەردەرگا، بەڵکو پاشا بیانکڕێ. دەی بەشکو تۆیش بەم قسە نالایقانەی من قسەکانی خۆتت بیر بکەوێتەوە و زیوی خۆت بخەیتە بەردەرگا.

دەکرێ پیاو هەموو شت بزانێ بێ ئەوەی لە دەرگای ماڵەوە بچێتە دەرەوە، بێ ئەوەش لە پەنجەرەوە بڕوانێ دەکرێت ڕێی ئاسمان پێ بزانێ، ئەمە بیرکردنەوەی چینییەکانە، بەڵام من ئەمەم چۆن زانیبایە، ئەگەر بە گوتەی پێغەمبەر نەچووبامایە تا چین؟ کاتێک چوومە چین، جا زانیم مرۆڤ هەیە دەتوانێ لە چوارچێوەی دیواردا بێت و سەفەری دنیا بکات، دەی ئەوە تۆیت لێرەوە سەفەری چین بە ئێمە دەکەیت، بەڵام خۆت لە ماڵەوە دانیشتوویت. ستایش بۆ تۆ، دانایی لە خوداوەندەوە فێربوویت و تاریکیت لە نەفامانەوە ناسی. دەی خودا خۆی باڵی لە زەوی کەوتووت بەرز بکاتەوە و نووری مەعریفە

ڕێت ڕووناکوەشێن کات. دەی جوانیناسیت بە هاناتەوە بێت و هونەردۆستیت ڕۆحت پێ بداتەوە. هەمووان لە مەراقی تۆدان و بزەیەکی تۆ سەدان کەس لەو خوارەوە دڵخۆش دەکات، گریەیەکی تۆ تاریکی دەبارێنێ. دەی ئیلاهی ڕەنجی خۆت و ئێمەیش بە با نەدەیت، کە نزیکین لە نەمان و دوورین لە جاویدانی. بە بایەکی کەلیمەت مەملەکەت وێران دەبێت و بە تیشکێکت ئاوەدان. خۆت دەتوانی تۆفان بنێریت، هەر خۆیشت بمانکەیتە سووتوو. بەڵام ئێمە لە تۆ زۆرتر ڕادەبینین و دەمانتەوێ یارمەتیی خۆت و ئێمە بدەی.

حەکیمە ئێرانییەکان بەوە یارمەتیی خۆیان و نەخۆشیان دەدا، بەرامبەر بە چوار بنەمای بوون دەستەونەزەر دەوەستان، ئاو، با، خاک، ئاگر. لەسەر ئەو بوونە دەیانزانی نەخۆشەکانیان چییان هەیە. بەڵام خاتوون تۆ خۆت بە تاقی تەنیا هەر چواریت هەیە، تۆ کەم نیت، تۆ ئەفرێنەر و ڕووخێنەر، تۆ بەخشەر و لێسەنەرەوەی. هەستەکانی تۆ ڕووخان و سەندنەوە نییە، دروستکردن و بەخشینە. هەستە، لە بری هەموو ژیانت بیمانگێڕەوە، هەستە و دەست بدە قەڵەم، یاوی تۆ، تای دەرهاتنی ددانی منداڵێکە، تا بتوانێ باشتر بجوێت، تۆیش ئەم تایەت دانی مەعریفەت دەردێ و دەتوانی زەمەن بجویت. هەستە لەرز و دانەچۆقەی تۆ، هیی سەرمای زستان نییە، هیی ڕووتییەکە، ئەوکاتەی ژیان هەموو شتمان لێ دەسێنێتەوە، تۆ بەرگێک بۆ خۆت بدروو. هەستە، لە خوارەوە ژنان نەزرت بۆ دەکەن گاڵگاڵی و ناوساجی و لوقمەت بۆ دەبەخشنەوە، پیرەژنان دوعات بۆ دەکەن، پیاوان ڕێگەت بۆ دادەنێن، کوڕانی جحێڵ لە پێناوت ئامادەی جەنگن. هەستە و بیانبینە، شار ئاوێنەیەکە خۆتت پیشان دەدات.

حیکمەتی تۆ، لە خولقاندن و جێهێشتن و فەرامۆشکردندا، وەدیار نایەت، دانایی تۆ لەوەدایە، لە مشتێ خۆڵەمێش و ئاوی چاوت میرزا ئادەمت خولقاند، دانایی ئەوەیە لە شتی کەم، کالای بە قیمەت دروست بکەیت، لە پشقل دەوا! وەختێ خۆی حەکیم مەنسوری شەباهەنگ یادی دام، دەوای دەردان، تەنێ بە گیابەند و هەنگوینی کێوان و پەڕی سیمورغان نییە، دەوا دەکرێت پشقلان بێت. حەکیمی شەباهەنگ بۆی باس کردم، چۆن جارێک نەخۆشێکی دەوا کردووە. دەگێڕنەوە نەخۆشەی ئەم، جحێڵێکی ڕەبەنە، خۆی و تاقە خوشکێکی لەتەک داکێکی پیریدا دەژین. تاقە خوشکەی وەک ماینی کوێتی، ڕەسەن و هەڵکەوتوو لەبارە، نازەنینە و دلبەرە، ئەوەی کە بە مەجاز شنەفتووتە برای خۆی حەیران دەبێت، ئەمە هەر بە ڕاستەقینە، برای خۆی حەیرانی دەبێت و شەوێک دەیەوێت بچێتە باخەڵی، کچە هاوار دەکات، دایکەی وەخەبەر دێنێ، کوڕە لە تاوانا دەچێتە دیوێکی تر و دەرکە لەسەر خۆی دادەخات، تا بڵێن پشیلە بووە و کیژە ترساوە، بەری بەیانی ئاوایی لە تاو ناڵەی کوڕە وەخەبەر دێن، دەناڵێنێ پڕ بە دێ، وەختێ دەرکەی لێ ئاوەڵا دەکەن، چی دەبینین باری تەعالا، کوڕە ماسیوە، هێند ماسیوە بیلا تەشبیە دەڵێن ئێستە دەتەقێ. شەباهەنگ دەیگێڕایەوە کە خۆی دیویەتی چۆن ورگی ماسیوە، خاتوو شەهرەزاد، خەڵکانی ئەوسا پاکبوون، ئەگەر غەل و غەشێکیان هەبایە، خودا لێی وەدەردەخستن، لێی قەبوڵ نەدەکردن. بۆیە جحێڵە وەها هەڵماسی، ناردیانە شوێن حەکیم مەنسوری شەباهەنگ، هەموو دێ لە دەوەری جەم ببوونەوە، حەکیم کە دەچێت لە مەسەلە حاڵی دەبێت، دەڵێت پشقلی مەڕێکی ڕەشی تازە زاوم بۆ بێنن، دەچن پشقلی تەڕی بۆ دێنن، حەکیم دەیکوتێت و لە ورگی کوڕەی دەنێت، جا ماسینەکەی نەختەنەختە دەنیشێتەوە. بە شتێکی بێفەڕ ژیانی بنامێک ڕزگار دەبێت. خاتوو، ئەگەر ئێمە بە بێفەڕیش دەزانین حیکمەتی تۆ لە وەگەڕنانماندایە، بمانخەگەڕ بمانگێڕەوە.

حیکمەت و چارەسازی لە تێفکرین و وردبوونەوەدایە، ورد بەرەوە، کتێبانی دانایان بخوێنەوە و تەماشای دەستی

تەبیبان بکە. وەختی خۆی حەکیم مەنسووری شەباهەنگ ڕێی دەکەوێتە مەملەکەتێک، کە بە قەستی گیاکۆکردنەوە و تێفکرین لە گەلایان و گولان چووە. خەڵکی مەملەکەت دەڵێن، لاوی غەوارە، خودا تۆی ناردووە، تا بتکەینە قوربانی بۆی،ساڵی جارێک ڕێبوارێک دەکەوێتە ئێرە، دەیکەین بە خەڵاتی خودایی. لە بن کێوی شارەکەمان، ئەشکەوت و قوربانگای خوداوەندی لێیە. حەکیم مەنسوور دەگرن و لە ئەشکەوتی دەپەستێون. ڕەسمی ئەو مەملەکەتە وەهایە تا چل ڕۆژ دەرکە دادەخەن، دوای چل ڕۆژە بەردە ئەستووری دەم ئەشکەوت لادەبەن تا بزانن ڕۆحی پێشکەش بە خوداوەندیان کراوە. حەکیم و مامۆستاکەی منیش، کوپەڵێک هەنگوین و گوڵە بەیبوون و گیای تەرخونی پێیە. کاتێک دەچێتە ئەشکەوت، دەڕوانێ، نە دێوی لێیە نە درنج، گۆمێک ئاوی لێیە، وەختێک بۆنی دەکات، هەست بە بۆگەنی دەکات، ئاوە مەنگە و تاڵە. ئەویش سێ ڕۆژ جارێک لە تینواندا نەبێت نایخواتەوە، جا کەوچێک هەنگوین دەکات بەسەریدا، بەو شێوەیە، چل شەو و چل ڕۆژ دەباتە سەر و نامرێت. کە چل تەواو دەبێت، خەڵک و خوای مەملەکەت دێن و گابەردی دەم ئەشکەوت لا دەبەن، دەڕوانن حەکیم مەنسوور زیندووە، دەترسن و دەڵێن، تۆ پیرۆزبوویت خودا دڵی نەهاتووە، ئەم قوربانییە وەربگرێت، بۆیە لەمەو پاش تۆ دانا و حەکیم و وەکیلی خودای مەملەکەتی ئێمە بە. حەکیم مەنسور بەو دانایییە خۆی ڕزگار کرد و دوایش بوو بە ئەستێرەی ئاسمانی دانایی. دە تۆیش خاتوون حیکمەتی خۆت بە گێڕانەوەی حیکایەتەکەت دەرخە!

# شەوی سی و حەوت

به ناوی ئەو کە خۆی ڕێنماییکەر و ڕێنیشاندەرە، خۆی ڕێگەم بۆ دەدۆزێتەوە و نایەڵت ون بم، سەرمەدی قاسیدم. نامەبەری پەیغامبەر و هێنەری مەملەکەت، ڕاسپاردەگەیەن و ئەمانەتدارم. هەمیشە گوێ لە مستی تۆم، بیرم نایەت لە هەزاران جار، تاکە جارێکیش بووبێت بێ فەرمانی تۆم کردبێت، کێت ویستبێت چووم دۆزیومەتەوە ڕاسپاردەم پێگەیاندووە، نامەی زۆرێک لە کوڕانم بۆ کچان، دیاری زۆرێک لە کچانم بۆ کوڕان، ئەمانەتی بازرگانانم بۆ منداڵیانیان، دیاریی سوڵتانانم بۆ شاهان گەیاندووە. کاری من بردنە، هەرگیز دەست بۆ نامە و تۆماری کەس نابەم، ناپرسم چییە، بۆچی بۆی دەنێرێت، من ئەوە فێربووم سندووقیکی قوڵی نهێنییەکان بم. وەختێ سەرمۆرم کرد کەس نەزانێت چی لە هەناودا هەڵگرتووە. خەڵکانێکی زۆر کە نامەیان دەدەمێ، پێش ئەوەی بیکەنەوە، پرسیارم لێ دەکەن، نامەکە باشە یان خراپ، هەواڵی خێرە یان شەڕ، بەڵام هەرگیز هیچیان لەو بارەیەوە پێ ناڵێم، من ئەو پێیەم ناچمە ناو حەرەمی خەڵکەوە. نهێنیی هەمووان دەزانم، بەڵام پیشەکەم ئەوەی فێر کردووم ئەو نهێنیانەم خۆشبوێت و نەیان درکێنم. زۆرجاران درودی خەتخۆش بە شۆخییەوە دەستێک بە شانما دەدات و دەڵێت: سەعادەت بۆ تۆیە، دڵخۆشیی کچان دەبینی کاتێ نامەی دۆستیان دەخوێننەوە، فرمێسکی کوڕان دەبینی کاتێ یاریان شوو دەکات، پێکەنینی بە قاقای ژنان کاتێ هەواڵێکی زۆر شادیان بۆ دێت، ناز و خەمزەی نەوشکۆفان کاتێ دیارییەکیان بۆ دەچێت، یان شۆخی و قسەی هەڵەق و مەڵەقی هەندێ لە کچان هەر لەگەڵ منە، ئیدی هەموو ئەوانە نسیبی تۆیە. بەڵام هەروا بەو ئاسانییە نییە کە درود دەڵێت، چونکە کارەساتە قووڵەکانیش هەر بۆ منە، من شاهێدی کارەساتەکانی دوای گەیاندنی پەیامەکانم.

جارێک نامەی قەیرەکچێکم درایە دەست بۆ کوڕێکی بێ کەسی ببەم، کەماڵیان لە نزیک خەرەندەکەی مەملەکەتە. ماوەیەکی زۆر دڵ و دڵداربوون، برای کچە دەیوت وەختێک دەتدەم بەو کوڕە، خوشکەکەیم بداتێ، لە کاتێکدا کوڕە خوشکی نەبوو، دایک و باوکێکی پیری هەبوون ئەوانیش مردبوون. ساڵانێک بوو کچە بە دیار کوڕەوە، کوڕە بە دیار کچەوە مابوونەوە. تا ڕۆژێک برای غەدار کچە دەدات بە ژن بۆ خۆی، ئەویش بە پەلە ئێوارەی بەر لە بردنی، بە خەتێکی زۆر گران و ناخۆش و نەخوێنراوە، نامەیەک دەنووسێت و دەیدات بە کورێژگەیەکی کوچەیان تا بیداتە دەستم، منیش بە غار گەیشتمە کوڕە و نامەکەم پێدا. هەر لەوێدا نامەی کردەوە، خوێندییەوە و ڕەنگی پەڕی، تف لە دەمی وشک بوو، دەستی کەوتە لەرزین. نوزاندنی: کێ ئەمەی دایە دەستت؟ وتم: کورێژگەیەک بوو. کە دڵنیابوو لەوەی ئەو

نامەی یارەکەیەتی نامەکەی فڕێدا، سووک و ئاسان چووە لێواری خەرەندە و خۆی هەڵدایە خوارەوە. هەموو ئەمانە لە چاوترووکانێکدا ڕوویان دا، من دەستم شل بوو، جانتا گەورە چەرمینەکەم فڕێ دا و ڕامکردە لێوار خەرەندەی قووڵ، بەڵام هیچم نەدی، هیچ هیچ، چونکە ئیدی خۆی کردبوو بە قوڕگی هەڵدێر و کەندڕ و تاریکی پڕ لە دڕک و داڵدا! ئەژنۆم سست بوو کەوتمە ئەرز، نەمزانی چی بکەم، قوڕی کوێ بکەم بەسەرا، لەو تاوانە بەشدار بووم، کە نەمدەزانی چییە. کەوتبوومە ئەرز و بۆ دەقەیەک کاغەزەکەم چاوکرد، گوڕێکم تێهاتەوە و بە پەلە هێنام و خوێندمەوە، نووسرابوو:
درام بە شوو...
لە خوارەوەش ئیمزایەکی ناشرین و بێ ناو. ئێستاش ئەو نامەیە ماوە، من نەمەزانی چی بکەم چی بڵێم. بەڵام خاتوون کەس ناوی ئەو کوڕ و کچەش نابات، لەو کەسانەن کە دەمرن بۆ ئەبەد ون دەبن، کەس باسیان ناکات. ئیتر وەها دابەشکراوە، مەرگی هەندێ کەس بیر دەچێتەوە، هەندێکی تر هەرگیز مەرگیان نابیسرێت، هەندێکی دەبیسترێت، بەڵام کەس دڵی داناچڵەکی. ئیتر وەهایە.
ئەو نامەیەم هەڵگرتووە و پێمە، زۆر نامەی دی کە هەرگیز کەس وەری نەگرتوون، زۆر نامەم پێن فڕێ دراون، زۆر نامەی تریش کەس نەبووە بۆی ببەم، لای خۆم هەڵم گرتوون.
لە مەملەکەتت وابزانم تاکە کەسێ نەچووبێتە حەکایەت تا ئەوەی ڕووداوێک ڕوویدا، منم. من ئەوانم دەهێنایە حیکاتخانە، بەڵام ئەی ئەگەر منت ویستبایە کێت دەنارد بە شوێنم دا؟ جارێکیان ناردتم بە شوێن غوڵامێکی کاکۆڵ قەترانی کۆشکدا، ئەو شەوە حیکایەتت بەو دەرۆی بە ڕێوە، بەڵام نەهات. وتی نەخۆشم دەرەتانم نییە، منیش قسەکەی ئەوم گەیاند وتم:
- دەڵێت: نەخۆشم دەرەتانم نییە، وتی ئەی نەخۆش بوو؟ منیش وتم نازانم!
تۆ لەوە توورە بوویت دڵت تەنگ بوو، کە بێ فەرمانیت کراوە، حیکایەتخوانت بانگ کرد تا بزانی حیکایەتی ئەو چلۆنە؟ ئەویش بۆی گێرایەوە کە ئەو کوڕە کاکۆڵ قەترانییە، شەیدای کچی بازرگانیی زەنگینی مەملەکەتە، کچە جەوابی نەداتەوە، کوڕە وتوویەتی چۆن نیشانت بەم کە عاشقتم؟ کچە بە نیگایەکی جانخەراشەوە وتوویەتی: بەوەی بێ ئەمری شەهرەزادی زاڵم بکەیت، تابزانم تۆیش وەک هەمووان نەفام و بێ ئاوەز نیت، لەژێر فەرمانی ژنێکی ڕق لە دڵدا بیت!
خاتوون کە ئەمەت بیست توورەییت نەما، بەڵام چاوم لێ بوو چۆن بێتاقەتی نیشتە سیمات و مات بووی. بێدەنگییەکی کپ باری بەسەر حیکایەتخانەدا، بە دەنگێک کە لەناو چاڵێکی تاریکی دوورەوە بێ، وتت: باشە بڵاوەی لێ بکەن، ئەمشەو حیکایەت نییە. من زۆرم لە خۆم کرد و بەوپەڕی شەرمەوە وتم: خاتوون دەتوانی ئەمشەو حیکایەتێکت هەبێت بە من بەڕێوە بچێت؟ تۆزێک وەستایت ئەوجا وتت: تەتەر ئەفەندی حەز دەکەیت؟ کە بتەوێ نیشانم بدەی ڕێزم دەگری یان دڵم ڕادەگری پێم دەڵێی تەتەر ئەفەندی. وتم بەوپەڕی حەزەوە! ئینجا دەستبەکاربووین و وەها حیکایەتت گێڕاوە:
لە شارێ لە شارانی وەک جزیرەی بۆتان، یان بایەزید یان وان، نامەبەرێکی ئەمانەتپارێز دەبێت، نامەی هەموو مەملەکەت خۆی دەیبات، وڵاتان دەچێت و شاخان و کێوان دەبڕێت. دەچێتە جەرگەی شەڕەوە و ڕوو دەکاتە شاری دێوان، سڵ لە هیچ ناکاتەوە، نە لە تۆفی زستانی کوێستان، نە لە گەرمای مرۆڤپرووکێنی گەرمیان. گرنگ ئەوەیە پەیامێکی پێ بێت، گرنگ نییە بۆ کوێ بێت، دڵنیابە ئەو دەیبات. ساڵانێکی زۆرە نامەی نهێنیی دڵداری کوڕان و کچان بە یەک دەگەیەنێت، نامە نییە بیەڵێت بێ وەڵام بێت، تەنانەت ئەگەر کەسەکەش بیەوێت وەڵامی نەداتەوە، نامەبەر دەڵێت تکا دەکەم وەک وەڵام

یەک پیت بنووسە تا هەست نەکات من درۆم کردووە نامەکەم نەبردووە، هیچ نەبێت بنووسە نا. بەڵام مۆر و ئیمزات. ئیدی بە قسەیان دەکرد، زۆر جار هەر ئەو وەڵامە کورتە دەبووە دروستبوونی پەیوەندییەکی عاشقانەی قووڵ، کە دواتر ئەفسانەی لێ دەخولقا. ئاوها کورە نامە دەبات و دێنێت، بەڵام هەرگیز نامەی بۆ نایەت، هەرگیز هیچ کەسێک نییە نامەیەک بۆ خۆی بنێرێت. ئەو کورە لە کاری خۆی سارد نابێتەوە. ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر تاسەی وەها نامەیەک دەکات. حیکایەت وەها دەبێت، ڕۆژێک یەکێ لە مەحبوبترین کچانی مەملەکەت نامەیەکی پێدا دەنێرێت، کورەی پۆستەچی هەرچەند تەماشای بەرگی دەکات، ناتوانێت بیخوێنێتەوە و مەنزڵ پێ نازانێ، لە یاسای ئەویشدا شوورەییە پرس بکاتەوە بە خاوەنی نامە بڵێ بۆ کێی ببەم. دەبێت بزانێت. بۆیە چەندان ڕۆژ نامە دەهێنێ و دەبا خاوەنی نامە نادۆزێتەوە، بە زۆر کەس دەڵێت کێ چاوەڕێی وەها نامەیەکە هیچ سوودی نییە، مانگ دێت و مانگ دەڕوات، هەر نازانێ نامە بدات بە کێ، جارجار کیژە دەڵێت وەڵامی نامەکە نەبوو! نامەبەریش سەرێک دادەخات و دەڵێت هێشتا نا، ناشڵێت نەیگەیاندووە، کچە زۆر دڵگران دەبێت، ئیدی نامەی دووەم دەنووسێت، دیسانەوە هەر وەڵام نابێت نامەی سێیەم دەنووسێت و ڕۆژ بە ڕۆژ حاڵی خراپ و لاواز دەبێت، لە نێوان سێ نامەکەدا ساڵێک دەگوزەرێت، ڕۆژێک کچە زۆر داغان دەبێت، جواب دەنێرت بۆ نامەبەر ئاخر نامەی بگەیەنێت، چونکە تەبیباشی وتوویەتی هێندە ناژی، لە ئانوساتی ڕۆحدەرچووندایە. نامەبەریش کە حاڵی وەها دەبینێت خەجاڵەت دەبێت، شەو بەوپەڕی ترسەوە و دزی لە پیشەکەی دەست بە کردنەوەی نامەکان دەکات، دەیان خوێنێتەوە، تەماشا دەکات، کچە شەیدای ئەم بووە و نامەکانی بۆ وی نووسیوە، بەڵام ئەم هەستی بەوە نەکردووە و لەو پەیامە نەگەیشتووە، بۆیە بە پەلە و بەو نیوەشەوە دەگاتە لای کچەی مەحبوبی نامەحبوبی کە پێی نەزانیوە وەک شێت گڕ لە دڵ و هەناوییە بەر دەبێت، دەست دەخات دەستی و پێی دەڵێت: من وەڵامی نامەکانم، کچە زەردەخەنەیەک دەکات و دەڵێت: باش بوو وەڵامم هەبوو، ڕۆح دەسپێرێ. ئیدی لە دوای ئەو مەرگە ناوادە و ئەو برینە قوڵەوە، پۆستەچییەکە هەرگیز نامە ناهێنێ و نابات، قەسەم دەخوات تا ئەبەد یەک پیت نەنووسێت.

ئەوە یەکەم و دواحیکایەت بوو منی تێدا بم. من نازانم وەک خۆت بە پێزەوە بیگێڕمەوە، هەموان دەزانن هەموو قسەیەکی من چەند ڕستەیەک زیاتر تێپەڕ ناکات، بۆیە دەبێت لە قسورم ببووریت.

# شەوی سی و هەشت

بە ئیسمی ئەعزەم دێم و بە ناوی ئەویشەوە دەست پێدەکەم، روبحعامی موساییم. لە مەملەکەت بە جادووباز و نوشتەنووس و تەڵەکەباز ناسراوم. خەڵکی ئێرە ناوەکەمیان بۆ گۆ ناکرێ پێم دەبێژن موسایی سنەیی. بە جۆرێک باسم دەکەن، وەک ئەوەی من خراپەکار بم. بەڵام من چم داوە لێرە و لە جادووبازی ئەگەر حیکایەت نەبێت و لەبەر تۆ نەبێت. دەستم بەتاڵە نازانم چی بکەم، بۆیە نوشتە و جادوو دەکەم، فاڵ دەگرمەوە، سەیری ئەستێران دەکەم. ئەوەش بۆ یەکەمجاری چوونە ناو حیکایەتێکی تۆ دەگەڕێتەوە، دوای ئەو حیکایەتە من هیچم بیر نەما نازانم چی بووم و چۆن بووم، بەڵام هێند هەیە منت خستە حیکایەتێکەوە و وتت تۆ جوویت، بەوەش دینی منت جودا کرد لە موسوڵمانان، وەک ئەوەی ئەوان توک و دوعا نەکەم و شەریفی قورئانی بن. ناوت نام موساییەکی سنەیی، وەک بیرم بێتەوە وەهات گێڕامەوە:

موساییەکی سنەیی هەبوو، جۆی بە دیوارا سەر دەخست، بیرتە کامە بوو؟ ئەوەی کچە سوورکارەکەی کە دەیەوێت شوو بە پسمامی خۆی بکات. بەڵام ئەو نایەوێت و دەڵێت من بە چاوی خوشکی خۆم دیومە و مەیلم ناچێتە سەری. حیکایەتەکە وەها بوو، ڕێگەت بۆ کچە دانا، تا لێرەوە بگاتە سنە و من لە کۆڵانێکی تەسکی خواردووی شاردا بدۆزێتەوە و بڵێت: نوشتەیەکم بۆ بکە، ئەو پسمامەم لە گشت عومری درێژ یان کورتیدا تا ئەبەد توخنی هیچ مێینەیەک نەکەوێت، من نەبێت. موساییەش دێت قوفڵێکی نفت و نوێ دەهێنێت و چل کەڕەت ویردی شەیاتینی شەرقی و چل کەڕەت ویردی شەیاتینی غەربی و حەوت جاریش پەیماننامەی ئیبلیسی بەسەردا دەخوێنێ و دەیداتە دەست کچە. دەڵێت: بڕۆ تورِی بدە ناو بیری چل مەتر قووڵەوە، یان تۆی دەوێت بۆت شێت و هار دەبێت، یان تا ئەو قوفڵە نەڕزێ و نەکرێتەوە ژن ناهێنێت. کردنەوەی ئەوەش هەزار ساڵی ڕەبەقی تەوێ! دوای ئەو حیکایەتە پیشەم بوو بە نوشتەکاری. زۆن ئەوانەی بۆ نوشتەی جۆراوجۆر دێنە لام. شت نییە لێم عاسی بێت، بەڵام بێ لە من کەسی تریش هەیە لێرە شتی لێ عاسی نابێت. زۆرجار هاتوون دوعایان کردووە، بەڵام دوعایەکی قورستر هەبوو ئەوەی منی مەحف کردۆتەوە.

خاتوون من نهێنیپاریزم، بەڵام شتێک هەیە لای تۆ باسی دەکەم. ساڵانێک لەمەو پێش کچێکی دڵبەری بازرگانی مەملەکەت هاتە لام، وتی دەردم کارییە، چارم ناچارە، بارم لارە. منیش وتم دەتەوێ دێوت لە کێوان بۆ بێنم؟ یان کوڕی خاقانی چین؟ دەتەوێ بتکەم بە شاژن؟ یان ئەفسانەی مەملەکەت؟ وتی هیچان، دەمەوێت کوڕی کافور ڕەنگی کاکۆڵ قەترانی کەمەر زێڕین، شەیدام بێت. منیش وتم ئەوە ئاسانە نە دێوە لە شاخان بێ، نە شازادەی چین و ماچینە دوور بێت، سەد لیرەم بۆ بێنە، کارت تەواوە. وتی چۆن؟ وتم کەی هێنات بە مۆڵەتی حەوت ڕۆژ وەک سەگ لە قاپیت دەکەوێت. تاقێکی

نەبرد کچە سەد لیرەی هاورد، وتی: بۆم بکە، جادووەکەم بۆ بکە. منیش هاتم لەسەر ناڵی کەر، ویردێکم هەڵکەند و سێ جارانم لە هەنگوینێوم هەڵکێشا، وتم ئەم ناڵە بخە ناو ئاگرێکی نەکوژاوەوە، کورەیەک کە هەرگیز نەکوژێتەوە، ئینجا حەوت ویردی ترم، لەسەر پێستەیەکی گورگ بۆ نووسی، وتم: لەبەر ڕەشەبا هەڵیواسە. بای لێ نەبڕێ ئەگەر تا حەوت ڕۆژی تر دەنگی نەبوو، وەرە دوو سەد لیرەت دەدەمێ. کچەی بازرگان نەهاتەوە بۆ لام، بەڵام دەنگۆ بڵاوبووەوە کە کوڕەی کەمەر زێڕین شەیدای کەنیشکەی بازرگان بووە، کچەش دەڵێت من شوو بە غوڵامان ناکەم. دەڵێن: تەنانەت وتوویەتی دەبێت لە تۆ یاخی بێت ئەوسا شووی پێدەکات. دەڵێن: تا خۆی سەنگین کات داوای پەڕی سیمروغی کردووە، کە بیستم پێکەنیم، گوتم: سەیری عەقڵی ژن ئەتۆ دنیات داگرت، تا ئەو کوڕەت شەیدا کرد، ئێستە دەیکەی بەگژ خاتوون و قولەی قافا؟ ئیتر ئەوەی تریش خۆت دەیزانی کە دوای کوڕە شەیدای کچە کەنیزێکی خوێنگەرم بوو. ئەو کچە نەهاتە کن من جادوو بکات، بەڵام دەڵێن چل ڕۆژ بەڕۆژوو بووە، نەک بۆ ئەوی کوڕە شەیدای بێت، نا تەنها بۆ ئەوەی خوا بیپارێزێت و بە سەلامەت بگەڕێتەوە مەملەکەت. ئیدی ئاخرییەکەی کوڕەی کاکۆڵ قەترانی هەر بەڕاستی شەیدای ئەو کەژاڵە بوو.

کچێک لێرە هەیە و دەڵێن دۆستی تۆیە، زۆر جار دیومە چۆتە مەرقەدی پیر یەعقوبی خاسان، هەڵبەت چۆتە تەکیەی گەیلانی و تەنانەت دەڵێن چۆتە مەیخانەکەی سلێوەشەوە، دەڵێن دۆستی نزیکی تۆیە. زۆر خەمبار دەیبینم، زۆرجاریش دەیبینم دەموچاوی هەڵبەستووە، جارێک لەوپەڕی بێتاقەتیا دیم، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، دەموچاوی خڕی داشۆڕابوو، چاوی بە قووڵا چووبوو، وتم ڕووباب وەرە قاوەیەکت بۆ بگرمەوە، وتی: کەچی ڕووبات؟ وتم ئەوەی دەتەوێت، وتی: هیچم ناوێت. وتم بۆ نموونە بە جادوو یەک یوسفی سانی زەمانت لە میسر بۆ بهێنمەوە؟ وتی: نا لەبری ئەو قاوەی بۆم دەگریتەوە بۆم بێنە با بیخومەوە، تا گەرمم بێتەوە. قاوەیەکمان خواردووە، ئەو ڕۆژە چیرۆکخوان حەکایەتی خورشید و خاوەری ئەگێڕایەوە، دڵی تەنگ بوو، دەموچاوی بێتاقەتتر بوو. چیرۆکبێژیش ئیحترامی تایبەتی دەگرێت، ئەو ڕووبابەیە ئەگەر ویستبای من شیری مەل و شاخی کەڵەشێرم بۆ پەیا دەکرد تا دڵی خۆش بێت، بەڵام نەیویست، وتی: جارجار بۆ دڵتەنگی دەچم بۆ پیر یەعقوب و جارجاریش لە مەیخانە گوێ لە توراب دەگرم، فەرقی نییە، بۆ ئێمە کەعبە و بوتخانە یەکێکە. شاڵە قورسەکەیدا بە شانیدا و ڕۆیشت. جارێک ئاوێنەم دانا دوای وردی و ئەوراد و پووش سووتان، ویستم ئەو کەسە ببینم کە ئەو دڵی بۆی تەنگە، خاتوون، بەشەرێکم دی لەناو زیندانێکی یەک گەزیدا باوەشی بە ئەژنۆیدا کردبوو سەری خستبووە سەر ئەژنۆ نەمتوانی ببینم. بەڵام لە جێی خۆمەوە حەوت ویردم لە قاپێکی چینیدا نووسی و گوڵاوم تێکرد تا بشۆرێتەوە تێکەڵ بە زەعفەرانم کرد، لە شووشەیەکم کرد و بە سەرمەدی قاسیدا بۆم نارد، وتم: دەزانم بڕوای بە هیچ نییە، بەڵام لەبەر دڵی من بچۆ سەربان بیپرژێنە بە شەرق و غەرب شیمال و جنوبی خۆتا، تا هەر نارەحەتییەکت هەبێت هیچ نەبێت لەسەرت سووک بێت. خاتوون جارجارە ئیشی باشیش دەکەین. بەڵام بیرت بێت تۆ لە بنەڕەتەوە ویستووتە ئێمە بە خراپ دانێیت و تازەش وا ناومان ڕۆیشتووە، چار چییە؟ من خۆم گوێ نادەمە قسەی مسوڵمانان بۆ کاری خۆم ئایەتی قورئانی و شەیتانی و ئیسمی ئەعزەم و ڕەمز و ڕاز بەکار دێنم. جارێک لە زاهیدێکی پیرەوە فێر بووم، دەیوت قورئان دەردی هەموو دەرمانێکە، بەڵام دەبێت تۆ لێی بزانیت، ئەم ماوەیە کە دەنگۆی نەساغی تۆ بڵاوبوو، چووم دۆزیمەوە، لە بن کێوە سوور ئەشکەوتێکی لێیە، لەوێ عیبادەت ئەکات، وەک زیندووی ناو گۆڕ وەهایە. چووم

باسی حاڵ و مەسەلەی تۆم بۆ کرد، وتم قوربان تۆ فەرمووتە هەموو شتێک لە قورئاندا، چارەی چی دەردی بێ دەوایە، کەوایە شتێک بۆ شەهرەزادی خانم بکە. ئەویش فەرمووی پێی بڵێ سورەی مودەسیر بخوێنێت، تا شتی بیر بکەوێتەوە، جا فەرمووی ئەو کوزەیە ئاوە بێنە، گۆزەم دایە دەستی، سەری دانەواند بەسەریدا ئایاتی دەخوێند، ئەوەندەی من دانیشتم قسە دەکەم، ئەوەندە و نیوی پێچوو، کە تەواو بوو، وتم: قوربان ئەمە چی بوو خوێندت؟ فەرمووی سورەی مودەسیر حەوت ئایەتیم چل جارم خوێند، برۆ بۆی بێبە، یەکێک بیکاتە خورادنییەوە زەینی بەهێز دەبێت، لە فەرامۆشکاری ڕزگاری دەبێت. ئەوە گۆزەکەیە و خۆشم نوشتەی جنی سولەیمانم بۆ هێناویت، بیسووتێنە و بۆن بە دووکەڵەکەیەوە بکە، ئەوەیشی لە پشتی باوکتدا بووە بیرت دەکەوێتەوە.

# شەوی سی و نۆ

بە ناوی خودای پەردەپۆش، کە هەم خۆی لە پەردەدایە، هەم پەردە دەدا بەسەر هەر شتێکدا ئەگەر بیەوێ. شەهرەزاد لە کۆتاییدا دیمیت! تۆ ئەو شەهرەزادەی کە ئێمەت کردووە بە بەندەی خۆت، ئەو شەهرەزادەی ئێستە لە تونێی پێخەف کەوتووە و چاوت لە زارمە بۆ بیستنی حەکایەت، ئای تۆی دادە شەهرەزادا!

بەندە وامیقی ئاوفرۆشم، سۆح تا شەو بە گۆزەوە دەگەڕێم و ئاو دەفرۆشم، جارجارەش لە ڕای خوادادا ئاو ئەکەم بە دەمی ئەو ڕێبوارانەی نە پارەیان هەیە و نەپول، بزەیەکم پێ خەڵات ئەکەن کە بایی هەزار دراو و درهەمە. ئەوەتەی هەم لە مەملەکەتەکەت هیچ داوایەکم لە کەس نەبووە، تاکە داوایەکی عومرم ئەوە بوو بێم و حیکایەتخوانیت بۆ بکەم، بە زەحمەت پیاوماقوڵانم ڕازی کرد. زۆر گران، هێندە گران کە مەحاڵی مەحاڵ بوو، چونکە بەندە تاکە کەڕولاڵی قەلەندەرانم، ئەو ئاوفرۆشەی نە قسان ئەکات و نە گوێی لە هیچە، هەموو ژیانی جگە لە چەند ئیشارەیەک هیچی تر نییە. شەهرەزاد وا تەماشام مەکە، کەڕولاڵم لە مەملەکەت، وەلێ ئەو هەموو عومرەم بێدەنگ بەڕێ کرد تا ڕۆژی حیساب بگات و قسەی خۆم بکەم، حەکایەتی خۆم و بەڵای زارو زمانت بۆ بچڕم.

حەکایەتەکەی من لەم پیرەشارەت وەهایە، وەختێ تەنها کوڕێژگەیەک زیاتر نەبووم، لە تەک دایک و باوکە هەژارەکەمدا لە خوارووی شارەکەت دەژیاین، باوکم لەو پیاوە کەتە و لەو کوردە لووت بەرانیانە بوو، کە منالان بە تەماشاکردنی زارەترەک دەبوون، کۆڵکێش بوو، کە لەو ئاخریانەدا ئیتر کاری کۆڵکێشیشی نەئەکرد، بەیانی تا ئێوارە پاچێکی ئەبرد و بەرەو کێوەسوور ئەڕۆی، ئێوارێ عارقاوی، چڵکن و توڕەوتۆسن دەهاتەوە و بەهانەی بە دایکم ئەگرت. دایکم ئەگریا و دەیگوت پیاوەکە تۆ چیتە بۆ ئیش ناکەی؟ حەمدی خوا بۆ ناکەی، بەڵام باوکە شێتگیر ئەبوو بە لەقە ئەکەوتە گیانی. ڕۆژێک دایکم ڕایسپاردم بچمە شوێن باوکم و سەر لە کاری دەرکەم، منیش بەو ترسەمەوە شوێنی کەوتم، وەختێ دەبینم، باوکم خۆی ئەکات بە کۆڵانی خوارووی خۆماندا و لە دەرگای ماڵێک ئەدات نەختێ دەوەستێ، پاشان دێتە دەر و بەرەو شاخەسوور ئەکەوێتە ڕێ، زەحمەت بوو هەڵگەران بەو کێوەدا بەڵام ناچار بووم، دایکم ڕایسپاردبووم، بەیانی تا نیوەڕۆ پەنامەکی تاقیبم و کرد و نیوەڕۆ هاتمەوە و بۆ دایکمم باسکرد. دایکم شێت و هار و دەهری بوو، گوتی ئەو ماڵەی تۆ باسی دەکەیت ماڵی ئەسمەرە بەجۆشە، پیرەکچە جادووگەرەی واو والێکراوە، خۆی و پیرەژنە سەرئاسنینەکەی دایکین، پیاو نەما لە خشتەی نەبا نۆرەی پیاوە گەلۆرەکەی ئێمەیە. بەو شێوەیە هەموو ڕۆژ دایکم شوێن باوکمی ئەخستم و ماجەرا هەمان ماجەرابوو، تا دایکم چووە کن موسایی سنەیی و گوتی بۆم بڕوانە کتێب، بزانم ئەم شووەم چ مەرگ و

بەلایەتی. موسایی سنەی دەمی کتێبی بۆ وازکرد و موتەحەیرانە گوتی: شوە هەرگ وەسەرەکەت بۆتە کۆیلەی شەیتان مەزەهەبێ بە ناوی ئەسمەر و داوای لێکردووە، تا کوپەڵە لیرەی تونی کێوەسووری بۆ نەهێنێ مێردی پێ ناکات. دایکەی داماوم کلکەوانەیەکی هەبوو لە هەق دەستدا دایە موسایی و عەبای بەسەریدا دا و گوتی وامیقی هەرگ وەسەر بێ برۆین بۆ ماڵ کاولمیان بگرین.

رۆژهات و رۆژ رۆی دایکە جورئەتی نەبوو هیچ بە باوکە بڵێ، تا رۆژێک باوکە بە لەقە کەوتە گیانی و گوتی ئیوارە زووتر هاتوومەتەوە و بەنگینی هەجیجم لەبەر دەرکە دیتوە، ئەمە چییە؟ دایکە سوێند و قورعانی دنیای خوارد تا باوکم وازی لێهێنا، بەلام پەنامەکی گوێی گرتم و گوتی شوێنپێی هەڵگرە بزانە چی ئەکات، دەمێ بوو بەنگین دڵی چوو بوو بە دایەیا، ئەمدی ئەهات و سورمە و کلە و خەنەی بە دیاری دەدایە، دایە شەرمی ئەکرد و بزە ئەیگرت. من بە باوکمم گوت هیچم نەدیتوە، ئەو هەڵیگرتم و دامی بە عەرزا، خوێن لە زار و لوتمەوە فیچقەی کرد، لە هۆش خۆم چووم، کە هۆشم هاتەوە تا دایە توشی بەڵا نەبێت، وام نیشان دا نە دەبیستم نە دەتوانم قسان بکەن. تەبیبان هێناو بردمیانە شێخ و مزاران، دەواو دەرمانیان داپێم، بەلام من بێدەنگ بووم.

حەکایەتەکە وەهابوو رۆژێ کە من لە بازاڕی شار ئاوفرۆشیم و ئەکرد کە تاکە ئیشی لایق بە کەڕولاڵیک بوو، باوکەی لوتبەران بەبەهانەی ئەوەی شەکی لە دایکمە، دایکم بەر خەنجەر ئەدات، و حەوت برینی قوڵ لەسەر لەشی ئەچێنێ، دوایی حەوتوویەکیش ئەچێتە خوازبێنی ئەسمەرێ، بەلام ئەسمەر ئەڵێ من مێرد بە قاتلێ ناکەم، بۆیە باوەی کەلە ئەستوور بە پاچەکەی سەری خۆی ئەکات بە دوو کەرتەوە.

دادە شەهرەزاد ئەمە حیکایەتی من بوو، ئەبوو ئەمانە بۆ کێ باس بکەم بەو زمانە لاڵەوە کە وەک منالان قسانی پێدەکەم؟ دادە شەهرەزاد بیست و حەوت ساڵە ئەمن زاری قسەم واز نەبووە و گوێم لە حیکایەتی ترسناکی شارەکەت گرتووە، بەلام کێ شایستەی بیستنی مەراقی من بوو؟ بێ شەک دادە شەهرەزاد خۆت، بەلام دادە شەهرەزاد هەرگیز منت نەدی تا بمهێنیتە حیکایەتت، ئاخر منی گەوج و نەفام، منی کەڕ منی لاڵ چم تا بێمە ڕیزی ئەشرافزادە و نەجیبان و عاشقان و غولامانی کەمەرزەڕینەوە؟ من تەنها بەدئیقباڵێک زیاتر هیچ نیم، بۆیە هەرگیز نە بینیتم و نە سۆراغت کردم، بەلام دادە شەهرەزاد، ئەو وامیقە ئاوفرۆشە کەڕولاڵەی قیمەتی نییە بۆ تۆ، خەزێنەی حیکایەتەکانتە، سوێند بێت خەزێنەی حیکایەت و ژێرزەمینی پڕ ماجەرای شارەکەتە!

ساڵانێکە کەس قسەی لێ نەبیستووم، هەرە خەتەرناکترین قسەکانم بیستووە و نەمهێشتوە ڕەنگم بگۆڕێ، تا هەمووان بڕوا بە کەڕیم بکەن، جارێکیان سێ لە چەتەکانی نیوەشەوان لە گوزەر شەڕیان بوو، لەسەر ئەو خەزێنەیەی دەستیان کەوتووە، شەڕەکەیان ئەوەندە قورس بوو، تا یەکێکیان هەڕەشەی کرد، گوتی ئەگەر پارەم نەدەنێ ڕاستی ئەوەتا لێ دەڵێم کە ئێوە دۆتەی بازرگانەکەتان ئەتک کردووە و کوشتووتانە. هەر دوو دزە ڕەنگیان ڕەشداگەڕا و ئاوڕیان دایەوە من لە پشتیانەوەبووم، زارەترەک بوون، بەلام دادە شەهرەزاد قەدەری من بێدەنگی ئەبەدی بوو، تێدەگەیت لە قەدەر؟ من دەبێت بچم بە کێ بڵێم؟ منێک کە پەردەم و ناشرینییەکانی قەلەندەرانەکەت دەشارمەوە، هەر سێکیان شاڵاویان بۆ هێنام، بەلام لە ناکاو یەکیان گوتی، ئەمن ئەو دەناسم، ئاوفرۆشە کەڕەکەیە، ئەوانی تر گوتیان کەڕنییە و درۆ دەکات، ئەو گوتی نا وەرن هەڕەشەی لێ بکەن بزانن ڕەنگی دەگۆڕێت، یەکێکیان گوتی: هەتیو ها ئێستە نافەکەت ئەبڕم و ئەیدەمە

دەرخواردت، چەقۆکەی دەرهێناو و دەستی بەرەو داوێنم برد، منیش لە ناوەوە تۆقی بووم، بەڵام خۆم لێ نەیان کرد و بە ئیشارەت ئەمگوت چیتان ئەوێ؟ کابرای یەکەمجار گوتی ئەها ئەگەر بیستبای ئێستە میزی ئەکرد بە خۆیدا، لێی گەڕێن، لێم گەڕان و ڕۆشتن. دادە شەهرەزاد حیکایەتی عاشقان و ئەڤینداران و باسی نامەکانیان لای من هەن، دادە شەهرەزاد سەنگی سەبووری زۆرێک لە دڵشکاوان و لێقەوماوان بووم، وەک بەرد هاتوون حیکایەتی خۆیان گێڕاوەتەوە و تا باری قورسی خەمیان سووک بکەن لەسەر شانیان، ئەمن بەردە متەق لێوەنەهاتووەکەم کە ئەوان دوای باسکردنی بەسەرهاتیان، ڕەنگی ڕەشیان داچۆڕاوە و بە ڕوونی و بە بزەوە دینارێکیان داوەتەوە دەستم لە بری دانانی بارکەیان، منیش تەماشای گۆڕانی دەموچاو و جوڵەی لێویانم کردووە و بە ئیشارەت پیم گوتون خوا هەیە خەمتان نەبێت، خوا هەیە.

دادە شەهرەزاد، مەملەکەتەکەت وەک گۆڕێک وایە کە هەڵیدەیتەوە پڕ مارومێرووە، وەک ئەوەی پێستی شار هەڵبەیتەوە و تۆپەڵە خوێن و کێم و برین ببینی وەهایە، جوانییەکان پێشکەشن بە بیسەران و ناشرینییەکانیش بۆ منی کەڕ، منی لاڵ کە دەیپۆشم و هیچ ناڵێم. دادە حیکایەتی باشان و جوانانیشیانم لایە، حیکایەتی هەموویانم ئەزبەرە، زۆر حیکایەت کە هەرگیز کەس نازانێ چۆن ڕوویدا و بۆ ئەبەد وەک تاریکی ماوەتەوە و لای منە. دادە شەهرەزاد ئەگەر بڕواناکەیت، کێ دەزانێت بیست ساڵ لەمەوبەر بۆچی گڕ بەربووە خانی سێ گۆزەگەرە دەستڕەنگینەکەی شار، گڕ و بڵێسەیەکی وا هەموویانی کرد بە تۆز و کەسیش نەیزانی بۆ، تەنانەت تۆش وەک ڕووداوێکی سرووشتی ناخۆش تەماشات کرد و لەم سەرەوە متەقت نەکرد، وەک ئەوەی تۆ کەڕولاڵی ڕاستەقینە بیت. ماجەرای ئەو سێ گۆزەگەرە وابوو بڕیار ئەدەن شەوێکی شەممە، یەکێ گۆزەیەک شەراب بخۆنەوە و تا ئاستی بێهۆشی مەست بن، ئەوسا کوڕەی شاگردیان گڕبنێ بەو ژێرخانەوە تا هەر سێ گۆزەگەرەکە بسوتێن و لەگەڵ خۆڵی گۆزەکاندا ئاوێتە بن و بێ جیاوازی ببنە یەک گەرد. دەزانی بۆ؟ بێ شەک دادە شەهرەزادم نایزانیت، ئەوان ئەیانویست شاگردەکە یەک گۆزەیان لێ دروست بکا بۆ ئەو کچە جووەی کە ساڵانێکە هەرسێکیان خۆشیان ئەوێ بێ ئەوەی کەسیان بەوی دییان زانێ بێت، کاتێکیش بەیەک ئەزانن وەها بڕیارێک ئەدەن. دادە من خۆم گوێم لە کوڕەی شاگرد بوو کە گۆزەکەی دایە دەست کچەکە و ئەویش سێ دڵۆپ فرمێسک بە چاویدا هاتە خوارەوە، من خۆم گوێم لێ بوو.

شەهرەزاد من حیکایەتی عارفی کێوەسوور ئەزانم چییە، شەهرەزاد خۆم بیستم و گوێم لێ بوو کاتێ قسانی بۆ مەلا ڕاغیبی ئەمانوڵا کرد، ئەو عارفە لە ئاواییەکەی خۆیان دڵی ئەچێ بە کچەی بێنەزیری ڕووقەمەری قەدفەنەری کافرۆشدا. شەو و ڕۆژ خەیاڵی زوڵی، مات و مەلولی دەکات، کە ویرد ئەخوێنێ شەیتانی لەعین سیمای ئەو دێنێتەوە بیری، کە نوێژ ئەکات، سینە و بەرۆکی نارنج ئاسای ئەیورووژێنێ و کە ڕۆژوویش ئەگرێ ختورەی پێکەوەبوون لە کەللەی ئەدا، بۆیە سپێدانێکی زستان خۆی لە ئاوی ساردی حەوزی خانەقا هەڵەکێشێ و ڕوو ئەکاتە کێو، لەوێ بە بەردێکی ئەستور و تیژ، خۆی ئەخەسێنێ و بڕیار ئەدا نەگەڕێتەوە ناو ئاوەدانی، تا خۆی تەرخان کا بۆ خوداپەرەستی.

دادە شەهرەزاد حیکایەتی شەرارە و توراب و مینا و فەخروسەڵتەنەی کوژراوی کۆشکیش ئەزانم، بەڵام بەرد قسان بکات من قسان ناکەم لەسەر ئەوان، ئیشی من پۆشینی ناشرینیەکانتە، بەڵام بیرت بێت من کەڕولال نیم!

# شەوی چلهەم

ئەو خوایە یەکەمینە و لە سەرەتاوە هەر هەبووە و کەس پێش ئەو نەبووە، دواهەمینە و کۆتایە، کەس دوای ئەو نامێنێت، هەروەها ئەو زاتە دیارە و هەموو شت بەڵگەیە لەسەر بوونی، لە هەمان کاتدا زاتی خۆی نادیارە، هەر خۆیشی زانایە بە هەموو شتێک، ئەمە کەلامی خودا خۆیەتی، کە خۆی ئەوەڵین و ئاخرینە. خاتوو شەهرەزاد، ئادەمی حیکایەتخوانم و ئەمشەو چلەم شەوی حیکایەتە، ئێستا ئەمن لە حزوری جەنابتدا دانیشتووم، لە خوارەوە، مەملەکەت چاوەنوارن، کەسیان فوویان لە مۆمیان نەکردووە، کەسیان لە باخەڵی ژنیان نەخەوتوون، هەمووان لە دەوری ئاگریماڵیان دانیشتوون و حیکایەت دەگێڕنەوە، منداڵان خەو لە چاویان چووە و پیران دەست بە تەسبیح و جحێڵان گوێ هەڵخراوی حیکایەتی ئەویندارانەن. مەملەکەتی قەلەندەران ئەمشەو بە درێژترین شەو دادەنێن و چاوەنواڕن، تۆ شتێک بکەیت، ئەوان لە درێژترین شەوی ساڵدا، لە شەوی یەڵدادا، گوێیان بۆ حیکایەت شل کردووە و چاوەڕوانی چوونە خوارەوەی منن، بە هەواڵی خۆشەوە، شەرمەزارم مەکە، شەهرەزاد، هەستە دەست بە گێڕانەوەمان بکە، لە سەرەتاوە تا کۆتایی باسمان بکە، شەهرەزاد، مەملەکەتی قەلەندەران، ئەندێشە و خەونی تۆیە بۆ ئەو دنیایەی کە نیتە. شەهرەزاد، خەوەکەت بۆ ئاو مەگێڕەوە، خەوی تۆ شووم نییە، بۆ بێدارانی شەوی باس بکە، لە حیکایەت دەگەن و دەزانن ونبوون و تیاچوون چەند ئەستەمە. شەهرەزاد؛ ئەگەر باش نەبێت، هەزاران کەسی ناو مەملەکەتی قەلەندەران، دەبنە تۆز، بیر دەچنەوە، عەزابیان بۆنی نامێنی، ڕەنگیان نابینرێ، حیکایەتیان نابیسرێ، ئەمە ڕەوا نییە.

شەهرەزاد، ئێمە بە کەم مەزانە، زۆرمان بیستووە لە حیکایەتی ئەو پادشاهانەی، میهرەبان و دادوەر و ڕەعیەتدۆستن، کەچی نیوەڕۆیەک لە خەوی نیوەڕوان ڕادەبێ، مەملەکەت بە تیر و شیر و قەڵغان و ئاڵاوە لەبەر کۆشکی وەستان و دەڵێن، چی دی تەحەمولی تۆ ناکەین و نامانتەوێ. لەو جۆرە حیکایەتانەدا پاشای میهرەبان، بۆ ئەوەی کوشت و ڕۆ نەبێت، بێ ئەوەی پیبزانێ خەڵک بۆ چ نایانتەوێ، سەڵت و ڕووت لەگەڵ شاژن و منداڵاندا بە سواری درووشکەیەک، شار جێدێڵن و ڕوو لە ئاوایی یان کوخێکی ناو لێرەواران دەکەن.

شەهرەزاد، زۆرمان بیستووە لە حیکایەتی ئەو موریدانەی، بێ هۆ حەلاش و بەلاش، پشت لە شێخی عالم و خاوەن کەماڵ و جەماڵ دەکەن، شەوێکی هەینی وەختێک بە قەستی زیکر و فیکری خودایی دەچێتە تەکیەی گەورە و هوراو، دەبینێت، موریدان شتاقیان لەوێ نین، شێخەی خاوەن کەشف و کەرامات، بە تاقی تەنێ زیکر دەکات و لە باتنەوە دەبینێت، موریدانی بە دەستە ڕوویان لە تەکیەیەکی چکۆڵەی شێخێکی تەڵەکەباز و جادووگەر کردووە.

شەهرەزاد، زۆرن حیکایەتی ئەو کچانەی فەرەنگی چینی، ئاوێنە ڕۆژی، ڕەنگ ئاگرن، نازک بەدەن، وەک گوڵی یاسەمەن، نەرگز چاو و بسک خاون، ددان مرواری و لێو لەعل و سینە لیمۆ و گوفتار قەندن. کەچی شەوێ، بە دیار شەراب و موتریب و غەزەلخوانەوە، چاوەنواڕی عاشقی خۆی دەکات، دەبینێت شەو دەبێتە شەبەق و ئەو دەرناکەوێت، شەهرەزاد، کچەی دڵبەر وەختێ سۆراغی عاشقی خۆی دەکات، دەبیستێت، چۆتە کن نازداران یان فاحیشان و شەوی لەوێ بردۆتە سەر و دوایش هەر یەکێ لەوانی کردۆتە کابانی.
شەهرەزاد حیکایەتی زۆر بێ ڕەحممان بیستووە، خۆیشت زۆر سەنگدڵانە، سەربهوردەت ڕیوایەت کردووە. ئێمە هێشتاش نە لە خەڵکێ شاری لە پادشا هەڵگەڕاوە، نە لە موریدانی لە شێخ تەرەبوو، نە لە عاشقی مەحبوب نەویستوو ناچین. شەهرەزاد؛ وەلێ پەلە بکە، بەشەر ئامانی نییە و هاکا لێت ڕاپەڕین و شوورەی شاریان خاپوور کرد و ڕۆیشتن، هاکا خۆیان زەهرخوارد کرد و مردن، هاکا بوون بەژێر زەبری توندی زەمانەوە و نەمان. پەلەکە شەهرەزاد!
شەهرەزاد، ئەمە ئاخرین شەوە، دەڵێن تاریکترین دەمی شەو، کەمێک پێش شەبەقە، ئەمشەو تاریکترینە و تۆ سبەی چا دەبییەوە. شەهرەزاد، ئەم بەڵایە لە کوێیەوە بۆ تۆ نازڵ بوو؟ چی بوو تۆیش بەر جەبری زەمان کەوتی؟ شەهرەزاد گەمەکەت وەها لێکرد، حیکایەتی تۆیش مەرگەساتێک بێت، تا بە هۆی تۆوە ئێمەیش نەمێنین؟ شەهرەزاد، ئەگەر قەڵەندەران و حیکایەتیان وەیادنەهێنیتەوە، ئەگەر حیکایەتە گەورەکەت نەگێڕیتەوە، بزانە، ئیمانداران دەبنە مولحید و کتێبدار، کتێبدان دەسووتێنێت و حەکیم نائومێد دەبێت، منیش سەری خۆم هەڵدەگرم.
شەهرەزاد، چاوت بسڕە و وەرە خوارەوە، دەزانم، ئێرە شوێنێکە هەوای تەنگ، دەزانم زەمەن لێرە زیندانە و هەر خۆیشی جەلادە، زەمەن لێرە بێ ڕەحمترە، بۆیە خەم و جەخاری وا ڕووی لێ کردوویت. وەرە خوار، تۆ پاشامان بە، تۆ سەروەر، شەهرەزاد قەسەم بە خودا، ڕێزت دەگرین و ئەسرینت بۆ دەسڕین. هەستە لە جێ و وەرە بەرپەنجەرەکەت، تەماشای ئەستێران بکە بە دەم ڕەشەباوە، دێن و دەچن، هەستە وەک حیکایەتخوانێکی ماندوو، کورسییەکەت لەبەر پەنجەرەکە دانێ و تەماشای تاریکی و ڕەشەبا و سەرمای یەکەم شەوی زستان بکە، بیر لە مەملەکەتەکەت بکەوە، سبەی دەبن بەژێر هەرەسی فەرامۆشی تۆوە و بۆ ئەبەد مەحف دەبنەوە، شەهرەزاد، ئەگەر شەڕت لەگەڵ زەمەن پێ نەکرێت، ئەگەر شەڕ بۆ بردنەوەی عشق نەکەیت، ئەگەر نەتوانی حیکایەتی چل شەوەی قەڵەندەران، وەک خەنجەرێک بچەقێنیتە سەر دڵی زەمەن، ئەوە شکۆی تۆ دەکەوێتە لەرزە، ئەوە تاقە دێرین و مزگەوتە قەدیم و شوورە پتەوەکانی مەملەکەتەکەت دەبنە تۆز. خاتوون هەستە، بە خاتری خوێنی ڕژاوی پیاوان و ژنانی قەڵەندەران، بە خاتری کیژانی دڵبەر و خاڵ لە ڕووی لەب شەکەر، بە خاتری مێرخاسان و جوامێران، بە خاتری پیران و موریدان و زاهیدان، بە خاتری فەلە و جوو و موسوڵمان و یەزیدیان، بە خاتری ڕووبابی برین هەمیشە تەڕ، بە خاتری خۆت، بە خاتری جەوانیت، دەست بکە بە گێڕانەوەی حیکایەتەکەت.
شەهرەزاد، دڵم تەنگە، پیاوێکی وەک من خەریکم لێت دەپاڕێتەوە، شەهرەزاد دڵم تەنگە و دیسانەوە بۆنی خۆڵ قوڕگی گرتووم، دیسانەوە بیری خەلق و بیری یەکەم حیکایەت، بیری یەکەم چوونە قەڵەندەرانم کەوتۆتەوە. شەهرەزاد ئەگەر وەک من تەنها بوایەیت چت دەکرد؟ ئەگەر وەک من گێڕەرەوەیەکی تەک و تەنها بووایەی چۆنت دەگوزەراند؟ دەزانی شەهرەزاد هەرگیز دڵم نەهات گلەت لێ بکەم؟ ئەو شەوەی منت خولقاند هێند خەمین و دڵزار بوویت، منت وەک ئەو

شەوەی خۆت تەک و تەنها خولقاند. شەهرەزاد؛ دەبوو حیکایەتەکە وەها بێت، وەختێک من دەگەمە شاری قەلەندەران، دەرکەی ماڵ دەکەمەوە، شۆخێکی کەزی ئاوریشمینی ددان گەوهەری، جیسم پڕی نازدار ئامێزم بۆ بکاتەوە، دەبوو حەوات بکردایەتە خەڵاتم، بەڵام نەتکرد تا خەریکی کار ڕاپەڕاندنی تۆ بم. شەهرەزاد؛ ساڵانێک خەڵک دەنێریتە قەلەندەران، خەڵک دەردەکەیت، خەڵک دەکوژی، خەڵک دەژێنی، بەڵام هەرگیز دەستت نەبرد حەوا بەدیبێنی. ساڵانێکە چاوەنوەڕای هاتنی حەوام، وەک چۆن هەمووان لە قەلەندەران چاوەڕوانی شتێکن، هاتنی کەسێک، ڕازی بوونی کەسێک، هاتنە دنیا کەسێک، دواجار گێڕانەوەیان بە ڕیوایەتی تۆ!

شەهرەزاد، گلە زۆرە و کات کەم، دەبێت پێش شەبەق بگەمە خوار، بەڵام سبەی بمانگێڕەوە، زوو هەستە کولێرەیەک لەسەر سۆپاکە گەرم کەوە، چاییەک تێکە و تەماشای ڕەشەبا بکە، دەست بدەرە گێڕانەوەمان، شەهرەزاد، کە گێڕاتینەوە، بیرت بێت، باسێکی شەرارە بکە، ناوی حەوا بێنە، دوعا بۆ ڕووباب بکە!

شەهرەزاد بە دوعا، دەبێت بچمە خوار و بڵێم بنوون، سبەی ڕۆژێکی نوێیە، خاتوون دەست دەکات بە گێڕانەوەی حیکایەتی چل شەوی مەملەکەتی قەلەندەران، خاتوون، یەڵدات پیرۆز و شەهرەزادیت لێ مەبارەک!

بە دوعا...